ناوی کتێب: سەفەرێك بۆ هەندەران

نووسینی: هەورامان عەلی تۆفیق

تایپیست و نەخشەسازی: نوسەر

چاپ: یەکەم

چاپخانە: چاپخانەی منارە/ هەولێر

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٢٥٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(٧٠)ی ساڵی ٢٠٠٩ی پێدراوە.

# ناوەڕۆك

- پێداچوونەوە
- دادگا Gricht
- بەڕێوەبەرایەتی بیانی Ausländeramt
- جێگای ژیان
- دابین کردنی پێداویستی ژیان
- کۆتایی ماوەی مانەوە
- پێشکەش کردنی هاوکاری لەکاتی دەرچون لە ئەڵمانیا

- گرفتەکانی پەنابەری کورد
- ئافرەتی کوردو ژیانی پەنابەری
- ئازادی و کراوەی ئافرەت ودەرگایەك بۆ لادان و شێواندنی خووڕەوشت
- ئافرەتی ئەمڕۆ و گرفتەکانی کۆمەڵگا و بەرەنگاربووە
- ئافرەت و خوێندن لە هەندەران
- هۆکارەکانی پەنابەری و ڕووکردنە تاراوگە

- هۆکارە سروشتیەکان و گرفت و گێژاوە مێژوویەکان
- فاکتەرە رامیاریەکان
- فاکتەرە ئابوریەکان
- فاکتەرە کۆمەڵایەتیەکان
- باری ڕاگەیاندن

- خەونەکانی پەنابەری کورد
- چیرۆکی سەفەرێك بۆ هەندەران
- پرۆژەو هەنگاوەکان بۆ کەمکردنەوەی کۆچ و ڕوونەکردنە پەنابەری

# پێشەكی

كاتێك كە مرۆڤ بەخۆی لە ڕوداوێك دا بوونی دەبێت و لە خۆشی وناخۆشیەكاندا بەشداردەبێت و ئازارو خەمەكان هەست پێدەكات و لەو ژیانەدا ڕۆژگارێك بەسەر دەبات و لەنزیكەوە لەو ووردەكاریانە ئاگاداردەبێت و كەم و كوڕیەكان دەبنێت، ڕەنگە ئاستەنگ بێت مرۆڤ بتوانێ خۆی بۆ ڕابگیرێت و بەدەنگ نەیەت..

خوێنەری خۆشەویست :

من لێرەدا بەو مەبەستە ئەم بابەتەم دەخەمە بەردەستی بەڕێزتان لەنزیكەوە ئاشنا بیت كە كەسایەتی كورد چۆن دەگاتە هەندەران و ئەو گرفت و كێشەو چەرمەسەری و نەهامەتیانە چین دێنە ڕێگای تا دەگاتە ئەو خەونەی كە بیری لێ دەكردەوە و تا ئەمڕۆش هەن وەك خەون خەونی پێوەدەبینن و بەوهیوایەن بۆ ڕۆژێكیش بێت بگەنە هەندەران.. ژیان وگوزەرانی كەسێكی هاندەرانی و ئەو قۆناغانەی كە پێیاندا تێدەپەڕێت تا دەگاتە ئەوەی ژیانی ئارام دەكات و لەسەر پێ ی خۆی ڕادەوەستێ ، ڕێژەی سەركەوتن و بەئامانج گەیشتن.. كە هەندێ جار ئەم ژیانە و هەنگاوەكان بۆ بەدست هێنانی بوونەتە هۆكارێك كە ئەو كەسە گیانی لەدەست بدات وژیان بەجێ بهێڵێت.. لەگەڵ ئەوەی هەندێك لەوانە گەورەترین زیانیان پێ دەكەوێت و لەڕووی دارایەوە زەرەری زۆردەكەن و سەروەت و سامانەكانیان لەدەست دەدەن.. هەندێك لەپچڕان و دووركەوتنەوەو تەنهایدا زۆر گرفتی دەرونی بۆدروست دەبێت جگە لەوەی زۆر لەو لاوانەی كە بەهۆیی ژیانی نامۆیی و جیاوازیە زۆرەكانی نێوان ئەو كۆمەڵگایەی ئێمەو ئەو كۆمەڵگا نوێیەی كە دەكەوێتە ناویەوە توشی هەڵدێرو لادان دەبێت و لەبری ئەوەی سود وەرگرێت زیان بەخۆی و دەروبەرو كەس و كارەكەشی دەگەیەنێ... كێشەكانی ئافرەتی كورد و ژیان و گوزەرانی خێزانی كورد

و کاریگەریەکانی لە نێو کۆمەڵگا ئەورووپیەکانەوە کە دیسان دەیان شێوە کێشەو گرفت دروست دەبن و شیرازەی هاوسەرگیری دەشێوێنن.. منداڵ و گرفتەکانی لە ژیانی هاندەران و ئەو ژیانەی کە باوك و دایك دەیانەوێت دووبارە بەرەو وولاتی بەرنەوە تاچەند کاریگەری دەبێت.. ئەمە بێ لەوەی کە قۆناغەکانی سەرەتایی دەست پێ کردنی کۆچ و ئاوارەیی کەسایەتی کورد وئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆیەك بۆ ناچارکردنی کەسایەتی بە هەڵبژاردنی ژیانی هەندەران و برینی ئەو رێگایە و قبوڵ کردنی زۆر نەهامەتی کە بەبڕوای ئەوەی لەوانەی کوردستان باشترن..

خۆشەویستان: دوای ماندووبوونێکی زۆر و ماوەیەکی زۆر کە چەند ساڵێکی خایاندبێ و چەند جار بۆچوون شێوازی کارکردنەکە گۆڕانی بەسەر داهاتبێ بەلام دەرەنجام گەیشتمە ئەوەی کە ئەم کتێبە بکەمە دیاری کتێبخانەکانتان بەو شێوەی کە بتوانم ڕووی ڕاستی ژیان و گوزەران و بۆچوون و بیرکردنەوەی کەسایەتی کورد لەهەندەران و چۆنیەتی پێویست بوون لەوەی کە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و لەو تۆران ودڵ زویربونەی ئاشت بکرێتەوە.. تا کەسمان لەو دڵەڕاوکێیە دا نەمێنینەوە چونکە ئەو دووبیرکردنەوەیە نەك تەنها لای ئەوانەی کە ئەمڕۆ لەهەندەران ماونەتەوە بوونی هەیە بێ گومان لای ئەوانە زیاترە کە بەحساب گەڕاونەتەوەو هەندێکیان لەرێگای دەسەلاتەوە کارو ئەرکیان پێ سپێردراوە و یا ئەوانەی کە بەهۆی بارزگانیەوە گەڕاونەتەوە، بەلام ئەوەی دەیبینین هەموو تەمەنی مانەوە خۆی لەچەند مانگێك یا ساڵێك نادات و دووبارە جانتای سەفەری دەکاتەوە شان و بەبێ کێشە ڕوو لەهەندەران دەکاتەوە...

بەپێویستم زانی ئەو ڕاستیانە لەهەردوو لاوە بەدیاربخەم و پەنجە لەسەر برینەکان دانێم ئەگەر دەسەلات و لایەنی بەرپرس بەپەرۆشە بۆ چارەسەر کردنی ئەم گرفتە دەکرێ کاری بۆ بکات و لەچەند ساڵانی داهاتوودا ئەنجامێك هەبێت و بە کردەوە بسەلمێنرێ کە بەڵێ لەبەرنامەدایە کاربکرێت..

# قۆناغەكانی سەرەتایی دەست پێ كردنی كۆچ و پەنابەری..
# پێش ڕا پەڕین و دوایی ڕا پەڕین

ژیان كۆمەڵە كاروانێكی جیاوازە ، مرۆڤ وەك ڕێبوارێكی وێڵ بەدوای ووشەی ژیاندا دەگەڕێ. هەمیشە پرسیاری بەئاكام گەیشتنی مرۆڤ لەژیاندا ، مێشكی ئەو مرۆڤەی قاڵ كردوە و هەندێ جار وێنەیەكی خەیاڵاوی وەستایانەی بۆ دەكێشێ ، بەڵام ئایا واقع و ئەو ڕاستیانەی كە خودی مرۆڤ پێویستیانە و هەوڵی بۆ دەدەن بەو ئاسانیە و بەبێ ماندوبوون و قوربانی دان بەدەست دێن... ؟

مرۆڤ بۆ هەمیشە سەركەوتن و گەیشتنی بە ئاكام پێویستە وەك تەواوكەرێكی هەرەگرنگ و بەسود هاوشانی ڕەوتی ژیان و گۆڕانكاریەكان و واقعی خۆی هاوتەریب بێت و بتوانێ گونجاو بێت. هەرچەندە ئەمەش كارێكی هێند سانایی نیە و زاتی ئەو مرۆڤە هەموو كاتێك توانای قبوڵ بوونی ئەو جۆرە ژیانە داسەپاوەی نابێت، هەندێ جار لاوازو سست دەبێت و بەوردی پاشەكشێ دەكات و كونجی قەناعەت دەكاتە ماڵی هەمیشەی ئەم ژیانەی. بەڵام ئەم سیستەمەی ژیان دەتوانم بڵێم زۆر دەمێكە ڕەت دەكرێتەوە و ئێستای مرۆڤی كورد لەو شۆڕشەدایە كە ژیانی داسەپاوی بەلاوە پەسەند نیەو بەهەر جۆرو شێوازێك بێت دەیەوێ بیگۆڕی ، بێگومان ئەم گۆڕانەش بەرەو ژیانێكی باشتر نەك خراپتر. كۆمەڵگای كوردەواری لەوەتەی نەوەكانی چاو بە چەرمەسەریەكانی ژیان و پێك هاتەكانی هەڵدێنن لەمەینەتی و ئاوارەیی و ماندووبوون و بێ ئارامی بەولاوە بەوپەڕی بڕواوە زیاتریان نەدیوە. كەواتە دەبێ ئەم مرۆڤە چ تاوانێكی هەبێ ئەم ژیانە ببێتە بەشێكی سەپێنراو بەسەریدا. لەگەڵ ئەم زۆر كاریانەدا كە ڕووبەڕووی كۆمەڵگای كوردەواری كراوە، دیسان ڕێگاش

نەدراوە کەسایەتی کورد بەهەوڵی خۆی و ماندووبوونی ئەو ژیانەی کە بەویستی خۆیەتی بەدەستی بهێنێ.

هەندێ بڕوایان وایە کە کورد بۆخۆی نەیتوانیوە هەنگاوبنێ و لە گۆڕانکاریەکانی ئەم ژیانە سود وەربگرێ.

تاڕادەیەك لەوانەیە بڕوامان بەم بۆچوونە هەبێت، چونکە ئەو سیستەمانەی بۆ ژیان خۆیان بەسەر کۆمەڵگاکەماندا دەسەپاند دژی ئەو گۆڕانکاریانە بوون و هەمیشە سودیشیان لە دووبەرەکی و ئاژاوەی خێڵە کوردیەکان وەرگرتووە و لەلایەکی ترەوە ئاینی ئیسلام هۆکارێکی گرنگ و کاریگەربووە بەدەست دوژمنانەوە کە بەکاریان هێناوە بۆ سەرکوت کردنی کورد ، ئاستەنگێکی گەورەش بووە لە ئازاد نەبوونی کورد، ئەویش بەوێنەی زنجیرێك لەدەستی کوردیانەوە دەئاڵاند. هەرچەندە ئەم بابەتە پێویستی بە لێکۆڵینەوە و لێ توێژینەوەی زیاتر و قوڵ ترەیە چونکە بەلای منەوە باس و خواستێکی زۆر گرنگە و دەبێ ئێمەی ڕۆشنبری کورد زۆر بوێرانە لێوەی بدوێن و بەجدی هەنگاویش لەم بوارەدا بنرێ.

گەلی کوردمان دوای ئەوەی ڕژێمە داگیرکەرەکان سەرەڕایی بردنی سەروەت و سامان و داگیرکردنی خاك و ئاوی و دانیش بەبوونی ئەم نەتەوەیە دا نانێن و پاشان دەست وەردانە ژیانی ڕۆژانەی و شێواندنی سیستەمەکانی.. هێندە ئاسان نەبوو ئەم گۆڕانە لەئان و ساتێك دابێ. کەواتە گۆڕانێکی لەم جۆرە پێویستی بە کات و هەوڵ دان هەیە و دەبێ کەسایەتی کوردی لەدروست بوونی خودی یەوە هەنگاو بنێ و پێم وایە ئەم بەرنامەیەش لەسەرەتای شۆڕشە رزگاری خوازیەکانەوە دەستی پێ کردوە و ئەو شۆڕشانە گەورەترین قوتابخانە بوون کە کەسایەتی کورد تیایاندا وەك قوتابیەکی چالاك و بەتوانا پەروەردە بووە.

لەگەڵ هەموو چوار چێوەیەکی ژیان کە ئەو مرۆڤە تێدا دەژی پێم وایە سوڕانەوەو دووبارە بوونەوە تێیدا کۆسپێکی گەورەیە بۆ نەبوونی گۆڕانکاری. کاتێك سەیری

ژیان و ڕەوتی گۆڕانکاریە بەپەلەکانی نەتەوەکانی دی دەکەین لەوانەیە بەلامانەوە سەیر بێت و بڕوانەکەین بە باسکردنیان... بەڵام کاتێك بە چاوی خۆمان ببینین ئەو کات بێ گومان بڕوا دێنین.

هەرچەندە ڕەوڕەوەی ژیان زۆر بە پەلە دەخولێتەوە و ئێمەش زۆر لە دواوەین و سەختە بەو هەڵپەیە بتوانین بگەینە گۆڕانکاریەکانی ژیان ، هەموو نەتەوەیەك گەڕانەوەی بۆ دواوە و دواکەوتنی پاشماوەکانی شەڕە. گەلی کوردمان لەو ڕۆژەوەی لەسەر ئەم ئەرزە بەشی ژیانی پێ بەخشراوە لەشەڕو ئاژاوەو کێشەو مەینەتی بێبەش نەبووە. لێرەدا مەبەستم دوو گۆڕانکاریە

١ ـ گۆڕانی کەسایەتی کورد لەدەوروبەری خۆیدا

٢ ـ گۆڕانی کۆمەڵگای کوردی بەشێوەیەکی وەك هەموو کۆمەڵگانی دی.

ئەمڕۆی کەسایەتی کورد بەهۆی بەهێزی دەوروبەری و لاوازی خۆی لە بەئەنجام گەیاندنی ئەو گۆڕانکاریە پێم وایە وازی لەگۆڕینی کۆمەڵگا هێناوە و دەستی داوەتە گۆڕینی کەسایەتی خۆی.

هەر مرۆڤێکیش پەیوەستە بەو دەوروبەرەی کە لەگەڵیان دەژی و ئەو جۆرە ژیانەی کەبۆی هێنراوەتە پێش... لەوانەیە زۆر هەبن بڵێن ژیان بەدەستی ئەو مرۆڤەیە چۆنی بویێ وای دروست دەکات. بەڕوونی لەسەرەوە لەسەر ئەمە دواین، بەڵام ئەو بۆچوونە لەهەموو کات و سەردەمێك دا ناگونجێ چونکە ئەگەر بەوردتر لەو کەسایەتیە وردبینەوە دەبینین ئەو منداڵەی لەدایك دەبێت هیچ لەژیان و دەردەسەریەکانی نازانێ و ئاگاداری نیە. ساوایە و بەو پاك و خاوێنی یەوە چاوی گەشی بە مەینەتی و چەرمەسەری ئەم دونیایە هەڵدێنێ و ئەو ژیانەی کە پێش بوونی بۆی دروست بووە ئەو تێدا دەژی و دەبێتە بنەمایەك بۆی.

کەواتە ئەگەر ئەم منداڵە لەبنەماڵەیەکی سەرمایەدار یان خاوەن دەسەڵات یان هەژار و نەدار و برسی یان هەر نەدیار بوونی ژیانی بێتە ئەم دونیایەوە ، لەگەڵ ئەو

چوارچێوەی خۆیدا دەگونجێ و دروست دەبێت و ئەو ژیانەی بۆی ئامادەیە دەدرێتە دەستی وەك سەرمایەیەك و بنەماکانی ژیانی خۆی لەسەر دادەڕێژێ . دوای گەورەبوون و گەیشتنە ڕادەی کە خۆی بتوانێ ئەو ژیانە داسەپاوەی بگۆڕی... لێرەدا دەتوانین بڵێین بەڵێ.. بەڵام کەی ئەو مرۆڤە چالاك و بەهێزە دەبێت کەبتوانێ لەگەڵ دەوروبەری خۆیدا بگونجێ و ئەو پێشەنگە بێت بۆ گۆڕینی ژیانی خۆی و دەوروبەری سەرەڕای هەموو دژایەتیەك.

پێم وایە ئەمڕۆ گەلی کوردمان گەیشتوەتە ئەو ڕاستیەی کەدەیەوێ ئەو ژیانە داسەپاوەی کە چەندین ساڵە وەك لێفەیەکی بۆگەناوی کە بەسەریاندا دلوە و ڕێگایان پێ نەداوە بۆ چەند ساتێکیش بێت سەیری دەوروبەری بکات و هەناسەیەکی پاك و بێگەردو ئازادانە لەم ژیانە هەڵمژێ.

دەتوانین ئەم کۆچ ڕەوە فراوانەی ساڵەکانی ٩٠ بۆ ئێستا و ڕووکردنە دەرەوەی وڵات ، دیسان یەکێکە لەو هەوڵانەی کەسایەتی کورد بۆ گەڕان بەدوای ژیانێکی دی کە بۆ خۆی دروستی بکات و لەوچوار چێوەی گێژەڵوکەیەدا رزگاری بێت و لەوانەشە ئەم هەنگاوە بۆ سەردەمانێکی دی جێ پەنجەی دیار بێت و بەیەکێك لەو هەوڵانە بژمێردرێت بۆ گۆڕینی کۆمەڵگای کوردەواری و گەیاندنی بەگۆڕانکاریەکانی ژیان و هێنانیە ئاستی ژیانی ئەم نەتەوانەی دی ئەم دونیایە...بەڵام ئەم گۆڕانەش هەمەلایەن نابێت چونکە کۆمەڵە پەیوەستێکی ڕۆحی هەن کە هەرگیز لەکەسایەتی کورد نابێتەوە و دەبێ هەمیشە پێوەی گرێ دراو بێت کاتێك پێنووس ڕوودای گەلێك سەیر لەسەر واقعی ژیانی مرۆڤ لەهەموو قۆناغەکانی دا دەنووسێت و کۆمەلێك ئازارو چەرمەسەری پێش چاوو دەخات و تێکڕای ئەم پێکەوە ئاڵانە دەگەڕێتەوە بۆ دوو خاڵی سەرەکی :

١ ـ کۆمەڵە هۆیەکی بنەڕەتی هەن بەهەموو لایەنەکانیەوە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێ بۆ وەرگرتنی بڕیاری گۆڕانکاری لەوانە :

- بوونی بیرۆکەی گۆڕین لەسەردەمی دروست بوونی ژیانەوە.
- کۆمەڵە بەرهەم هێنەرەکان و برەو دان بەم بەرهەمانەی ژیان کە دیسان ئەمەش پەیوەستە بە گۆڕانکاریەکانی ژیانەوە.
- ژیــان و گوزرانــە پڕمەینەتیــەکان و بێزاربــوونی ئــەو مرۆڤــە لــەو چەرمەسەریانە.
- دووبارە بوونەوەی کارەکانی ژیان بەبێ بوونی هیچ ئاکامێك وبینینی هـیچ هیوایەك.
- خۆشەویـستی بـۆ وولاتەکـەی و سـەیرکردنی دەوروبـەرو گۆڕانکاریـەکانی کۆمەڵگاکانی دی.

٢ ـ پاشەڕۆژ و دروست بوونی ژیان لەدوو کەسەوە دەست پێ دەکـات کـەناوی ژن و مێردیـان لـێ دەنـرێ و ئـەوانیش بـۆ نـەوەکانیان و بـەردەوام بـوونی بـەم شـێوەیە بیرۆکەیەکی وا دەبەخشێت کە دەبێ گۆڕان لـەژیانی نەوەکانـدا دروسـت، کـورو کـچ دەبێ گۆڕانێك هەست پێ بکەن لەگەڵ ژیانی دایك و باوك و باپیریاندا.

لەگەڵ ئەم هەموو ماندوبوون و نیگەرانی و بێزاریەدا هیوایەك ، ئایندەیەکی گەورەی دەرەوونی ئەو جۆشەی هەمیشە لایە کە ئارامی و هێمنی بەو مرۆڤە دەبەخشێ و کـە بەبڕواو تینێکەوە بەردەوام بەبێ سڵ کردنەوە و ماندوبوون و کۆسپەکانی ژیـان ڕوو لـەدەروازەی سـەختی تەگـەرەکانی بکـات ، ئـەویش کاتێـك ووشـەی خۆشەویـستی لەدەرگای داخراوی ئەو مرۆڤە ماندو شەکەتە دەدات ، لەگەڵ شنە بایەکی ساردو پڕ ئاراماویـدا خـۆی لەدڵـەوە دەئـاڵێنێ و دەبێتـە مایـەی خۆهێـشتنەوە و چـاندنی بنەمایـەکی پاشـەڕۆژی کـە ئـەویش دەبێتـە سـەرەتایەك بـۆ دروسـت بـوونی گۆڕانکـاری.... ئەگـەر خـۆ لـەڕووی زانـستی و ڕۆشـنبیری و لایـەنی ڕامیاریـەوە لێکدانەوەی لەسەر بکرێت و هەوڵ بدرێت پێش بینیەکان بۆ ئاکام و پاش ماوەکانی شەڕو ماڵ وێران بوون ڕەنگە ئێمەی کورد لەنێو نیگای مێژوومانەوە زۆر بەسـەرهات

و کارەساتی سروشتی و دواتر دەست کرد ، کە بە بڕوای من ئێمە لەچاو میللەتانی دی زیاتر کارەساتەکان دەست کردبوون لەوەی سروشتی بن.

ئەگەر وورد بوونەوەیەك لە مێژووی سەرەتایی پەیدابوونی کورد و ئەو قۆناغ و بنەما و پێك هاتانەی خۆی لەسەر بنیاد ناوەو لەدروست بوونی داب و نەریت و ڕەگەزیەتی و سەلماندنی خۆی وەك نەتەوەیەك. چەندەها ڕێگای سەخڵەت و مەینەتی بریوە و کەوتۆتە زۆر لەو گێژاوە ناوچەیی و نێونەتەوەیەکانەوە کە دەتوانین بڵێین کورد وەك نەتەوەیەك تێیدا وون بووە و کەسێك ناوی نەهێناوە ، تەنانەت نووسین و گێڕانەوەی مێژووشیان لێ شێواندووە و ڕاستیەکانیان وون کردوون ، ئەمەش وەك بەڵگەیەك بۆمان دەسەلمێنێ کە کورد هەمیشە لەژێر چەپۆکی دوژمنان و زۆرداران دابووە... هۆکارە سەرەکیەکانی دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی کورد لەو ناوچانەی تێیدا ژیاوە و نیشتەجێ بووە چەند جێگایەکی بەپیت و بەرەکەتە و هۆکارێکی بەرهەم هێنەری ئابووری زۆر گەورەیە .

بەلام ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە کەسایەتی کورد لەهەموو ئەو گۆڕانکاری و سەردەمانەدا کە دەتوانین لەسەردەمی سەرهەڵدانی مرۆڤ و دواتر سالآنی پێش زاین و دوای زاین و سەردەمی سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلام و تا بە ئەمڕۆمان دەگات... ئەم کەسایەتی یە هۆکارەکانی دووبەرەکی و ناکۆکی پێکەوە ژیان وای لێ کردوە هەمیشە دەست بە سەرو ژێر دەستە بێت و نەتوانێ نەتەوەکەی لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆو یەك هێز کۆبکاتەوە .

ئەم هۆکارانەش وایان کرد نەتوانین وەك هەر نەتەوەو میللەتێك سادەترین مافەکانی ژیانمان بۆ دابین بکرێت . ئەگەر لە لاوازبوون و بێ هێزی کورد بدوێن ڕەنگە بەهەڵەدا بچین چونکە کورد لەو نەتەوانەن کە هەردەم بە ئازایەتی و لە خۆبردەیی و قارەمانیەتی ناسراوە هەمیشە وەك ئامێرێکی شەڕ بەدەست دەوڵەتانی ناوچەکەوە بەکارهاتووە و بەهێڤی و وویستی خۆیان هەرکات ویستبێتیان بەکاریان هێناوە چ

لەســەردەمانی ئــاین پەرســتی یــان نەتەوەپەرســتی و پاشــان سۆسیالیــستی و دیموکراتیەت و چەندین ووشەی تر کە هەمووکات گوێ ی کوردیـان پـێ پڕکـردووە تـابتوانن لـەم ڕێگایـەوە خواسـت و ئاررەزوەکانیـان بـە ئـەنجام بگەیـەنن ، ئاکـام کەسایەتی کورد لەم ڕۆژگارەدا کـە ڕۆژگـاری پـێش کـەوتن وزانـست و زانیـاری یـە لەهەموو نەتەوەیەك دواترو پاشکەوتوو تر بێت .

بێ گومان لەم کاتـەدا خـەڵکانێك لەوانـەی کـە بەرژەوەنـدی خۆیـانی تێدایـە ڕاسـت دەبنەوە و دەڵێن : کام پاشکەوتنەی کورد ؟ ئەوەنیە کورد ئەمڕۆ خاوەن حکومەت و سـەرقاڵی ئاوەدانکردنـەوەو بنیـاد نانـە.. وەڵامـی ئـەم پرسـیارەش لێـرەدا جـێ دەهێڵم بۆ برگەکانی داهاتوو.. دێمەوە سەر ناوەڕۆکی باسەکەی خۆمان.

لێـرەدا نامـەوێ زۆر لـەناوەڕۆکی باسـەکەمان وخـۆم لـە زۆرقـوڵایی مێـژوو بـدەم ئەوەندەی من دەمەوێ سەرەتایی دەست پێ کردنی قۆناغەکانی پەنابەریـەتی لـەم چەند ساڵانەی دوایی دا باس بکەم..

خۆ ئەگەر بمانەوێ باس لەسـەر هەڵـدانی ئـەم قۆناغـە لەسـەرەتایی مرۆڤایـەتی وە دەست پێ بکەین ئەوەمان بۆ دەسەلمێ کە مرۆڤ سەرەتایی ژیانی بـە سـەرهەڵدانی ئـەم قۆناغـە دەسـتی پـێ کـرد کـە ئـەو هۆزوتیرانـەی بڵاودەبوونـەوە بەمەبەسـتی دۆزینەوەی جێگای ژیان کەبتوانن ئاسودە و کامـەران تێدابـژین و لەهـەمان کـات دا پێداویستیەکانیان دابینٚ بکـەن . کـە ئەمـە تێکـڕای سـەردەمی ژیـان وابـووەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ جۆری ڕەو و کۆچەکان گـۆڕانی بەسـەردا هـاتووە و شـێوازی گۆڕیـوە و کورد بەیەکێك لەو نەتەوانەی کـە ئـەو سـەردەمانە کۆچـی شـارو لادێ ی هـەبووە و بەپێ ی هاتنی وەرزەکانی ساڵ، تادواترین نیشتەجێ بوون و نەگۆڕان...

بەڵام هۆکاری شەڕو داگیرکـردن مـەودای ئـەو حەوانـەوەیان بـۆ مـاوەی دوورو درێـژ نەداو ، و دواترین کوردیش بۆ بەر پەرچ دانـەوەی ئـەو زۆر داریانـە دەسـتی داوەتـە بەرەنگاربوونەوە بەرهە ڵستکاری... ئەمەش زیاتر ماوەی ئاوارەبوون و دەربەدەری

رەخساندووە.. بەدێژایی شۆڕشەکانی کورد لەناوچە کوردیەکان، ئەگەر سەیری شۆڕشی ئەوڕەحمان پاشا ١٨٠٦ و شۆڕشی بڵباسان ١٨١٨ و شۆڕشی بەدرخان بەگ ١٨٤٣ بۆ ١٨٤٦ و شۆڕشی یەزدان شێر ١٨٥٣ بۆ ١٨٥٥ و شۆڕشی شێخ عوبەیدڵڵای نەهری ١٨٨٠ و شۆڕشی سەعیدی پیران و خالید ئاغای جەلالی لەلای ئارارات و شۆڕشی سمایل ئاغای سمکۆ لە شنۆ و هەروەها شۆڕشی جەعفەر سوڵتانی هەورامان لە ١٩٣٢ و شێخ محمودی نەمرو شێخ عبدولسلام بارزان و شێخ ئەحمەدی بارزان و کۆماری مەهاباد بە سەرکردایەتی پێشەوا قازی محەمەد و شۆڕشە یەك لەدوایەکەکانی بارزانی نەمر . هەریەك لەم شۆڕشانەش بەپێ ی بارودۆخی ناوچەیی و شۆڕشەکانیان و ڕادەی کاریگەریان و هەریەکەیان بەهۆیانەوە کۆمەڵێك لە کەسایەتی ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕ ئاوارەبوون هەرچۆن سەیری کۆماری مەهاباد و پێشمەرگەکانی بارزانی نەمر بکەین کە دوای روخانی ئەم کۆمارە و دوای چەندین شەڕو بەربەرەکانی لە سنوری عێراق - ئێران - تورکیا وە ڕوویان لە یەکێتی شورەوی (یەکێتی سۆڤیەت)ی ئەو کات کردو بوونە پەنابەری سیاسی... هەروەها زۆر لەو کوردانە لەم شۆڕشانەدا بەشداربوون دووردەخرانەوە و ڕەوانەی شارەکانی خواروی عێراق دەکران ڕێڕەوی مێژووی لەڕووی باری سیاسی یەوە یەکەم هۆکاربوو کە کورد بخاتە ئەو ێژاوی پەنابەری و کۆچ ڕدویەوە . هەرچەندە قۆناغەکانی ئەم سیستەمەی ژیان کەدەتوانین بەم شێوە ناوی بەرین ، چونکە ئەم دیاردەیە تەنها لەنەتەوەیەکی وەك کوردانیە بەڵکو هەموو جیهان و هەموو نەتەوەیەك سەرەڕای ئازادی و بوونی دەوڵەت هەوڵی کۆچ و ڕەوکردن و ڕووکردن لەژیانی باشترو خۆشتر و ئازاد تر دەنێن....

بەم شێوەیە زۆر دورناکەومەوە و باس لە ٣٠ ساڵ لەمەو پێش کە زیاتر کورد لەوسەردەمەوە کەوتە ئەوەی باری کۆڕەوی و ئاوارە بوونی بەکۆمەڵ و بەوشێوە

دیارو و بەرچاوە دەست پێ بکات. قۆناغەکانیش بەم شێوەیە دەست پێ دەکەن :..

- شۆڕشی ئەیلول و ساڵانی (٦٠) شەستەکان وەك پێشتر باسمان کرد کە کورد و شۆڕشەکانی یەك لەدوای یەك و بەهۆی هۆکاری جیاواز ، چ خودی و ناخۆیی و ناوچەیی و نیودەوڵەتی بێت ئەم شۆڕشانە سەرکوت کراون و کۆتای یان پێ هاتووە .

بەڵام هەستی نەتەوایەتی و بیرکردنەوە لەوەی کە هەوڵ بدرێت نەتەوەی کورد لەم ئاست و ستەمانەی ژیانی رزگاری بکەن. وەك ئیشارەتمان بەوەدا کە شۆڕشگێڕانی کورد لە کوردستانی عێراق بەرەو کوردستانی ئێران کەوتنەڕێ و دواتر بەهۆی دارمان و کۆتایی هاتن بە کۆماری مەهاباد و دەرچونی بارزانی نەمر و ئەو ٥٠٠ پێشمەرگەی بەرەو روسیا و دوای ژیانی ئاوارەیی و دوورە وولاتی و پاشان ساڵی ١٩٥٨ خۆی و زۆر لەهەڤاڵانی گەڕانەوە کوردستان . بێ گومان گەڕانەوەیان بۆ کوردستان و پێشوازی کردنیان لەلایەن جەماوەری کوردەوە لە بەغدا . ئەوەش دوای بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ ی تەموزی ساڵی ١٩٥٨ کە رژێمی پاشایەتی لە عێراق کۆتایی پێهات و یەکێك لەبڕیارە گرنگەکانی شۆڕشی ١٤ی تەموز ئەوەبوو کە گەلی کوردی لەگەڵ گەلی عەرەب لە عێراق دا بەهاوبەش و یەکسان لەقەڵەم داو دانی بەبوونی کورد لە دەستوری عێراقدا نا وەك نەتەوەیەك لە عێراق و ماف ژیانی بەئازادی هەبێت.

دواتر ساڵی ١٩٥٩ یاسای ئەحزاب و کاری سیاسی بەشێوەیەکی ئازاد هەموو پارتە بەرهەڵستکارەکان کاری سیاسی خۆیان بکەن و کورد لەڕێگای پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کە ئەو دەم تەنها پارتێکی سیاسی نەتەوەیی کوردی بوو و نوێنەرایەتی سەرجەم گەلی کوردی دەکرد بە هەموو چین و توێژەکانیەوەو بۆ ماوەی ساڵێك بە ئازادی وەك پارتێکی سیاسی کوردی لە سەرانسەری عێراقدا کاری

خۆی کرد. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند و جارێکی دی واوەیلا و ئازارو ئەشکەنجە و دیکتاتۆریەت دژی گەلی کورد کەوتە ئاراوە... هەرچەندە ئەوکاتیش بەهۆکاری ئاڵۆزی باری سیاسی و نائارامی دۆخەکان و سەقامگیرنەبوونیان ئەو کەسایەتی و شۆڕشگێڕانە هەمیشەهەڕەشەلێکراوبوون بۆ ئازارو ئەشکەنجە دانیان و زینداني کردنیان.. بەم شێوەیە ڕاوەدونان هەر بەردەوام بووە کەسایەتی کورد و ڕۆشنبیری ڕاونراو بووە. کەواتە بیرکردنەوە لەڕاکردن و دورکەوتنەوەتاڕادەیەك هەبووە هەرچەندە ئەوکات گیانی بەرەنگاری و بەردەوام بوون لەشۆڕش و قوربانی دان زیاتر بە جۆشی کردوون، لەوسەردەمانە هەندێ لەو کەسایەتی یە سیاسی و ڕۆشنبیرانە ڕویان لە هەندەران کردووە ، ئەوەبوو ڕژێمی عبدالکریم قاسم لەساڵی ١٩٦٠ چەند کۆسپ و تەگەرەی خستەبەردەم (پارتی دیموکراتی کوردستان) کەئەو کات نوێنەرایەتی گەلی کوردی دەکرد و تاکە لایەنی سیاسی بوو لەکوردستانی عێراق خەباتی سیاسی بەڕێوەدەبرد و داوای مافی سیاسی و ئیداری و چارەنووسسازی بۆ گەلی کورد دەکرد وەك مافێکی ڕەوای خۆی. پاشان ڕژێم چاودێری بارزانیان دەکرد بزانن کە هەڵویستی بەرامبەر ڕژێم چی دەبێت... بەم پێ یە کەپارتی وەك لایەنێکی سیاسی کاری خۆی دەکرد لەهەوڵ دابوو کەژمارەیەکی زیاتر لە کورد پەروەر و ڕۆشنبیر لەخۆی کۆبکاتەوە و بتوانێ داکۆکی لەمافە زەوتکراوەکانی گەلی کورد بکات... ئەوەبوو لەڕۆژی ١٩٦١/٩/١١ شۆڕشی ئەیلول بەرپابوو دژبە ڕژێمی عێراق. بەم شێوەیە ئەو ئەندام و کادرو ڕۆشنبیرو ئەفسەرو کەسایەتیە نیشتمان پەروەرانە پەیوەندیان بەپارتی و شۆڕشەوە کرد ڕویان لەچیاکان کرد و دەستیان دایە چەك و شۆڕشی ئەیلول یان بەرپاکرد کە ١٣ ساڵی خایاند...نائارامی باری سیاسی وولات و ئەوڕژێمانەی کە دەسەلاتیان دەگرتە دەست بە تێکڕا دژ بەگەلی کورد بوون و لەدیکتاتۆریەت و خۆپەرستی بەولاوە نەك بۆ کورد بگرە بۆ نەتەوەی عەرەبیشیان پێ نەبوو.. گەر سەیری کودەتایی ١٤ی

تەموزی ٥٨ بکەین و حوکمی عبدالکریم قاسم و دان نان بەبوونی کورد و ئازادبوونی کاری سیاسی بۆ کورد ، بەلآم ئەوەندەی نەخایاند درندەیی و شەڕوکوشتار دەستی پێ کردەوە و دواتر لە ٨ی شوبات ١٩٦٣ ئەم ڕژێمە بەکودەتایەکی سەربازی لابراو و چەند ئەفسەرێکی سەبازی دەستیان بەسەر حوکمدا گرت و دووبارە تاك ڕەوی و دیکتاتۆریەك و دژایەتی مافەکانی گەلی کورد دەستی پێ کردەوە و کورد لەگێژاوی شەڕو دوودڵی و ڕاڕایی دا دەژیاو حوکمی بەعسی لەهەموو بەڵێن وپەیمانەکانی بۆ کورد پاشگەزبوونەوە. دواتر حوکمی هەردوو برا عبدالسلام و عبدالرحمان و ناکۆکیەکانی نێوان پارتی و جیابوونەوەی ئیبراهیم ئەحمەد و هەندێك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و بەرپابوونی شەڕی ناوخۆ.. دواتر ١٧ی تەموز ١٩٦٨ و گەڕانەوەی بەعسیەکان بۆسەر حوکم.. ڕەنگە سەرەڕای هەموو دژایەتی و دووبەرەکی و ناکۆکی ئەو دەسەلآت دارانەو هاتنە سەرحکومیان تەنها لەیەك خالّ دا یەکیان دەگرتەوە ئەویش دژایەتی گەلی کورد بوو...

کەواتە ئەگەر بەوردی و بەشێوەیەکی زانستیانە و فەلسەفیانە باری نەگۆرو ئالۆزکاوی میللەتی عێراق بەگشتی لێك بدەینەوە کاریگەری بۆ سەردەرونی ئەم نەتەوەو کەمەنەتەوایەتیانەی کە لە عێراق دا دەژین دەبێ چۆن لێك بدەینەوە و هەلّوێست و بۆچوون و ئاکام و دەرنجامی ژیان و پاشە ڕۆژی ئەم خەلّکە و تاوانی ئەم جەماوەرە دەبێ چی بێ....؟ کەواتە ویستن و ئارەزووی گەیشتن بەدەسەلآت و کورسی و فەرمانڕەوای و بڕیاردان و گەیشتن بەمەرام و بەرژەوەندیە تایبەتی و تاکەکانی ئەو حوکمڕانانە وایان لەباروذۆخ و ژیان و گوزەرانی تاك لەعێراق بەگشتی کردوە کەهەست بەوە نەکرێت وولآت هەیەو ناوی عێراقە و پێش بینی سەقامگیری و ئاشتی و دووبارە ژیانی تیادەکرێتەوە.

# سەرەتایی ٧٠ کان و بەیانی ١١ی ئادار

لەسەرتایی سالّی ١٩٧٠ و بەتایبەتی پاش ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی ئادار و وەرگرتنی دەستەلاّتداریەتی ئیداراتی ناوچەی کوردستان لەلایەن شۆڕشی ئەیلولەوە و خەلّکی کورد بەشێوەیەکی گشتی شادومان بوون بەو ڕێککەوتنەو بارودۆخی کوردستان ئاسایی بویەوە و ئاوەدانی دەستی پێ کردو بواری ڕۆشنبیری کوردی هەندێ ئازادی بەخۆوە بینی. زانکۆی سلێمانی دامەزراو بیروڕای ئازاد لەڕووی ڕامیاری و کەسانی شۆڕشگێڕ بەئازادی بە جەماوەری کوردستان شادبوونەوە، بۆیە نیشانەی کۆچ کردن لەودوو تا سێ ساڵەی دوای سالّی ١٩٧٠ زۆر کەم بوو جگە لەهەندێ قوتابی کەبۆ خوێندن ڕەوانەی دەرەوە دەکران یان بەهۆی نەخۆشی و گەشتو گوزارو بازرگانی لەوانەش هەندێك کەچوونە دەرەوە دواتر نەگەڕانەوە و لەو وولاّتانە بوونە پەنابەر. کۆتایی سالّی ١٩٧٣ و چوونە ناوسالّی ١٩٧٤ وە کە وردەوردە ناکۆکیەکانی نێوان شۆڕشی کورد و ڕژێم بەدەر دەکەوتن و بەتایبەتی پاش ئەو پلانە گەورەیەی کەکرا بۆ تیرۆر کردنی سەرۆکی شۆڕش و کورد (بارزانی) لە چۆمان و سەری نەگرت . هەروەها گرتن و هاندانی خەلّکی تر بۆ دژایەتی کردنی شۆڕش و پاشگەزبوونەوە لە ناوەڕۆکی ڕێککەوتن نامەکە ئەمە کاردانەوەی لەسەر هەندێ خەلّکی تر هەبوو بۆ کۆچ کردن بە هەندێ بیانووی جۆراو جۆر..

هەر چەند ئەو کات ئەم ئاوارییە لەدوو شێوازدابوو یان بلّێن دوو ڕەگەزی جیاواز بوو ئەوانەی ڕویان لەخوێندن دەنا بەرەو یەکیەتی سۆڤیەت دەچوون ، ئەو کات ئەم وولاّتە خۆی بەدۆستێکی باشی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلانی بن دەست و چەوساوە دەزانی و لەو گەلانەش کورد بوو وەك وتمان هەندێ لەوانە نەگەڕانەوە و پاشان ڕوویان لەوولاّتانی ئەورووپی کرد و بوونە پەنابەری سیاسی. لەهەمان کات دا

ئەو بارودۆخە سیاسیەی کورد و گۆڕانکاریەکان هەمیشە ماوەیان نەداوە کەسایەتی کورد بۆ ماوەیەك بحەوێتەوە و هەست بەئاشتی و ئارامی و سەربەستی بکات و بزانێت دوونیا تاچ ڕادەیەك لە پێشکەوتن دایە . کەواتەمرۆڤی کورد لەم بەختەوەری و کامەرانیەی ژیان هەمیشە بێبەش بووە و هەمیشەش هەوڵی ئەوەی داوە بەهەر شێوەیەك بێت بەم بەختەوەری و کامەرانیە بگات و لەهەر سوچێکی ئەم زەویەدا بێت هەنگاوی بۆ بنێ و بەهەر ئازارو ئەشکەنجەو نارەحەتی یەك بێت بەدەستی بێنێ و کەمێك بحەوێتەوە. هەرچەندە رزگاربوون لەم ئازارو گرفتانەی ژیانی دووبارە ڕووکردنە لە کۆمەڵێك گرفت و کۆسپی تری ژیان کە بەکەسایەتی کورد گەلێك نامۆن و ڕەنگە تواناي بەرەنگاربوونەوەی نەبێ و زور لەوانەش تووشی جۆرەها گرفت و مال وێرانی وسەرگەردانی و لەدەست دانی منال و خێزان و جۆرەها گرفتی تری کۆمەلایەتی کە لەبەشەکانی تردا بە شێوەیەکی بەرفراوان تر باسیان لەسەردەکەین...

# خەڵکی کۆچ کردوو لەساڵی ١٩٧٤- ١٩٧٥ واتە لەکاتی دەست پێ کردنی شەڕ تا نسکۆ

پاش ئەوەی بەتەواوی دەرکەوت کە ڕژێم پاشگەز بۆتەوە لەزۆربەی زۆری خاڵەکانی ڕێککەوتنامەی ١١ ی ئاداری ١٩٧٠ و پاش ئەوەی هەوڵێکی زۆر درا کە شەڕ دروست نەبێتەوە چونکە خەڵکێکی زۆر پێش ئەم ساڵە لە جێگەو ڕێگەی خۆیان دەرکرابوون بەهۆی...

١. دەرکردنی کوردە فەیلیەکان لەبەغدا و جێگاکانی تری عێراق و ناردنیان بۆ ئێران بە زۆر و هاتنی هەندێکی زۆریان بۆ ناوچەکانی سنوری شۆڕش لە کوردستان.

٢. دەرکردنی خەڵکی کورد لەو شوێنانەی کەڕژێم بڕیاری دابوو لەسنوری ئۆتۆنۆمی دانەبێت و نیشتەجێ کردنی عەرەب لەجێگایان وەك سنجارو شێخان و دەوروبەری کەرکوك و ناو کەرکوك وخانەقین و جەلەولاو زۆر شوێنی تری کوردستان.. بەواتا هەموویان ڕاگوێزارن (تەرحیل).

٣. ڕاکردنی خەڵکی کورد لەو جێگایانەی کە لەسنوری دەرەوەی کوردستان بوون لە عێراق بەهۆی بە زۆر کردنیان بە لایەنگیری لە بیرو ڕای پارتی بەعسی سۆسیالیست. بەواتا (تەبعیس)....

بەڵام هەر لەهەمان کات سودیان نەبوو بۆیە لە١٩٧٤/٣/١١ ڕژێم یاسای ئۆتۆنۆمی کارتۆنی ڕاگەیاندو خەڵکی کوردستان و بە کوردەکانی شارەکانی تریشەوە نارازی بوون بەو شێوە بڕیارە.

بەشێوەیەکی زۆر دیارو بەکۆمەڵ و بەماڵ و منداڵەوە پەیوەندیان بەشۆڕشەوە کرد و شارەکانیان بەجێ هێڵا. ئەوەبوو ڕژێم بەشێوەیەکی دڕندانە کەوتە وێزەی شارو

گوندەکانی کوردستان بەفرۆکەو بەکارهێنانی چەکی قەدەغەکراوی ئەو سەردەمە (ناپاڵم) ی فسفۆری کە زیانێکی زۆری گەیاندە خەڵك کوردستان وبەتایبەت شاری (قەلادزێ) لە ١٩٧٤/٤/٢٤ کە بۆردومانی شوێنی دیاری کراوو بوو، زانکۆی سلێمانی کە گوێزرابووەوە ئەوێ و بووە هۆی شەهید بوونی چەندین قوتابی و هەروەها شاری هەڵەبجە لە ١٩٧٤/٤/٢٦ کە ئەویش بووە هۆی شەهید بوونی دیان کەس و بریندار بوونی سەدان کەسی دی بێ تاوان . لەگەڵ چەند شوێنێکی دی ئەمانەش بوونە هۆی ئەوەی کە خەڵکی بەلێشاو کۆچ بکەن و لە ناوو ئێران چەندین ئۆردوگا دروست کرابوون ئاوارەکانی کوردی کوردستانی عێراقی تێدا نیشتەجێ کرابوون لە ترسی بۆردوومانی کوێرانەی ڕژێم ، ئەو ئۆردوگایانەش ئەمانەبوون....

١. لەشاری شنۆ ئۆردوگای (نەلێوان) و کانی سپی بەخەیمە کرایەوە و هەروەها ئۆردوگای (زێوێ) لە ناوچەی (مەرگەوەڕ) وە لەشاری نەغەدەئۆردوگایەك دروست کرا لە نزیك ماڵەکانی بنەماڵەی بارزانی، ئۆردوگای (نەلێوان) لەگەڵ هاتنی وەرزی پایز گوێزرانەوە نزیك شاری سەردەشت بۆ ئۆردوگای (ڕەبەت) ئەمانە لەسنوری پارێزگای (ئۆرمیە) هەروەها لەهەندێك لەشارەکانی (پیران شەهرو و مهاباد) یش ئاوارە نیشتەجێ دەکران .

٢. ئۆردوگایەکی گەورەش بۆ پەنابەرانی ناوچەی پشدەر و بەشێك لە ناوچەی باڵەك و پاش نسکۆی شۆڕش هەندێ خێزانی ناوچەی بارزان و مزوری و نێروەی و ئاکرێ و شوێنەکانی تری کوردستانی عێراق گوێزرانەوە ئەم ئۆردوگایە.

٣. ئۆردوگای (سەولاوە و کامیاران) لەپارێزگای کوردستان و هەندێك لەشارەکانی (مەریوان و سنە و سەقزو بانە) نیشتەجێ کرابوون.

٤. ئۆردوگـای سـەریاس ، ڕەوانسـەر ، سـەرابلە ، سـەرابگەرم ، سـەراب نیلوفـەر، ئەنزل ، سەرمیل) لە پارێزگای کرمانشا و هەندێك لـە شـارەکانی (پـاوە و جـوانرۆ و سەرپێل زەهاب و قەسرشیرین) نیشتەجێ بوون.

٥. ئۆردوگای تری گەورە لە پارێزگای (ئیلام) هەبوون.

بەشـێوەیەك ئـەم ئۆردوگایانـە لەلایـەن ڕژێمـی شـاوە تـەل بـەن کرابـوون و خـاڵی پـشکنینی ژانـدارمیری لـە دەرگـای ئۆردوگاکـان هـەبوون پارێزگاریـان دەکـرد و بەمەستی سەرەکیش ڕێگانەدان بوو بۆ چونەدەرەوەی خەڵکی و نەهاتنـە نـاوەوەی خـەڵکی دی. لـەناو ئۆردوگاشـدا دەزگـای ژانـدارمیری و سـازمانی سـاواك ی ئێرانـی چاودێری و بەڕێوەبردنی ئیداری ئۆردوگاکانیان دەکرد بۆ چوونە دەرەوەی خـەڵکی بەپسوڵەی مۆڵەت پێدان . هەندێ لەم خەڵکە ئاوارەیە کە تەنها لەڕووی مرۆی یـەوە جێگەی حەوانەوەی بۆ جێ بەجێ کرابوو لەلایەن مانگی سووری ئێرانیـەوە لـەڕووی خـواردن و دەرمانخانـەوە پزیـشکی فریـاگوزاری خزمـەت دەکـران . جگـە لەمـەش شتێکی تری یاسایی نەبوو کە بتوانن وەك پەنابـەرێك بـە شـێوەی ڕەسمـی مافیـان هەبێت و لەچوارچێوەی یاسای دا بـژین. ئـەم شـێوازە ژیانـە تانـسکۆی ١٩٧٥ بـەم شـێوەیەیە بـوو خـەڵکانێکی زور هـەبوون کـە هـەوڵی دەرچـوونیان دەدا لـە ڕێگـای سنوورەکانی ئێرانەوە کە هەندێك لەوانەش دەربازیان بوون .

هەربۆیە دوای ڕێکەوتنە شومەکەی ١٩٧٥/٣/٦ ی جەزائیر کە لەنێوان ڕژێمی عێـراق و شای ئێران و سەرپەرشتی ڕژێمی جەزائیری لـە جـەزائیر ئـەم ڕێککەوتنـە مـۆرکرا (وێنەی سەدام و شاه) بارودۆخـەکان گـۆڕان و شـێوازی پەنابـەری و هەڵـسوکەوتی ڕژێمی شاهەنشا و تابووری پێنجەم و دەزگای موخابەراتی ڕژێمی بەعسی بـەجۆرێك دەسـتیان وەردایـە نێـوو دۆخـەکان و یـاری کـردن بـەباری دەروونـی ئـەو خەڵکـە ، ئەویش بەپروپاگەندە کردن بۆ گەڕانەوەی خەڵکی بۆ عێراق... کـە سـاواکی ئێرانـی هەمان هەوڵی دەدا.. لێرەدا کێشەو گرفت بۆ خێزان و کەسایەتی کورد دروست بـوو

لە بڕیاردان بۆ گەڕانەوە یان مانەوە یان وون بوون لەو ژیانە بەیەکجاری و ڕووکردن لەهەندەران .. دوای ئەم ڕێککەوتنە شۆڕش بەمەبەستی زیاتر لە ناونەچوونی خەڵکی کوردستان و بۆ بەرژەوەندی شۆڕش بڕیاری ڕاگرتنی شۆڕشی دا بەشێوەی کاتی کە ئەو کاتە دیاری کراو بوو لە (٣ تا ٦) مانگ بوو بۆیە سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول لە ڕێگای بەرپرسەکانیەوە خەڵکی ئاوارەی بەگشتی ئازاد کرد لەوەی کە...

١. هەرکەس ئامادەیە لەناو شۆڕش بمێنێتەوە و لەناو ئێران بەڕەسمی پەناهەندە بێت .

٢. هەرکەس دەیەوێت بۆ دەرەوەی وولاتی ئێران بڕوات .

٣. هەرکەس دەیەوەێت بگەڕێتەوە بۆ عێراق .

ئەوەبوو خەڵکی ئاوارە کە لەو ئۆردوگاو شارانەدا بوون بەو سێ ڕێچکەیە ڕێگای نادیاری خۆیان گرتەبەر کە هەریەك بەم شێوەی لای خوارەوە باسی لەسەردەکەین...

١. لەوانەی کە گەڕانەوە بۆ ناو عێراق

پاش نسکۆ و ڕاگەیاندنی ڕاگرتنی شەڕو ئازاد کردنی خەڵکی ئاوارە بۆ گەڕانەوە، گەڕانەوەی خەڵکی ئاوارە بە چەند شێوەیەك بوو...

- هەندێکی زۆر لە ئۆردوگاکان هەر لەمانگی ٣ و ٤ و ٥ ی ١٩٧٥ بەپێ لێبووردنە یەك لەدوا یەکەکانی ڕژێم دەگەڕانەوە و ئەمانە هەموویان لە عێراق پاش پرسیارو وەلامێك ئیزن دەدران بۆ سەر جێگاو ڕێگای خۆیان لە کوردستان لەگەڵ هەندێ ئالوگۆڕی فەرمانبەری لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر یان دابەزینی ناونیشانی فەرمانبەری بەلام لە کوردستان مانەوە جگە لەوانەی کەلە ریزی سوپا و پۆلیس و دابوون هەموویان گواستنەوە بۆ شارەکانی خوارووی عێراق .

• هەندێکی تر لە ئۆردوگاکان و شارەکانی ئێران لە مانگی ١٠و١١ی ١٩٧٥ بە پێی لێبوردنێك تایبەتی گەڕانەوە ئەمانە هەموویان بەماڵ و منداڵەوە هەر لەسنوورەوە بەرەوو خواروی عێراق نێردران و لەشارەکانی رومادی و حللەو دیوانیە و کەربەلاو نەجەف و سەماوە و ناسریە و بەسرەو عەمارەو کوت بە قەزاو ناحیەو گوندەکانیانەوە نیشتەجێ کران لەگەڵ ئەم کردارە هەندێکی تر لە کادیرو پێشمەرگە ناسراوەکانی شۆڕش کە پێشتر چووبونەوە کوردستان هەموویان کۆکرانەوە و بەفەرمانی ڕەسمی ئەوانیش لەگەڵ ماڵو منداڵیان دا بەزۆر گوازرانەوە بۆلای ئەوانی تر لە شارەکانی خوارووی عێراق و لە فەرمانەگەی جۆراو جۆر بە فەرمانبەری بچوك و سەرەتایی دایان مەزرانن.. بارودۆخی ئەم خەڵکە زۆر خراپ بوو چونکە ئەوانە ئالودەی ئاو هەواو داب و نەریت و شێوازی ژیان و رەفتارکرد و باری کۆمەڵایەتی و بگرە لاوازی لە زمان و چۆنیەتی گفتوگۆکردن بە تایبەت هەندێك لەو خێزانانە رەوانەی گوند و زۆنگاوەکان کرابوون کە دابڕابوون لەم دونیایەو هیچیان لێوە نزیك نەبوو . سەرەڕای دەرچوونی بڕیاری شۆڤێنیستیانەی کە ڕۆژانە ڕژێمی فاسشتی بەعسی دەری دەکرد و یاری بەفکرو دەروونیان دەکرد بە گواستنەوەی کاروباری نفوس و تەجنید بۆ ئەو شارانەی کە لێوەی نزیك بوون و لەگەڵ ئەوەش داوای ئەوەیان لێدەکرا کە ژن بەعەرەب بدەن و ژنیش لەعەرەب بهێنن بۆ ئەوەی تێکەڵاوی دروست ببێ چونکە وایان ڕادەگەیان کە چیتر ئەوان بەهیچ شێوەیەك ناگەڕێنەوە بۆ کوردستان. ئەم زوڵم و زۆر داریە وای کرد کە هەر زوو بە زوو خەڵکی لەوێ ڕابکەن و جارێکی تر پەیوەندی بە شۆڕشەوە بکەنەوەو یان هەندێك بە هەرجۆرێك بێت خۆیان دەربازبکەن بۆ هەندەران ، تا ئەم دۆخەی ئێستاشمان هەندێ خێزان مانەوە و لەوێ بەیەکجاری نیشتەجێ بوون چوونکە پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ژن و ژن خوازی لە نێواندا دروست بوو .

- هەندێکی تر لە ساڵی ١٩٧٩ کە ئەمانە ڕاستە خەڵکی تری نا بەرپرسی کەمتر لەناویاندا بوون بەڵام زۆربەیان لەو لێپرسراوە دیارانەبوون کە دەوریان هەبوو لە شۆڕشی ئەیلول ئەو لێپرسراوانە بە ماڵ و منداڵەوە برانە پایتەختی ڕژێم و جێگاو ڕێگایان پێ درا لەگەڵ پلەی لێپرسراویەتی و ئەوانەش کە لێپرسراویەتیان کەمتربوو گەڕانەوە بۆ کوردستان بۆ جێگاو ڕێگایی خۆیان .

٢. ئەوانەی لە ئێران مانەوە و بوونە پەنابەر...

پاش تەواوبوونی لێبووردنەکانی ڕژێم هەتا مانگی ٥ و ٦ ی ١٩٧٥ لە مانگی ٨ و ٩ ی ١٩٧٥ دا دەوڵەتی ئێران دەستی کرد بەدابەش کردنی فۆرمی تایبەت بەسەر ئاوارەکاندا بۆ ئەوەی پڕبکرێنەوە کە ئەویش هەریەك بەئارەزوی خۆی ئەوەی دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ عێراق یان لە ئێران بمێنێتەوە یان دەچێتە هەندەران .

پاش تەواوبوونی لیست و فۆرمەکان لە مانگی ١٠ی ١٩٧٥ ئەوانەی داوای عێراقیان کردبوو بەپێ ی ئەو لێبووردنە تایبەتیە ئەوانە گەڕانەوە بۆ خوارووی عێراق و ئەوانەی داوایان کردبوو لە ئێران بمێننەوە بەسەیارەی گەورە گوێزرانەوە بۆ شارەکانی سەرو و ڕۆژهەڵات و باشور و ناوەڕاستی ئێران بە واتا بەهیچ شێوەیەك نەیانهێشت ئاوارەی کوردی عێراق لەناوچەکان و شارەکانی کوردستان و یان بەشی ڕۆژئاوای ئێران بمێننەوە ، شاری ئێران نەمابوو لەو جێگایانەی کەباسمان کردن خەڵکی ئاوارەی کوردیان بۆ نەگواستبێتەوە ، کە ئەوانیش لەپەخشەکانی فەرمانداری و ناحیە و گوندەکاندا نیشتەجێ کران و ئیش و کاری کشت و کاڵی و کرێکاری و پاسەوانی یان بۆ دیاری کرا کە هەندێ موچەیان هەبێت بۆ ژیانیان لەگەڵ پێدانی دەفتەرچەی پەناهیندەیی بە شێوەی ڕەسمی ، بەڵام هاتووچۆیان بۆ شارەکانی کوردستان و هەتا چەند ساڵێك بۆ شارەکانی دیش ئازاد نەبوون و دەبوو بەبێ ئێزن بۆ هیچ شوێنێك سەفەرنەکەن ، هەندێ لەم خەڵکەش هەوڵی دا کە ئێران بەجێ بهێڵن و کۆچیان کرد بۆ وڵاتانی تر وەك (پاکستان و ئەفغانستان و ڕووسیا و

تورکیا و ئۆکرانیا) لەو جێگایانەشەوە بۆ وولاتانی ئەورووپا هەندێکیش لەرێگەی بەندەر عەباس و خورەمشەهرەوە خۆیان دەرباز کردو گەیشتنە وولاتە عەرەبیەکانی کەنداوی عەرەبی.. بەپێی ئەو فۆرمانە کە پێشتر پڕکرابوونەوە ئەوانەی کە داوایان کردبوو کە برۆن بۆ دەرەوەی ئێران ئەوا بەشێوەی ڕەسمی چەندین خێزان نێردران بۆ وولاتانی ئەمریکا و کەنەدا و بەریتانیا و نەمساو سوید و چەند وولاتێکی تر...

# سەرەتایی سەرهەڵدانەوەی شۆڕشی گوڵان و ڕاگوێزانی دێهاتەکان

دوای هەر نسکۆو هێوربوونەوەی شۆڕشێك.. دووبارە سەرهەڵدان و بەردەوام بوونەوەو درێژەدان بە خەبات و تێکۆشان دێتەوە ئاراوە ، هەرچەندە ئەم جارە کورد و شۆڕشگێڕانی لەم سەرهەڵدانەوەیەدا بەشێوازو بیرو ڕاو بۆچونی جیاواز بوو کە دەرەنجامی دابڕان و پچڕان و پەرتەوازەبوون بەجۆرێك ئەم شیرازەیە ببڕێت و ئەوانەی شۆڕشگێڕو روناکبیرو بەتوانا لە بواری سەربازی و سیاسی کە جێگای دیارو بەرچاویان هەبوو یان ڕوویان کردەوە عێراق و لەشارەکانی کوردستان نیشتەجێ بوون یان ئەوانەی لەئێران بڕیاری مانەوەیان دا وازیان لە شۆڕش و خەبات هێنا و ئەوانەی تریش ڕویان لە هەندەران نا ، هەندێك لەوانەش کە مانەوە و دوای تەواو بوونی لێبوردنەکان بڕیاری گەڕانەوەیان دا ئەوانەش ڕەوانەی ناوەڕاست و خوارووی عێراق کران وەك (نەفی) کەواتە ئاوارەبوون و دەربەدەری و ئەم ژیانە لەم چوارچێوەیەدا لە ڕووی دەرونیەوە کاری سلبی و ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر کەسایەتی کورد ، سەرەڕای ئەم هەموو کۆسپ و گرفتانە ئەو کۆمەڵە شۆڕشگێڕو خەبات گێڕە توانیان دووبارە گڕی شۆڕش هەڵکەنەوە و بەرەنگاری ئەو هەموو تەگەرانەبن .

روانینیش لەسەرهەڵدانەوە و دروست بوونەوەی شۆڕش لەچەندو چۆنایەتی و شێوازەوە جیاوازی هەبوو چوونکە سەرەتاکانی بە دووبەرەکی و لەیەك خوێندن و دژایەتی و تۆمەت هەڵبەستن وشەڕی ناوخۆ پێش ئەوەی بیر لەوەبکرێتەوە چۆن دژی دوژمنەکانی کورد ببنەوە ، کەواتە دروست بوونەوە لەسەر حسابی یەکتر.. لێرەدا بەرەنگاربوونەوە و دژایەتی کردن بەشێوازێکی دی دەستی پێ کرد شۆڕشی

نـویٚ و نوێکـاری هاتەکایـەوە و چـەندین لایـەن و بزوتنـەوەی سیاسـی و سـەربازی خۆیان هاویشتە مەیدانی خەبات و تێکۆشـان و بیرۆکـەی فرەلایـەنی هاتـە ئـاراوە..

بەلاّم ئەم فرەلایەنیە گێژاوێکی تر و ئالۆزکاریەکی بـۆ بزوتنـەوەی رزگـاری خـوازی گەلی کورد هێنایە کایەوە.. ئەمەش هۆکارو دەرەنجامەکانی ڕوون و دیارن و هەموو کەسێك بەخۆی دەتوانیٚ ئەم لێکدانەوەیە بکات و ئەمەش لێرەدا کـاری سـەرەکی و مەبەستی من نیە...

بـەلاّم بـەم شـێوازو جـۆرە سـەرهەلّدانەوەیە کاریگـەری سـلبی هـەبوو بـۆ سـەر رۆشنبیران و شۆڕشگێرو نیشتمان پـەروەرانی کـورد کەهەنـدێك لەوانـە تـەنها بـیری کوردایەتی و خەبات کردن بۆ رزگاری کورد بوو نەك کاری حزبی و دژایەتی کردن..

بەهەرحالّ ئەمەوای کـرد زۆر لـەو کەسـایەتی یـە دلّسـۆزانەی کـورد مەیدانەکـە بـەو شێوە ئالۆسکاویەوە چۆلّ بکەن و بیر لەپەنابەرێتی و دەرچوون لەو ژیانە بکەنەوە، هەنـدێك لەوانــە کـە پێـشتر ڕوویـان لـە عێـراق کردبـوو ئەوانــەش لـەو سـالاّنەی سەرهەلّدانەوەی شۆڕش و بەتایبەت لەشاری سلێمانی هێرشـێکی بـەرفراوان کرایـە سەر ئەو شۆڕشگێرانە و زۆربەی زوریان تیرۆر کران.

دوای ئەم سـەرهەلّدانەوە ئەوەنـدەی نەخایانـد ڕژێمـی بەعـسی دەسـتی دایـە شـەڕ لەگەلّ ئێران ئەویش دوای بـەرپابوونی شۆڕشـی ئیسلامی ئێـران و روخـانی ڕژێمـی شاهانــشاە ، هۆکارەکــانی دەگەڕانــدەوە بــۆ ئــەوەی ڕژێمــی عێــراق لــە رێککەوتننامەکـەی نێـوان خـۆی و شـاە پاشـگەزبووە وە بـەو مەهانـەی کـەئێران و شۆڕشــە ئیــسلامیەکەی پالّپــشتی شۆڕشــی کــورد دەکــات و پێــشێلی ئــەو رێککەوتننامەی کردووە و دواتر کۆمەلّێك کاری تیرۆری لەنێوان ئـەم دوو دەولّەتـەدا دەسـتی پـیٚ کـرد و ئـەوە بـوو لـە ٢٢ی مـانگی سـێپتەمبەر ی سـالّی ١٩٨٠ شـەڕ هەلّگیرسا و لەسەرانسـەری سـنووری عێـراق – ئێـران کێـشەو شـەڕ و تـۆپ بـارانی دێهات و شارە سنووریەکان ، بەفرۆکە بۆردومان کردنی شارەکانی عێراق و ئێرانیش

بەهەمان شێوە، لەم گێژاوەدا بوو کە شۆڕشی کورد کەوتە چالاکی و جموجوڵ و پێکدادان بۆیە ڕژێم دەستی دایە ڕاگوێزانی زۆرەملێ و چۆڵکردنی زۆرلەو دێهاتانەی سەر سنور و کردنەوەی ئۆردوگا بەپێی بەرنامەیەکی دڕاێژراو دەستی دایە کارکردن.. دوای شکانی ڕژێمی عێراقی و ڕاکردنی لەو جێگایانەی کە گرتبوونی بۆیە ئێرانیش دەستی دایە هێرش کردن و لە ساڵی ١٩٨٣ هاتە ناوچەی حاجی ئۆمەران و پێنجوێن و بەرزاییەکانی قەلادزێ ، بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم کارە ڕژێم دەستی دایە هێرش کردن بۆ سەر پارتی دیموکراتی کوردستان و بەتایبەت خێزانی بارزانیەکان کە ئەوکات زۆربەیان وەك دەست بەسەر لە ئۆردوگای قوشتەپە و بەحرکە دابوون لەنزیك شاری هەولێر ، بە شاحینە ڕەوانەی بەغدای کردن و دواتر هەموویان ئەنفال کران و بێ سەروشوێن بوون ، لەم دواییانەدا کە ڕژێم بەکۆتاهات چەند تەرمێك لەو ئەنفال کراوانە لە خوارو و ناوەڕستی عێراق لە گۆڕی بەکۆمەڵ دۆزرانەوە . پاشان لە ساڵی ١٩٨٣ دا دان و ستاندن لەنێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و ڕژێمی بەغدا دەستی پێ کرد لە ماوەی دووساڵ دان و ستاندن کە تارادەیەك دڵخۆشکەری بوو بۆ خەڵکی کورد و بەتایبەت لە شاری سلێمانی و بە ڕۆژ وبە شەو خەڵکی لەنێوان شەقامەکاندا خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕی بەشایی و گۆرانی ، دەزگاکانی ڕژێم وەك بەرنامەیەکی پلان بۆ دڕاێژراو کۆڵانەو کۆڵان وێنەیان دەگرت و دوای کۆتایی هاتن بەگفتوگۆکان و سەرنەگرتنیان و گەڕانەوەی یەکێتی بۆ چیاکانی کوردستان و دەست پێ کردنەوەی شەڕ ڕژێم دەستی دایە ڕەش بگیری لە نێوان هاوولاتیان بەپێ ئەو فلیمانەی لایان بوون لە هەمان ساڵدا نزیکەی ٥٠٠ منداڵی گرت کە تەمەنیان لە نێوان ١٠ ساڵ بۆ ١٤ ساڵ دەبوون و لە زیندانەکاندا گیانی زۆر لەو منداڵە بێ تاوانانە لەدەست چوو، دوو بارە بوونەوەی ئەم دیاردەیە هەر لەشاری سلێمانی لە تشرینی یەکەم (ئۆکتۆبەر) سەرەڕای دەست کردنەوە بە ڕاگوێزانی دێهات و چۆڵکردنیان و بەکارهێنانی گازە قەدەغەکراوە نێودەوڵەتیەکان وەك

(خەردەل و سیانید و گازی ئەعساب) و جۆرەهای دی لە دژی دانیشتوانی دێهاتە کورد نشینەکان و ئەوانەش کە بریندارەبوون و داوای چارەسەرکردنیان دەکرد لەبری چارەسەرکردن دەکوژران و لە ساڵی ١٩٨٧ لە مانگی حوزەیران زۆر لە دێهاتەکان کەوتنە ناوچە قەدەغەکراوەکان و وای لێهات کە ژمارەی ئەو دێهاتانە بگاتە ٥٠٠٠ هەزار دێهات.. ئەمە سەرەڕای ئەوەی ناوچە سەرسنووریەکان هەردەم لەژێر تۆپ و شەڕو گێژاوی ئەم هێرشانەی ئێران و عێراق دا دەژیان و لەوانە (ناوچەکانی پێنجوێن و حاجی ئۆمەران و........................ هەڵەبجە) کە شاری هەڵەبجە لەو ماوانەدا ڕۆژانە دەکەوتە بەر تۆپ باران و وایی لەدانیشتوانی کرد کە بۆ چەند جارێك ئەم شارە بەجێ بهێڵن و لە ساڵی ١٩٨٧ دوای ڕاپەڕینە جەماوەریەکەی ئەم شارە وەڵامی درندانەی ڕژێم وای کرد گەرەکێکی ئەم شارە بە ناوی (کانی عاشقان) بەشۆفڵ و گرێدەر کاول بکات و چەند لاوێك شەهید بوون و چەندین گیران و ئەم دۆخەش وای کرد زۆر لاو و خێزان ناچاربن وڵات بەجێ بهێڵن و ڕوو لەئێران و دوونیای ئاوارەی بکەن ، لێرەدا دەمەوێ لەم بابەتە لانەدەم و پێش ئەوەی ڕوو لەگۆڕانکاریەکانی تر بکەم... دەوڵەتی ئێرانی سەرەڕای ئەو خەڵکانەی دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول مابوونەوە و ڕەوانەی شارەکانی ئێران کرابوون و دوای گۆڕانکاری لە دەسەڵاتی ئێران و ڕوخانی شاە و بوونی ئێران بەکۆماری ئیسلامی و شەڕی لەگەڵ عێراق.. ئێران جۆرە ئازادیەکی بەکوردی عێراق و شۆڕشەکانی بەخشی و ڕێگای دا بۆ کاری سەربازی و سیاسی و لەسنوورەکانیەوە شەڕکردن لەگەڵ ڕژێمی عێراق و هێنانەوەی ئەو دورخراوانە لەشارەکانی ئێران بۆ ناوچە کوردیەکان و ڕێگادان بەکردنەوەی بارەگاو کارکردن ، بێ گومان لەو ماوەیەدا دەوڵەتی ئێران هەموو قورسای شەڕەکانی لەکوردستان کۆکردبووەوە ئەویش بە هۆی ئەوەی لەخوارو ناوەڕاست شکەستی دەهێنا بۆیە دەستی کرد بەهێرش لەناوچە کوردیەکانەوە... هەرچەندە لێرەدا مەبەستێك هەبوو لەو کارە..

هەردوو ڕژێم بەلایانەوە باش بوو چوونکە بەهەموو شێوازێك و لەهەموو قۆناغێك دا ناوچە کوردییەکان و دانیشتوانی زەرەرمەندبن و بەهەموو جۆرێکیش ئەو دوو لایەنە شەڕخوازە سوودمەند دەبن و ئەویش مەبەستی بنەڕەتی هەردوو لایان بوو...کەواتە ئەم دۆخە ئالۆزەی عێراق و بەتایبەت کوردستان و هۆکارەکانی شەڕی عێراق _ ئێران و زوڵم زۆری ڕژێمی عێراقی بەرامبەر گەلی کورد و ناچارکردنی ئەو خەڵکە بۆ ڕاکردن و هەوڵدان بۆ خۆرزگار کردن لە لێشاوی مەرگ و مەرگەساتەکان ، چونکە مرۆڤ هەمیشە بەدوای جێگایەك دا دەگەڕێ کە بتوانێ کەمێك بەئاسوودەیی و بێ ترس بژی ، هەرچەندە ئەوکات بەو ڕادەیە روکردن لە ئەوروپا و ئەمریکا و وولاتانی دی بەو شێوەیەنەبوو، چونکە گیانی کوردایەتی و شۆڕش دژی زوڵم و زۆر و بەرەنگاربوونەوە هەبوو، بۆیە ڕووکردن لە ئێران و چەك هەلگرتن بەو هیوایە سەرەنجام بگەنە ئاوات و وولات ئازاد بکرێت.

باسمان لە ئاوارەکان کرد کە ساڵی ١٩٨٧ لە هەڵەبجە بە هۆی بەرپابوونی ڕاپەڕینی جەماوەری ئەو خەلکە بەرێژەیەکی زۆر ڕوویان لە ئێران کرد کە دەوڵەتی ئیران ئامادەکاری بۆ ئەم لێشاوە کۆچە نەبوو بۆیە خەڵکە کەیان بە کۆمەڵ خستە ناو چەند قوتابخانەیەك لە شاری مەریوان تا دوای مانگێك چەند ئۆردوگایەك دروست کراو خەڵکەکەیان بۆ گواستنەوە و دواتریش مەرگەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە دەستی پێ کرد و ئەو خەڵکە بەناچاری ئاوارەی ئێران بوو ، ژیانی ئەو خەڵکە لەوپەڕی ناخۆشیدا بوو، بۆیە دەوڵەتی ئێرانی دەستی کرد بەدروست کردنی چەند ئۆردوگایەك لەوانە لە پارێزگای کوردستان و کرمانشا (سەراوی سەقز و دزلی و بارام ئاوا و هەزار خانی و شوێشە و کامیاران و وەرمەهەنگ و سەریاس و روانسەر و جوانرۆ و سولاسی باوەجان و کەنگاوەرو سونقرو هەرسین...هتد) جگە لەم ئۆردوگایانە خەلکی لەشارە سەرسنوورییەکان نیشتە جێ بوون ئەمانەو ئەوانەشی لە ئۆردوگاکاندا بوون بەشێك لە ئۆستانەکان و فەرمانداریەکان سەرپەرشتیان

دەکـردن . ئەوانـەی پـێش سـالّی ١٩٨٧ چـووبوونە ئێـران ئـەوا لـە گونـدو شـارو شارۆچکەکاندا نیشتەجێ بوون . کارتی پەناهیندەی کارتێکی کاتی بـەکارتی سـەوز ناسرابوو دەیان توانی کـاری خۆیـان ئـەنجام بدەن بـەلاّم لەسـالّی ١٩٨٧ کـە کۆچ بـەرەو زیـاد بـوون چـوو بەتایبـەت دوای کیمیابـارانی هەڵەبجـە کۆچبەریان لـەو ئۆردوگایانەدا دانا و کارتێکی پێناسەیان بەناوی (کارتی سپی) بۆدروسـت کردبـوون کەتـەنها بـۆ ئامـارو نـاوی سـەرۆك خێـزان و خێزانەکـە دیـاری بکـات و تـەنها لـەناو ئۆردوگاکان کاری پێ دەکرا ، بۆ هاتووچۆی شارەکان دەبوو وەرەقەی تایبـەتی لـە فەرمانداری یان لە ئۆردوگاکاندا دروست بکرێت.

هەروەها لەهەمان سالّدا ڕژێمـی عێراقـی دوای ڕێککـەوتنی لەگـەلّ ئێـران و ڕاگـرتنی شەڕ لەنێوانیاندا دوای چەند هەفتەیەك ڕژێم هێرشی کردە سەر ناوچـەکانی بادینـان و ئەو جێگایانەی کە لەژێردەسەلاّتی پارتی دیموکراتی کوردستان دابوون ، ئـەوەش بووە هۆی ئەوەی زیاتر لە (سێ هەزار) هاووڵاتی ببنە پەنابەر و ڕوولە تورکیا بکـەن لە ڕێگایی (مزیق) بازی و دواتر ژمارەی پـەنابەران گەیشتە (شەست هەزار) کەس بۆ تورکیا و (سەد هەزار) کەسی تر بەرەو ئێران کۆچیان کرد.. کە سالّی پێشتر زیـاتر لە(سەد هەزار) ی دی ڕوویان لەتورکیا نابوو، لە سەرەتا دا ڕێگای چوونە ناوەوەیان نەدا و دوای بیرکردنەوەیکی زۆر بڕیاری ئەوە درا ئەو ئاوارانەوەرگرن .

لیرەدا دەمەوێ سەرنجتان بۆ بەسەرهاتێکی نامۆ کـە ڕەنگـە لای زۆربـەمان ناسـراو نەبێ و تەنانەت نەشمان بیستبێ یان هەروا بەسادەی بەرگوێمان کەوتبێ رادەکێشم ، چوونکە ئەوانەی باسمان کردن هەریەك لەئێمە بەچاوی خۆمان دیوومانـە و تێیـدا ژیاوین یان نـەبێ کـەس کارمـان و دۆسـت ناسـیاومان بۆیـان گێڕاوینەتـەوە ، بـەلاّم کۆچێك بۆ دونیایەکی سەیرو نامۆ بۆ دونیایەك کە ژیانی ئەوان بەدیان جـاری ژیـانی ئەو کاتە خراپانەی ئێمە خراپ تربوون بەلاّم کاروانی ئاوارەی سەری هەلگرت و وێلّ بوون لەم ژیانە ڕەنگە بە زۆر کەلێن و دەروازەی سەیرماندا ببات وەك چۆن زۆر لـەو

ئاوارانەی کە لەو سەردەمانەی شەڕی ئێران _ عێراق دا ڕویان لەئێران نابوو کە ئێرانیش بەخۆی لەبارودۆخێکی سەخت و دژواردا تێدەپەڕی کەواتە ژیانی ئاوارەکانیش ئەو باشە نەبوو.

هەندێك لەو ئاوارانە زۆر هەوڵیان دا بەشێوەی ڕەسمی لە ئێران دەرچن بەلام ئەم کارە بێ هوودەبوو بۆیە هەندێ خێزان هەوڵی ئەوەیان دا لەڕێگای پاکستانەوە هەوڵی دەرچوون بدەن چوونکە ئەوکات وابوو دەچوویتە پاکستان و لە ڕێگای نەتەوەیەکگرتووە کانەوە خۆت ناونووس دەکرد و دوای پرسیارکردن و لێکۆڵینەوە لە دلواکاریەکەت بڕیاری ئەوە دەدرا بۆ ڕەوانەکردنت بۆ وولاتێك ، هەبوون لەو خێزانانەی ئەم ڕێگەیان تاقی کردەوە و دوای پەیوەندی کردن بەیەکێك لەو خێزانانە و پرسیار کردن لە چۆنیەتی ئەم تاقی کردنەوەیان لەژیاندا بەم شێوەیە هاتنە ئاخاوتن و منیش حەزدەکەم بەهەمان شێوەی خۆیان دەقاو دەق بینووسمەوە کە بەم شێوەیە دەست پێ دەکەن.....

(ئێمە لە ئۆردوگای ئێران بووین لە کەنگاوەر کە ئەکەوێتە بەینی هەمەدان و کرماشان لە ١٩٨٩/٥/١٠ ئۆردوگامان بەجێ هێشت بەرەو پاکستان ، حکومەتی ئێران یارمەتی داین و لێرە پاسیان داینێ و ئێمەش پاسپۆرتی تەزویرمان کری بوو لە(کوچەی عەرەب) لە تاران و فیزەی پاکستانیان بۆ لێداین نزیکەی ٨٥ هەزار تومەنی تێ چوو ، لە ١٤ی مانگ هاتینە سنووری ئێران _ پاکستان چووینە ناو قونسولگەری پاکستان ، (جعفر خان) بەرپرسی بەشی پاکستان بوو ١٠ هەزار تووەمنی لێ سەندین و ووتی ئەزانم بەتەزویر هاتوون. بەهەرحاڵ ١٥ ی مانگ گەیشتینە بلوجستان کە یەکێکە لە ویلایەتەکانی پاکستان لە شاری (کوێتە) رویشتین بۆ بارەگای نەتەوەیەکگرتووەکان زۆر بەساردی مامەڵەیان لەگەڵ کردین ، من ئەو وەختە ئاساری کیمیاوی بەپشتم و سکمەوە مابوو لەوەختی موقابەلە

کردنما لەگەڵ یەکێك لە مەسئولی نەتەوەیەکگرتووەکاندا کەناوی مستەر lie ی بوو ووتم ئەوەتا من ئاساری کیمیاوی بە لەشمەوە ماوە ، تورەبوو ووتی کێ باسی کیمیاوی لێ پرسیووی.

لە مانگی ٥ی ١٩٨٩ تا مانگی ٥ی ١٩٩٠ زیاد لە هەزار کەس هاتە پاکستان بۆ بارەگای نەتەوەیەکگرتووەکان پێش ئەوەش لە ساڵی ١٩٨٦ وە خەڵك هاتبوو بەڵام بەئێمەیان ووت ئەوەی لە ١/٥/١٩٨٩ هاتووە تە بارەگای نەتەوەیەکگرتووەکان لە پاکستان سەفەری بۆنیە، ئێمەش کۆمیتەمان دروست کرد و بڕیارماندا ڕێپێوان بکەین (لەفکرم چوو ئەوەبڵێم هەندێ کەس لەئێرانەوە لەگەڵ قاچاخچی ئەهاتن کە ئەهاتنە پاکستان لە سنوورەکان ڕووت ئەکرانەوە یان لێیان ئەدراو ئەیان کوشتن، ( شەهید یوسف ناسراو بە یوسفە لچە کە وەختی خۆی یەکێك بوو لەوانە ناوبراو لە پێشمەرگەکانی کوردستان بوو لە سنووری بەشی پاکستان قاچاخچی کوشتیان و ژن و منداڵەکەی هەرچی پارەیان پێ بوو لێیان سەندبوون و وابزانم مانگی شەشی هەمان ساڵ بوو لە کوێتە ناشتمان و ژن و منداڵەکانی لەسجن بوون دوای ماوەیەك بەربوون).

بەڵام کە ئێرانیەکان ئەهاتنە بارەگای نەتەوەیەکگرتووەکان یەکسەر وەرئەگیران و سەفەریان ئەکرد، لە بارەگای نەتەوەیە کگرتووەکان بەچاوی دوژمن سەیری ئێمەیان ئەکرد لەمانگی ١٢ی ١٩٩٠ کەمپمان هەڵدا لەبەردەم بارەگای نەتەوەیەکگرتووەکان و پۆلیس گرتینی و دوای شەش ڕۆژ بەربووین ، لە مانگی ٩ی ١٩٩١ ڕێپێوانێکی ترمان سازدا پۆلیس دوای لێدانێکی زۆر گرتینی پەنجا ڕۆژ لە سجن دابووین و دورخراینەوە بۆ شارێکی دوور ناوی شاری (ماچ) بوو لە ساڵی ١٩٩٣ بڕیارمان دا شاری کوێتە جێ بهێڵین و روبکەینە ئیسلام ئابادی پایتەختی پاکستان هەموومان هاتین کەمپی نایلۆنی دروست کراومان لەبەردەم بارەگای

نەتەوەیە کگرتووەکان هەڵدا و دوای ۱۸ ڕۆژ نزیکەی چوار هەزار پۆلیس شەو دای بەسەرماندا و کەمپەکەیان روخاند، ئەمەش لەزستاندا بوو هەموو ئەو خەڵکە گیراو بیست ڕۆژ لە سجن دابوون ، دوای بیست ڕۆژ ەکە بەرێککەوتن لەگەل پۆلیس و نەتەوەیەکگرتووەکان هەموو ئەوانەی گیرابوون ٤٠٠ نەفەربوون بردیانن بۆ وێزگەی شەمەندەفەر بەرەو کوێتە (من ئەو وەختە لەسجن نەبووم لەبەر نەخۆشی) لە ڕێگا ئەوانەی ڕەوانەیان کردبوون دەستیان لە پۆلیسەکان کردبووەوە و دەرگای قتاریان شکاندبوو و بەرەو ئیسلام ئاباد گەڕانەوە و ئەو ماوەی تاگەیشتنەوە ئیسلام ئاباد تووشی ئەزیەت و برسێتی زۆربوو بوون بەڵام حکومەتی پاکستان لە جەریدەکانیا نووسیبووی کە کوردە عێراقیەکان ئەیانەوێت (مونشەئاتی نەوەوی) پاکستان ئاشکرابکەن ، ئەم تۆمەتەیان بۆ دروست کردین . دوای ئەوە لە ساڵی ۱۹۹٤دا دەکەس مانیان گرت لە خواردن بۆ ماوەی ۲۹ ڕۆژ داواکاریمان ئەوەبوو کە بەشێوەی ڕەسمی لە شاری کوێتەوە بۆ ئیسلام ئاباد بمان گوێزنەوە لەو ۲۹ ڕۆژەدا بە فێڵی کارمەندانی نەتەوەیەکگرتووەکان شکستمان خوارد بۆ جاری دووهەم لە ساڵی ۱۹۹٥ چوار کەس مانیان گرت وەیەکێك لەوانە ناوی عبدالامیر بوو دوای ٥۳ ڕۆژ کۆچی دوایی کرد. نەتەوەیە کگرتووەکان ۹ مانگ یارمەتی لێ برین لە ساڵی ۱۹۹٦ حەت کەسی تر مانیان گرت بۆ ماوەی ٤۷ ڕۆژ دوای ئەوە نەتەوە یەکگرتووەکان موافەقەتی نقڵی بۆ کردین بۆ ئیسلام ئابادی پایتەخت ، لەساڵی ۱۹۹۷ لە لایەن بارەگای نەتەوەیەکگرتووەکان وە ووردە ووردە سەفەریان پێ کردین بۆ ئوستورالیا و نیوزلاندا و ئەمریکا و هەندێك بۆ سوید و فلاندا ، من لە ۱۹۹۹/٦/۱۷دا گەیشتمە ئەمریکا شاری دالاس وولایەتی تکساس کە ئەو وولایەتە کوردی زۆری لێیە بەڵام کەس لەکەس ناپرسێتەوە ، ئەو ماوەی لە تەکساس بووین کەس نەهات بۆلام و ئێستەش لە کالیفۆرنیام یەك کوردم نەدیووە بێ جگە لەو خزمانەی خۆمان و ئەو هاورێیانەی لە پاکستان پێکەوە بووین.. شتێکی زۆر گرنگ

سەرنجی راکێشام لە چەند ساڵەی ژیانم لە پاکستان دەربارەی کورد لەو وولاتە..
دوای گەیشتنم بۆ پاکستان یەکێك هات بۆلامان پاکستانی بوو ووتی ئێمە کوردین لێرە ٨٥٠ ساڵ پێش ئێستە هاتووین بۆ پاکستان لە عێراقەوە لە ناوچەی کەرکوك و خانەقین ئەمانە تووشی شەڕو ئاژاوە بوون و کۆچیان کردووە بۆ بلوجستان و پاکستان ، ئەمانە وەك خۆیان ئەڵێن ١٥٠ تا ٢٠٠ هەزار کورد ئەبن لە شاری کوێتە و دەشتی بۆلان دائەنیشن ئەمانە دەسەلاتی تەواویان هەیە لەو ناوچەیە سەرۆکیان هەیەو ناوی (سەردار دینار خان) ە و کورەکانی ئەم پیاوە (عبدالرحمان و محەمەد علی و لیاقت و ئیبراهیم و محمودخان و ساحیب دینار خان) کورەکانی زۆر شانازی بەوەوە ئەکەن کەکوردن و لەماڵی خۆیان دا و لەناو خۆیاندا بەزمانی رەسەنی خۆیان قسە ئەکەن کەزمانی کوردی (براوی) یان (براخوی) کە شەرەفخان لە کتێبەکەیدا باسیان ئەکات...
ئەمانەو لەو ناوچەیەدا وەك حکومەت وان و دەسەلاتی تەواویان لە ناوچەی بلوجستان هەیە هەریەکە لە پێش دەرگای خۆی ناوی خۆی نوسیووە بە فلان کەسی کوردی بەلام لەمانە تەنها نیوەیان ئەزانن کەکوردن و دوای ئەوەی ئێمە قسەمان لەگەڵ ئەکردن ووردەووردە ئەوانیش خۆیان دەرئەخست کە کوردن..
هەروەها لەوێش زانیاری ئەوەمان وەرگرت کە لەهندستانیش کورد هەن و ژمارەیان ٨٠ هەزار کەس ئەبن بەلام وەك ئەوانەی پاکستان دەسەلاتیان نیە.. ئەو کوردانەی دەهاتنە پاکستان و ئەگەر لە بارەگای نەتەوەیەکگرتووەکان وەرنەگیرانایە و لەترسی ئەوەی حکومەتی پاکستان نەیگرتنایە ئەوە هانای دەبردە ماڵی سەردارخان و لەوێ حکومەتی پاکستان نەی دەتوانی دەستیان بۆ بەرێ و لەوێ پارێزراو دەبوون ، سەردار خان (مەلامستەفای بارزانی) خۆش دەویست وهەندێ وێنەی لابوو (ڕۆژێك چووم گۆشت بکرم لە قەساب خانەیەك سەیرم کرد رەسمی بارزانی ئەمری هەڵواسیوە ووتم ئەمە کێیە.. قەسابەکە ووتی.. ئەمە قائیدێکی

گەورەی بلوجی یە. منیش ووتم ئەمە کوردە و سەرۆکی ئێمەیە و ئێمەکوردین باسی کوردم بۆکرد ، ووتی کەواتە ئێمەو ئێوە فەرقمان نیـە هەریـەك نەتـەوەین . ئەمانـە کەمێك بێ ئاگابوون لەکوردستان جگە لە خوێندەوارەکانیان ) .

ئەوەی لێرەدا باسمان کردوو لێوەی دواین بەشێوەیەکی گشتی و کورت بوو لەباروو گـوزەرانی ژیـان و پێـشهاتەکان کـە بـۆ کەسـایەتی کـورد هاتوونەتـە پـێش و ئـەم کەسایەتییە چۆن رەفتارو هەڵسووکەوتی لەگـەڵ ئـەم دۆخانـەدا کـردووە ، کەواتـە لاوی کورد و رۆشنبیرو خەباتگێری کـورد زۆر دەمێکـە ئـەو ئـازادی و سـەربەسـتی و ژیانە پر لە ئاسوودەییەیی نەدیووە و هەمیشە بارو دۆخی ژیان بەرەو خراپ و بـاری دەرونی هـاوولاتی کـورد تـەنگاو تـرو شـێواوتربووە و گوزەرانیـشی رووی لـەخراپی ناوە.

کەواتـــە لەئـــەنجامی کـــارتێکردنی ئـــەو هـــەموو گۆڕانکـــاری و قۆناغـــە سەقامگیرنەبووەکانی کورد وای کردووە هەموو بیرو راو بۆچونێك بـۆ رزگـاربوون لـە پێشبینیەوە بێنێتە ئاراوە هەرچـەندە تائـەم قۆناغـەش هیـوا و ئـاوات و حـەزەکان هەرماون و هێشتاش هەستی کوردایەتی و گیانی بەردەوام بوون و مانەوەو خـەبات و تێکۆشان و قوربانی دان لەگیانی کەسایەتی کوردا هەرماوە سەرەڕای هەموو ئـەو کۆسپ و تەگەرانەش .

بـەڵام ئەمـەش هەرکەمـە و بـەردەوام بـوونی زۆر ناکێـشێ چـونکە خـەریك بـوون و پابەندبوون بە شۆڕش و خەبات و نەتەوەپەرستی ئاکامی خۆی هەیە... واتە کاتێـك نەتەوەیەك بەئاکامی خەباتی بگات و ئازادی سەقامگیربێت و هەست نـەکات ژیـانی گۆڕاوە و بەرەو باش بوون ناچێ ئەوە بێگومان بیر لـەو گۆڕانکاریـەش دەکاتـەوە و ئەو هەست و بیرو بۆچوونە سـست و لاواز دەبێـت و دەبێتـە بنەمایـەك بـۆ دووبـارە سەرهەڵدانەوە..

# قۆناغی دوایی ڕاپەڕین

دیموکراتیەت و ژیان لە سێبەری ئازادی و سەربەستیدا تام و چێژێکی هێندە خۆش و سۆزێکی هێندە گەورە و بەهێز بەمرۆڤ دەبەخشێ تارادەیەك هەموو ناخۆشی و نەهامەتیەکانی ژیان لەبیرو خواستی ئەو کە سایەتیە تینوە بەو ئازادیە لەبیردەباتەوە . کەسایەتی کورد لەمێژە تینوی ئەو قوومە ئاوەی ئازادی و ژیانی سەربەستیە بوو ، هەربۆیە لە بەهاری ساڵی ١٩٩١ دا ئەو هیواو ئاواتە دێرینەی کورد هاتەدی و کوردستان بەهێزو بازووی رۆڵەکانی و جەماوەری چاونەترس و بەجەرگەوە ئازادبوو ئەو رۆژانە گیانی بەختەوەری و گیانی قوربانی دان وبەر خۆدانە بەرگولەی دوژمن گری دەداو جەستەی دوژمنانی دەسووتاند.
ئافرەتانی کورد لاوانی کورد منداڵان و پیرو پەککەوتە لەسەر کۆڵان و سەرشەقامەکان هێرشیان دەکرد ، کوردستان ئازاد و سەربەست بوو ، لایەنەکان و هێزی خەباتگێرو شۆرشگێری کورد بەجلوبەرگی شەرەف و کەرامەتەوە گەڕانەوە کوردستان و گیانی شەهیدان بۆ هەمیشە حەوایەوە .
کەواتە ژیانی دیموکراتیەت و دەسەڵات بەڕێوەبردن لەلایەن کورد و خودی شۆڕشەوە واتای ژیان و بەرهەمی رەنجی خەبات و قوربانی دان دەدات...
لەسەردەمی خۆیدا سیستەمی دەوڵەت بە (سیستەمی دیموکراتی) ناودەبرا و لەو دوو قۆناغەدا بەرچاوو دەکەوت...
قۆناغی یەکەم.. لەو وولاتە بچوکە کۆنەکانی یۆنان دا بوو لەنزیکەی ساڵی ٥٠٠ پ.ز.
قۆناغی دووەم.. لەگەڵ دەرکەوتنی شۆڕشی فەرەنسا ١٧٨٩ پ.ز کەواتە کورد و خەبات گێران و جەماوەری ستەمدیدەو لاوان و رۆشنبیران بەو ئاواتەوە بوون رۆژێك لە سێبەری دیموکراتیەت و سەربەستی و ئازادی دابحەوێنەوە ، هەرچەندە

دۆخەکان ئارام و سەقامگیرنەبوون و شەڕو پێکدادان لە گەڵ ڕژێم هەر بەردەوام بوو. بە تایبەت لەشاری کەرکوك. کە هەواڵی تەواو دەدرا بۆ ئازاد کردنی و ئازادیش بوو، بەڵام ڕژێم ڕێگای نەدەدا ئەو ئازادیە تاسەربێت و لەلایەن هێزەزلهێزەکانەوە بۆجارێکی دی کارتی سەوز دەدرایەوە ڕژێم و دووبارە هەوری رەش و گڵاوی خۆی بەرەو کوردستان هێنایەوە و ئەم جارەیان نەتەنها پێشمەرگە و لایەنەکان و سیاسەتمەداران و دڵسۆزان ئاوارەبوون بەڵکو هەموو جەماوەری کورد بەتێکڕا ئاوارەبوون و کەوتنە ڕێگا بەرەوچیاکانی کوردستان ئەمەش دەرسێك بوو بۆدوژمنانی کورد کە ئەم جارەیان کورد یەك دەستە و دروشمی مان یان نەمانی هەڵگرتووە...

سەرەتا لە لایەنەکانەوە دەستی پێ کرد واتە هێزی پێشمەرگە شکاو بەرەو دواوە گەڕانەوە و ڕویان کردەوە چیاکان . لەو سەردەمانە فەرمانڕەوایەتی بەرەی کوردستانی بوو ، هەرچەندە فەرمانڕەوایەتی میلیشیات بوو واتە چەکداری و کاری سەربازی و کۆکردنەوەی هێز یەکێك لە ئامانجەسەرەکییە بنەڕەتیەکانی لایەنەکان بوو بۆ ئەوەی بتوانن هێزو دەسەلات و فەرمانڕەوایەتی خۆیان بچەسپێنن . کەواتە دەتوانین بڵێین ئەو ئازادی و سەربەستیە فراوانەی کوردستان وەك خەونێکی باوەڕپێ نەکراو بوو چونکە هەرگیز کەس لەو بڕوایەدا نەبوو ئەو بارودۆخە بێتەئاراوە و بەوشێوەیەش ئامادەکاری بۆ بەڕێوەبردن وکارکردن و بەرنامەدانان نەبوو لە دۆخێکی واناسك و ساوادا نەدەبوو هەرلایەك بەو خێرایە بکەوێتە کاری سیاسی و هەوڵدان بۆ فراوانکردن و پەرەپێدانی لایەنەکەی خۆی و ڕاکێشانی جەماوەری زیاتر بەهەر شێوەیەك بێت و بیر لەوخەڵکانەش نەدەکرایەوە کەچۆنن و کێن ؟؟ ئەگەر لایەك بیویستایە کەسێك بگرێت و سزای بدات ئەوە ئەوی تر باوەشی بۆ دەکردەوە و دەی کردە بەرپرس و پارەی دەدایە و حساباتی لەوانەی ماندوهیلاك بوو وخەباتگێری شاخ و پێشمەرگایەتی و دەربەدەری زۆر زیاتربوو.

هەرچەندە ئەو ماوە کەمە مەودای بەجەماوەری ڕۆشنبیری کورد نەدا لەباری ژیان و هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو دۆخەدا قسە بکەن ، چونکە هەستی نەتەوایەتی و کوردایەتی بەسەر هەموو کۆسپەکاندا زاڵ بوون و مەودای ئەوەیان نەدا بیرو بیرۆکەی مرۆیی و نەتەوەیی و پەروەردەی و کارەخزمەت گوزاریەکان بگرێتەوە ، ڕەنگە ئەم ڕێگەنەدان و چەواشەکردنە دەگەڕایەوە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی تایبەتی لایەنکاری و خزمایەتی لە چوارچێوەیەکی تەسکەوە ، کەواتە ئەو ژیان و بەرەنگاربوونەوەیە گۆڕانکاری ئەو تۆی هێنایە ئاراوە ئەمەش سیستەم و بەرنامەیەکی داڕێژراوی نێونەتەوییە کە چەندەها ساڵە لەسەر ناوچەکەو دانیشتوانی پەیڕەوی دەکرێت.. خۆئەگەر کەمێك بەوردی لە ناوەڕۆك و ڕاستی سەرجەم بابەتەکان وردبینەوە دەبینین ڕاو هەڵوێست و ڕفتار بەرامبەر بە گەل و میللەت چۆنە....؟؟؟؟

کاتێك کورد دەستی دایە شۆڕش و خەبات کردن و بڕیاری کۆشش و قوربانی دا لەچوار چێوەی یەك بیرو سیاسەت و ڕێڕەودا و سەرتاپای کوردستان بووە گۆڕەپانی جەنگ و خەبات و قوربانی دان.. کەواتە لێرەدا هیوایەك لەدایك بوو..؟؟؟؟ پاشەڕۆژێك بەرجەستەی خۆی نیشان دا. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند لەسەرەتای بەرقەرار بوونی ئەم شۆڕشەدابوو کە دووبەرەکی و جودای لەنێو کورد سەری هەڵدا و گیانی شەڕەنگێزی وشەڕی براکوژی و کورد کرایە دووپارچە کەئەم ڕەنگ دانەوەیەش لەنێو خەڵکی دا بەبێ ئەوەی لەڕاستی و دروستی ئەو ڕووداوانەش گەیشتبێ گەورەترین ڕکەبەرایەتی و خیانەتکاری دەنوێن دژی بەرامبەرەکەی.. لەبابەتەکانی دوایماندا بە درێژی لەسەر ئەم بارودۆخە دژوارە دەدوێن کە ئەمرۆ لە ئەورووپا دا لەنێوان خێزانە کوردەکاندا زۆر بە ئاشکرا ڕەنگی داوەتەوە ، ئەگەر بێینە سەر ئەم دیاردە ووردانەو باسکردنیان ، لەسەرەتای ڕاپەڕین وئەو جۆش خرۆشەی جەماوەری کورد و دواتر ڕووکردنە هەڵبژاردن و

دانانی حکومەتێکی کوردی و دەرچوون لەو گەمارۆی ڕژێمی بەعسی بەغدا کە دەزگا ئیداریەکانی خۆی لە ١٩٩١/١٠/٢٦دا لە کوردستان کێشایەوە ، ئەمەش دوای بەئەنجام نەگەیشتنی ووتوویژەکانی بەرەی کوردستانی و ڕژێمی عێراقی بوو... ئەم بڕیارە لەوەوە سەری هەڵدا کە کورد ناتوانێ کاروباری خۆی بەڕێوەبەرێت.. ئەوەبوو لە ١٩٩٢/٠٥/١٩دا پرۆسەی هەڵبژاردن دەستی پێ کرد ، ڕەنگە پێش گەڕانەوەی جەماوەری کورد دوای کۆڕەوەکە بۆ کوردستان ئەوە بوو دوای چەند مانگێك دووبارە ڕاپەڕینی دووەم دەستی پێکردەوە و ئەم جارەیان ڕژێم بەسانایی تر دەرچوو ، هەرچەندە پێش ئەمە ژیانی ئەو خەڵکە لەو ئاوارە یەدا گەلێك دژوارو خراپ بوو چەندین ڕۆژ لەلایەن دەزگاکانی پاسداران و میتی تورکیەوە ڕێگانەدەدرا ئەو خەڵکە ماندوە ئاودیوو بێت و لەهەندێ جێگاوە ڕێگای ئەوەیان نەدەدا بە ئاسانیش خۆراکیان بۆ بچێت زۆر لەودیمەنە دڵ تەزێنانە کاریگەربوون و ڕای گشتی دوونیای هەژاند و خەڵکی هەر خۆڕاگربوون سەرەرای زۆر قوربانی و لەدەست دانی گیان و سامان ، ئەو جەماوەرە هەربەبڕواوە دەگەڕا چارەیەك بۆ کێشەکەی بدۆزرێتەوە . هەربۆیە ڕێگای چیاو خەباتی گرتەبەر.. کەواتە ئەمجارەیان تەنها هێزی پێشمەرگەنەبوو بەڵکوو هەموو جەماوەربوو.

لە سنووری تورکیا کێشەی زۆر پێش هات بۆ ئەو ئاوارانەی کەوتنە دیووی تورکیا و لە ئۆردوگاکاندا وەك زیندانێك ڕێگای دەرچوونیان نەبوو بەشێوەیەکی ناشیرین ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرا و زۆر خەڵکیان زیندانی دەکرد و تۆمەتی جۆراوجۆریان دەخرایە پاڵ هەرچەندە هەمیشە تورکیا دەرگایەکی باش و ئاسان بووە بۆ ڕێگای قاچاخچیەتی ، چونکە باندی مافیا کارەکانیان بە پارەمەیسەر دەبوو کەواتە بەهۆی ئەم ڕێگایەوە زۆر لەو خێزانانە ڕوویان کردە یۆنان و لەوێ نیشتەجێ بوون و لەوانەش هەن تائێستا ماونەتەوەو کێشەی پەنابەریان هەیە لەو وڵاتە و ناشتوانن دەربازبن لەوانەش هەن ئێستا خاوەنی پاسپۆرتن و و ژیانیان باشە . ئەوانەی

دیووی ئێرانیش بەهەمان شێوە کێشەو گرفتیان هەبوو بەڵام لەبەر ئەوەی ئێران زیاتر خاوەن ئەزمون بوو لەم کارەدا و ئەو بۆچەندین جار خەڵکی ئەم سنورانە ڕوودەکەنە ئێران و لەئۆردوگاکاندا دەژین و ڕەفتار بەشێوەیەکی دی بوو هەرچەندە ناتوانیت بڵێیت لە سەداسەد باش بوو بەڵام بەڕێژەیەك لە ڕفتاری تورك باشتربوون هاوکاری و خواردن و فریاگوزاری باش بوو لە لایەکی دی جەماوەری کوردستانی ئێران زۆر مەردانە هەڵمەتی هاوکاری و کۆکردنەوەی خۆراك لەسەرجەم شارەکانی کوردستانی ئێران بۆیان دەستی پێ کردبوو، توانیان ڕۆڵێکی دیارو بەرچاو بگێڕن ، لێرەش هەمان دەرگای دەربازبوون هەبوو بەڵام بەشێوەی تورکیا نەبوو، هەندێك لەوانە لە ئێرانەوە دەچوونە تورکیا وەك ئەم ساڵانەی دوایی، یان پاکستان کە باسمان لێوەکرد لە هەشتاکاندا و تا کۆتایی هەشتاکان بوو یان هەوڵ دەدرا بەشێوەی فەرمی لە ڕێگای چەند دامودەزگایەکی ڕۆشنبیری و کەلتوری و تایبەت بەباری پەنابەری کە ئەم هەنگاوانەش زۆر بەدەگمەن جێی خۆی دەگرت یان بەشێوەی قاچاخ و کاری سەفەری بۆدەکرا ئەوەش زۆر گران بوو دوای ئەوەش پارەیەکی زۆری دەویست و هەموو کەسێك نەیدەتوانی یان نەیان دەوێرا. چونکە لە ئێران گرتنی کەسێك بە کاری لەو جۆرەوە ئەوە بەربوونی زۆرگران دەبێت و سزاکانی زۆر توند دەبن .

هەرچەندە ئەوکات و دوای گەڕانەوەی بارودۆخەکان بۆ سەرڕێی ڕاستی خۆیان و سەقامگیربوونەوەی هێزی بەرەی کوردستانی و گەڕانەوەی هەموولایەك بۆ جێگاوڕێگای خۆی بەتێکڕای بیرو ڕاو بۆچوونەکان هەوڵی ئەوەیان دەدا ئەو ئەزموونە بپارێزن و پاشان جەماوەر بڕوای بەو لایەنانە هەبوو تامەزرۆی بینین و گفتوگۆو هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیان وەك خەونێك وابوو... پرۆسەی هەڵبژاردن و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان دوای دارمان و دووبارەسەرنەکەوتنی دانوو ستاندنەکانی لایەنەکان بووو لەگەڵ ڕژێمی پێشووی بەعس ، واپێ دەچوو

هەردوولا گەیشتنە ئەو بڕوایەی دەبێ هەریەکە بۆ خۆی و بێ دەنگ کاری خۆی بکات بۆیە بیرۆکەی دامەزراندنی حکومەتی هەرێم و پەرلەمان و پرۆسەی هەڵبژاردن هاتە ئاراوە لێرەدا هیواو متمانەیەك کەوتە دڵی جەماوەرەوە بەو شێوەیە گەشبینی و بڕوا بەخۆبوون هەموولایەکی گرتەوە.. هەبوون ئەوانەی پێش هەڵبژاردن دەرچوون و ڕوویان کردە هەندەران کە سەرەتا ڕێژەکە بەو شێوەیە نەبوو... هەرچەندە ئەوسەردەمە بەجۆرێك جەماوەری کوردستان تێگەیشتبوون کە بەدامەزراندنی پەرلەمان هەموو بارودۆخەکان دەگۆڕێن واتە لەخراپەوە بۆ باش ، برسیەتی و هەژاری و کەم دەرامەتی نامێنێ و ئاوەدانی و شارستانیەت دێتە ئاراوە چونکە ئێمەی کورد هەمیشە لەژێر زوڵم و زۆرو ستەم دا ژیاوین و دەبێ ئەم ئازادی و سەربەستی یەش بپارێزرێن و بزانین چۆن کارکانمان بکەین .

جەماوەری ڕاپەڕیوی کورد بەدڵسۆزی و جەربەزەیی خۆی و گیانی لەخۆبردووی دەستی دایە هەڵبژاردن و هەر لەسەرەتای هەڵبژاردن و دوای دەنگ دان خەریك بوو شەڕی براکوژی و گوللەی کورد کوژی بچێتەوە بەئاسماندا چونکە بڕوابوون بە دەرئەنجامی دەنگەکان بوو بووە کێشە...

لێرەدا هەڵوێستەیەك بەرامبەر ئەو ڕووداوانە، نیشانەیەك بەدیارکەوت کە هێشتا ئێمەی کورد ماومانە لەو جۆرە تاقیکردنەوانەدا سەرکەوتووبین هێشتا کاتی ئەوەنەهاتووە بە خۆمان هەموو دەرەنجامەکانمان پێ قبوول بکرێت ، ئەتوانم ئەوەش بڵێم ئەوە شانزە ساڵ تێپەڕیووە و چەند حکومەت گۆڕاوە و چەندین گۆڕانکاری هاتوونەتە ئاراوە بەڵام هەر ماویەتی و ئێستەش ئەو دەرەنجامە دیموکراتیانەمان پێ قبوڵ ناکرێت . بەڵام لەم کاتانەدا چار ناچاری وادەکات دەبێ ڕازی بن و هەرچۆن بووە هەوڵی پێکەوەژیان بدرێت ئەگەرنا ئەوە کارەسات وماڵکاولی بەرۆکمان دەگرێ ، کەواتە هەڵبژاردنەکان لە نێوان قبوڵ و قبوڵ نەکردنی و کێشمە کێشی ئەم ڕایانە دەرەنجام بەهیمەتی دڵسۆزان ٥٠ بە ٥٠ پەسەندکراو لەم

قۆناغەدا کە زۆر لەو گەنجانەی بەبیری تەسکی حزبایەتی گۆشکرابوون و ئەو دۆخە گرژو ئالۆزەیان دی و هەلوێستی هەموو لایەکیان هەلسەنگاند دووبارە ساردبوونەوە و بڕوایان لەئاست کێشەکان لەق بوو و بڕیاری دەرچوون و ڕوکردنە هاندەران هاتە ئاراوە . ئەم ئەزمونەش کەوتە بەر تاقیکردنەوە و دوای ئەوەی کەوتنە ڕێگایەکی بن بەست و هەموو گرفت و کێشە ئیداری و سیاسی و ئابوریەکان لە دامودەزگاکانی حکومەت کە لە گەورەترین کێشەوە تادەگاتە لاوەکی ترین کێشە هەموویان بن بەست بوون و ڕێگاچارەیان نەماو دەرگای شەڕوپێك دادان کرایەوە خۆئەگەر ئەودەرگایە لەلایەن کەسانی بەرژەوەند پەرست وە بووبێت بەلام لەلایەن سەرکردایەتیەکانیانەوە خواستیك بۆ ئەو مەسەلەیە هەبووە بەلام نەزانراوە چۆن و ئەوەش بووە هەل...

شەڕی ناوخۆ هەمیشە بە یەکێك لەو هۆکارانە دەبینرێن کە هانی گەنجانی کوردی دا بۆ سەفەرکردن و دوورکەوتنەوە لە دۆخە ئالۆزەکەی کورد ، ڕەنگە بەلای زۆر کەسەوە ئەم هەنگاوە بەڕاکردن و خۆدزینەوەلەڕاستیەکان پێناسە کرابێت بەلام کەی ئەوان توانیویانە خاوەنی بڕیاربن و ئەوەندە کاریگەریان لەسەر گۆڕانی دۆخەکان هەبوبێت ، جگە لەوەی کە دەبێ چەك لەشان بکەن و بەرەوبەرەکانی شەڕ و شەڕی کورد کوژی بکەن . ڕەنگە هەر بیروڕایەك بەکۆمەڵێك هۆکاری تایبەت بەخۆیەوە شەڕی کورد کوژی نەك بەتەنها لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو بەڵکو بزوتنەوەی ئیسلامی ئەوکات و پارتی شۆسیالیستی کوردستان کە هەردوو لایەنی (پارتی و یەکێتی) شەڕیان لەگەڵ کردوون و ئالۆزی زیاترو گرژی کێشەکان بەرەو توند تردەچوون ، دواتریش شەڕی گەورەیی هەردوو لایەنی گەورە لەمەیدان دا کە ئەمەیان کاریگەری سلبی گەورەترو بەرچاوتری هەبوو بەشێوەیەك کوردستان بووە دووپارچەو دروست بوونی دوودەسەلات و فەرمانڕەوایەتی ، دابڕانی خەلکی لەهەموو بەرژەوەندیەکان و ماڵ و

سامان و کەسووکاریان ئاوارەیەك لەهەولێر نەتوانێ سەردانی سلێمانی و شارەکەی خۆی بکات یان ئاوارەیەکی هەولێری بەهەمان شێوە لە سلێمانی.. ئەگەر چاومان بەژیانی ئاوارەکان بکەوتایە لەمالآن و بەسەر خەڵکیەوە یان لەشوقەی ڕوخاوی بێ دەرگاو پەنجەرەو کەلاوەدا ژیانیان بەسەردەبرد ، با کێشەو گرفتە کۆمەڵایەتیەکان و بێکاری و نەبوونی دەرامەتی ژیان بوەستن ، پاشان باری ئاڵۆزی دەرونی و بەهۆی بەردەوام بوونی شەڕەکان و کوژرانی کەسایەتی کورد لە هەموو ئاستەکاندا و بەفیڕۆ کاریگەری سلبی و دژواری هەبوو لەسەر بیرو هۆشی جەماوەری کورد... دوای هەوڵدانی دۆستان بۆ ڕاگرتنی ئەم شەڕە ، قۆناغی نەشەڕ نەئاشتی واتە (شەڕی سارد) کەئەمەیان کاریگەری خراپتری لە ڕووی دەروونی یەوە هەبوو لەکاتی شەڕدا دەزانرا کە شەڕە بەلآم لە قۆناغی نەشەڕ نەئاشتی چی بێت..؟؟؟ دروست بوونی ئاڵۆزی و زیادبوونی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەگەڵ خراپ بوونی دۆخەکان بە ئاڵۆسکاوتر ، باری دەرونی و بێ ئومێدی لای کەسایەتی کورد زیادی دەکرد و کۆڕەو ڕوکردنە هاندەرانیش بەرەو زیادبوون دەچوو بەشێوەیەك وەك کۆچێکی بەلێشاوی لێهاتبوو ، لەلایەکی ترەوە باس لەوە دەکرێت کەکاری ئاوەدانکردنەوەو پرۆژەی خزمەتگوزاری دروستکراون ، ڕاستە کار کراوە و دەکرێ بەلآم هێشتا ئەوانەی کەکراون کەمن و پێویستە زیاتر بکرێت و پاشانیش ئەوە منەتی تێدانیە و ئەرکی سەرشانیانە و دەبێ بە جوانی بەئەنجامی بگەیەنن ، چونکە جەماوەر متمانەی بەوان بەخشیووەو ئەوانیش دەبێ لەئاست ئەو متمانەیەدابن ، بەم پێ یە لای کورد کەسایەتێکی سادەوساکار تەنها ڕێگا چارەی ژیان و بەسەربردنی کاتی خۆی و دۆزینەوەی ئایندەو پاشەڕۆژی لەم ژیانەدا هەڵگرتنی چەك و ڕووکردنەبەرەکانی شەڕ یان کارکردن بوو لەدەزگا حزبیەکان یان لەسەر لیستی لایەنێك لە دامودەزگایەکی حکومی کاربکات و بەموچەیەکی زۆر کەم کەنەتوانێ تەنانەت سادەترین پێداویستیەکانی خۆی بەدەست بێنێ ، ئەمەش بەس نیە بۆ

گەنجێك لەوانەیە لەسەرەتایی ژیانی دا پێ ی ڕازی بێت و بەس بێت بەلایەوە بەلام زیاد بوونی ئارەزوو و هیواکان هەمیشە لەزیاد بووندان و لەگەڵ گەورەبوونی مێشك دا ئەوانیش گەورەدەبن . ئەگەر ولاتێك وەك سجنێکی داخراو یان ئاگردانێك كە بەبچوك ترین جووڵەو یاری کردن گر بگرێت ئەوە بێ ڕەحمانە دەبیتە قوربانی ئەو ئاگرەو پاشانیش کەس باست ناکات و زۆر بەخێرایش لەبیردەکرێت ، کەواتە بیرکردنەوە لە هەندەران و دەرباز بوون بەلای گەنجەوە کارێکی هەنووکەی باش بوو ئەگەر بۆ هەتاهەتایش نەبێ خۆ ئەوە بۆکاتێکی دیاری کراو تادۆخەکان هیوایەکیان پێوە دیار دەبێ ئەوکات ئەو گەنجانە بەبێ ئەوەی کەس پێیان بڵێ ئەوە بەخۆیان هەست بەوە دەکەن کەوائێستا کاتی گەرانەوە هەیە و ئەمڕۆ بەڕاستی ولات پێویستی بەوزەو توانایی ئەوان هەیە.. کەواتە بیرو بۆچوونەکانی گەنجی کورد لەم گێژەڵوکەیەدا دەسوڕێتەوە..

# هەنگاوەکانی کەسایەتی کورد بەرەو هەندەران

کاتێك باس لەرەو یا پەنابەری و سەفەر دەکەین هۆکارو تایبەت مەندی بۆ ڕوودانی ئەو رەوە هەیە ، چەند لایەنێکی سلبی و ئیجابی لەژێر پەردەی ڕاستیەکاندا خۆیان حەشارداوە ، ئەگەر ئەو لاپەڕانە هەڵدەینەوە ئەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە کاردانەوە کاریگەری ئاکام و پاشماوەکانی لە ئایندەو پاشەرۆژی ئەو کەسایەتی یە بەدیاردەکەون ، لێرەدا گرنگە ئەم خاڵانە پێش چاوبگرین کەبوونی کۆچ بۆچیە..؟ و لەپێناوی چی دایە..؟ کێن ئەوانەی کۆچ دەکەن.. ؟ دەبێ چۆن خۆیان بۆ ئەو کۆچە ئامادەبکەن..؟ ئەو ڕێگا و جێگاو کەسانەی دەبنە هۆی دەربازبوونیان کوێن و کێن..؟ یەکێك لەو خاڵە گرنگانەی کە دەبنە هۆی فرەبوونی کۆچ ، ژیانێکی ئازاد و والایە بۆ سەفەرو چوونە دەرەوە چونکە وولاتێك وەك زینداننێکی گەورە ئەو کەسایەتیە تووشی هیلاکی و ماندوو بوون نارەحەت و بێزار دەکات لەچوار چێوەی ئەو سنوورە دەستکردانەی کە وەك چوار دیواری زیندانەکان وایە . ئەمەش وادەکات کە چەندین ڕێگای دی بۆ دەرباز بوون و بینینی دونیا بگرێتە بەر ، ئەویش لەچەند هەنگاوێکدا خۆی دەبینێتەوە .

لەوولاتێکی وەك ئەو وولاتانەی ئێمەدا جۆری سەفەر کردن زۆر جیاوازی هەیە و ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی ئەو سیستەمە سیاسیەی کە پەیرەو دەکرێت و ئەو بۆچوونانەی کە هەن و لەمەسەلەکانی ژیان دەڕوانن و بەبڕوای ئەوان ئازادی و سەربەستی کارێکی باش نیە و کەسایەتی تەرە دەکات و دواتر گرتنەوەی مەحاڵە بەڵام نازانن بەو شێوەی ئێستا و فڕینی ئەو کەسایەتیە مانای ئەوەی گەڕانەوەی دەجار مەحاڵە ، ئەگەر بەراوردێکی بچوك بکەین لەم وولاتانەی ڕۆژ ئاوا کە مرۆڤ دەتوانێ بەویستی خۆی و هەرکات بیەوێ بۆ ئەو وولاتەی ویستویەتی دەتوانێ سەفەربکات و بەبێ گرفت دەگەڕێتەوە لەبەر هۆیەکی زۆر سادەش ئەویش ئەوەی

ئەو ژیانەی کە لێرە هەیەتی لەهیچ وولاتێکی تر دەستی ناکەوێت و هەندێ جاریش ئەگەر کاری باشترو ژیانێکی چاك تری دەستکەوێت کەس ڕێگای لێناگیرێت و دەتوانێت بەشێوەی فەرمی بڕوات و ئەوەش ناکاتە کۆچ و پەنابەری . بەلام لە وولاتانی وەك ئێمە مانان دا زۆر بەپێچەوانەوە لەم مەسەلەیە دەڕوانن .

خۆ ئامادەکردن بۆ هەر سەفەرێك پێویستی بەوە هەیە ئەو کەسە لەرووی ئامادەکاریکانەوە کە دەخوازن بۆ ئەو سەفەرە واتە بەپێی ئەو سەفەرەی کە دێتە ڕێگای خۆی ئامادەدەکات و ئەگەر سەفەرێك بۆ هەندەران بێت ئەوە جیاوازی هەیەو پێویستی بەچەندین ئامادەکاری و خۆسازدان هەیە لەوانە بەپلەی یەکەم پارە واتە ئەو پارەی کە بۆ گەیشتنە شوێنی دیاری کراو پێویستە و دواتر بوونی پاسپۆرت تا بتوانرێت سنوری ئەو وولاتانەی کە دەتوانرێ بەو پاسپۆرتە ببەزێنرێت و پاشانیش پێداویستی جل و بەرگ و هەندێ شتی دی کە مرۆڤ لەماوەی سەفەریدا پێویستن .

بەلام ئەوەی سەرنج ڕاکێشە و پێویستی بەباس کردن هەیە ئەم شێوە سەفەرانەی کورد بۆ هەندەران و ئەو جۆرە خۆئامادەکردنانە کە ئەویش بەچەند قۆناغێك دا تێدەپەڕی و بەپێی بارودۆخەکان مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت ، چونکە لاوی کورد ئەوانەی بەدرێژی ژیانی خۆیان پاسپۆرتێکیان بەوێنەی خۆیان و بەناوی خۆیانەوە نەدیوە و ئەبێ ئەمرۆ هەیان بێت ، بێ گومان سالانی دوای ڕاپەڕین و بەهۆی بارودۆخی سیاسی ناوچەکەوە زۆر بەکەمی دەتوانرا پاسپۆرتی فەرمی دەربێت و پاشانیش زیاتر پارەی دەویست و بێ لەوەی کە بەترسەوە ئەو خەلکە دەچوونە کەرکوك لەبەر ئەوە لەکوردستان بەئاسانی ئەو کێشەیە چارەسەرنەدەبوو و پاسپۆرتی هەمە جۆریش ئەوەندە زۆر بوون بەناوی خۆتەوە بەوێنەی خۆتەوە و بەناوی ترەوە . نرخی ئەم پاسپۆرتانەش دەگۆڕا و نرخێکی دیاری کراوی نەبوو سەردەمانێك گرنگ نەبوو ئەم پاسپۆرتە بەناوی خۆتەوە بێت یان ناوێکی ترەوە

هەندێ جاریش ئەو ناوە هی ئافرەت بوو و پاسپۆرتەکەش بۆ پیاوێك بوو، هەندێ جاریش بەپێچەوانەوە بەناوی پیاوەوە بۆ ئافرەتێك تەنها وێنەکان دەگۆڕا . دەبوو لەباتی لەڕێگای دەزگا بەرپرسەکانەوە و لەڕێگای حکومەتەوە ئەم کارەبکرێت هەندێ کەس بەشێوەی فەرمی و بەدیار چاوی هەموو کەسێکەوە لەماڵەکانی خۆیان بەشێکی وەزارەتیان گواستبووە لای خۆیان و لەوێ کاریان دەکرد و بەوشێوەی دەتویست پاسپۆرتیان بۆ دروست دەکری ئەویش بەپارەی خۆی ، تەنانەت دەزگاکانی حکومەتیش ئەوەیان دەزانی کە هەڵگری ئەم پاسپۆرتە ناوی خۆی نیەو و ئەو ناوەی هەڵگرتووە ساختەیە و پاشان نامەی دەزگا حزبیەکان کە تەزکیەیان دەنووسی ئاماژەیان بەوە دەدا کە هەڵگری نامە ناوی خۆی ئەوەیەو ناوی پاسپۆرتەکەشی ئەمەیە کارەکەی بۆ راپەڕێنرێت و ئەمەش زۆری نەخایاند و مامەڵەکان گۆڕان و شێوەی ناوی خۆی و ناوی نادروست نەماو داوای ئەوە کرا دەبێت بەناوی خۆیەوە بێت. بیر لەوە نەدەکرایەوە ئەم خەڵکە ئەم پاسپۆرتە فەرمیەی بەناوی خۆیەوە لەکوێ بێنێت ، دەیانزانی کەس ناتوانێت بچێتە کەرکوك پاسپۆرت دەربکات بەڵام ئەو شێوە پاسپۆرتانەیان دەویست بۆ باندەکانی قاچاغ چیەتی و ئەوانەی بەبازرگانی کردنی مرۆڤەوە دەژیان ئەوەیان کردە هەل و نرخی پاسپۆرت گەیەندرایە ئاسمان و ئەمەش کارێکی وای کرد کە زۆر لەو لاوانە ناچار بن ڕوو لەڕێگای قاچاغ بکەنەوە و لەڕێگای ئێران و تورکیاوە سەفەربکەن و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی زۆر لەو لاوانە لەو ڕێگاو بانەدا گیان لەدەست بدەن .

گرفتی گەندەڵی و هەرکەسی بۆ خۆی لەو سنورانەدا بەدیار دەکەوت و کاتێك ڕووت لەئیبراهیم خەلیل دەناو ئەو بەرپرسانەت لەو سەر سنورانە دەدی و مامەڵەت لەگەڵ دەکردن و ئەو چەند ڕۆژەی لەوێ بەچاوی خۆت دەتدی چۆن مەسەلەکان تەنها پارە خواردنەوە ئەوەی هەیە و نیە تەنها گیرفان و خزمایەتی و دۆستایەتی و ناوچەگەریە . بەسەر تۆدا کەسی وا دەهات ڕۆژێك بۆ کورد هیلاك نەبووە تەنها

دڵۆپێك ئارەقی نەڕشتووە و بۆ چرکەیەکیش خەمی کوردی نەخواردووە بەڵام وەك قارەمانێك و خاوەن شەهید و دلسۆزێکی گەورە ڕەفتاری لەگەڵ دەکراو ئەو خەڵکەی دی هیچ حسابێکی بۆ نەدەکرا . لێرە ئەوە دەنووسم تا بۆ مێژوو ئەوانەی ڕۆژێك لەو سەرسنورانەدا کاریان کردبێ ئەو مامەڵەو کارانەی خۆیان لەبیر نەچێتەوە و هیچ کاتیش نەتوانن باسی باشە و چاکەی خۆیان لەکاتی کارکردنیاندا باس بکەن چونکە ئەوانەی لەو سنوورانەوە سەفەریان کردبێ هەموو شاهیدی ئەو ڕاستیانە دەدەن.

دوای ماوەیەکیش مەسەلەکان گۆڕانی کوتوپڕیان بەسەرداهات کە دەبوو پاسپۆرتەکان بەشێوەی فەرمی بوونایە ئەنا ڕێگایان نەدەدا سەفەربکرێت و خەڵکی بەتەواوەتی ترسی لێدەنیشت لەوەی بە پاسپۆرتی تەزویرەوە سەفەربکات. ئەمە لەلایەك ، لەو لاشەوە تورکەکان ڕەفتارەکانیان لەم بەر باشتر نەبوو چونکە ئەوانیش جۆرەها گرفتیان دروست دەکرد و ئەوەی ئارەزوویان لێبوایە و بەدڵیان نەبوایە نەیان دەهێشت سەفەربکات و دەیان گەڕاندەوە و زۆر جار بەپێی ناو مامەڵەیان دەکرد و ئەگەر ناوەکان کوردی بوونایە ئەوە ڕێگایان نەدەدا ، خۆ ئەگەر کوردستان بوایە ئەوە سەفەر بۆی قەدەغەبوو و دەبوو ناوەکەی بگۆڕدرایە و زۆر جار بەزەبری پارەو بەرتیل و واستەکاری کارەکان بەڕێدەبوون .

زۆر لەوانەش تۆشی گیرو گرفت دەبوون و ئەو ڕێگایە دەبووە مایەیی ئەزیەت دانیان ، مەبەستم هێشتا دیووی کوردستان و ئەویش دەگەڕایەوە بۆ ئەو بارودۆخانەی کە ئەو کات هەبوون بەهۆی شەڕی ناوخۆوە . ئەمە وای دەکرد هەندێك لەوانەی کە نەیان دەتوانی بەم ڕێگایەدا هاتوو چۆبکەن دەکەوتنە واستەو پارەدان و چەندین ڕێگایان بەکاردەهێنا و هەبوون لەوانەش بەناچاری ڕێگای ئێرانیان دەگرتە بەر . کەواتە هەموو شێوە گرفتەکان و پێشهاتەکانیان وابەستەبوون بەیەکەوە و پێکەوە بەسترابوون وەك زنجیرێك .

مامەڵـەکردن و بیرکردنــەوە لــەو لێـشاوەی کــە هــەنگاوی دەنـا بـەرەو هەنـدەران بەشێوەیەك کە دەسەڵات و کۆمەڵگاشی بێـزار کـردو ترسـی لێنیـشت و کارەکـەش بەرەو زیادبوون دەچوو بۆیە تادەهات لەلایـەن حکومەتـەوە کارەکـان بـەرەو گـران بوون دەچوون و کارێکی وادەکرا کە ئەو سەفەرانە قوورستر بکرێن بەشێوەیەك کـە خەڵکی بەرێژەیەکی کەمتر بیری لێبکەنەوە و سەفەرنەکەن .

بەڵام رێگە گرتن و دەست خستنە رێگای کەسێك کە لەناخەوە و بەوپەڕی بـیروڕاوە بڕیاری دابێـت سـەفەر بکـات و هۆکارێـك پاڵپێوەنـەربێت بـێ گومـان دەیـان رێگـاو کۆسپ و تەگەرەش ئەو هەنگاوانە دواناخەن و ناتوانن ئەو بڕیـارە هەڵبوەشـێننەوە کە ئەمە ڕاستیەکی ژیانە و هەموو کەسـێك و لەهـەموو کـارو ڕەفتـارو هەڵوێـستێکدا بەدیار دەکەوێت و رێگا گرتنیش لەم شێوە کۆچ و پەنابەریانە پێویستی بەهەنگاو و پلان و پرۆژەی ترە بەپێچەوانەی ئەوەی کە هەوڵی بۆ دەدرا یا سوکایەتی و گاڵتە پێکـردن و شـێواندنی ڕاسـتیەکان ، ئەمانـە لەبڕگـەکانی داهـاتوو دا باسـیان لێـوە دەکەین .بەشێوەیەکی گشتی کەسایەتی کـورد بـۆ بەسـەر بردنـی هـەنگاوەکانی و گەیشتنە ئامانجێك کـە بەمەسـت و هیـواو تێگەیـشتنی خۆیـەوە ئاکـامێکی گـەش و روناك و باشترە لەوەی کە تێیـدا بـووە ، ڕەنگـە ئـەوەی ئـەو کـات و سـاتانەی ئـەو بڕیاری ئەوەی دابێ دەبوو زۆر شت دوور لەخواستی خۆتـەوە بەئـەنجامی بـدەیت و زۆر لەوانە رێگای تێدەچـوو بەمانـەوەیان ڕەنـگ بـوو لەناوچـوونایە ، بۆیـە دەکـرێ لەزۆر ڕوانگەوە باسی لێوەبکەین و شی بکەینەوە .

بەشێوەیەکی گشتی ئەو قۆناغەمان باس کرد کە کەسایەتی کورد هەنگاوی بۆ دەنا تا خۆی ئامادەبکات و سەفەری هەندەران بکات .

# قۆناغەکانی تورکیا ـ ئێران ـ سوریا ـ ئەردەن

لەم چوار دەوڵەتەوە کەسایەتی کورد هەوڵی بەرەوهەندەرانی دەدا بەشێوازێك کە ئەردەن و سوریا خەڵکی بە پاسپۆرتی ساختە لەوێوە بەپارەیەکی زۆر دەرباز دەبوون لەگەڵ ئەوەی کە زۆربەی کات ئەم رێگایانە مەترسی داربوون و هەموو کاتیش سەرکەوتنی بەدەست نەدەهێنا و ئەو نەفەرانە دەگیران و لەگەڵ ئەوەی کە ماوەیەکی زۆریش دەبوو چاوەڕوانیان بکردایە ، رێژەی زۆری وبەرفراوانی ئەو رێگایانە تورکیا بوو لەهەموویان زیاتر و پاشان سوریاو ئەردەن و ئێران ، لەگەڵ ئەوەی ئێران رێگایەکیش بوو بۆ پەڕینەوەی پەنابەران بۆ تورکیا بەهەمان شێوەش هەوڵی ئەوەش دەدرا بەپاسپۆرت و هەندێ کاری تری قاچاغ خەڵکی دەرباز بکەن بەرەو ئەورووپا. بێگومان ئێران لەساڵانی هەشتاکاندا دەرگایەکی کراوەبوو بۆ دەرباز بوون بەهۆی ئەوەی شەڕی ئێران _ عێراق و ئەو لێشاوە پەنابەریەی کورد بۆ ئەم وڵاتە کە هەبوون لەوانە لەرێگای پاکستانەوە بەرەو هەندەران دەهاتن و ئەم رێگایەشم بەدورو درێژی باسکردووە .

بەڵام تورکیا لەدوای راپەڕینەوە بووە دەرگایەکی گەورەو کراوە بۆ دەربازبوون بەرەو هەندەران هەرچەندە ئەم وڵاتە بەشێوەیەکی دوولایەن کارو مامەڵەی دەکرد لەلایەك دەیویست و هانی ئەو خەڵکەی دەداو ئاسان کاری دەکرد تا خەڵکی زیاتر سەفەربکات و لەلایەکی تریشەوە کۆسپی دەخستە رێ و گرفتی دروست دەکرد و مامەڵەی نامرۆڤانەی دەنواند و رەفتاری زۆر ناشیرینی دەنواند .

بارەگایەکی تری زۆر گرنك کە میوانخانەیەکی گەورەو هاوکاری بوو بۆ خەڵك و خزمەتکردنیان و ئاسان کاری ، رێگا کردنەوەی زۆر لەو ماڵ و خێزانانەی کە نەیان دەزانی ڕوو لەکوێ بکەن لەوێ دەحەوانەوە و گرفت و کێشەکانیان کەم دەبوونەوە

ئەویش ماڵی جەنابی شێخ عوسمانی بیارە بوو لە ئەستەمبوڵ کە تەکیەکەی بارەگایەك بوو بۆ هاوکاری ئەو خەڵکە و خزمەت و حەوانەوەو چاودێری کردنیان و بەدەم گرفت کێشەکانیانەوە دەچوون . لەهەمان کات بارەگای لایەنە سیاسیەکان گرفتیان بۆ خەڵك دروست دەکرد و لایان لەکەس نەدەکردەوە و تەنانەت وەڵامی لایەنگرو ئەندامانی خۆشیان نەدەدایەوە بەشێوەیەك سەیری ئەو خەڵکە دەکرا وەك دوژمن و ئەوەی مەبەستیان بوو بەتایبەت ئەوانەی لەوێ کاریان دەکرد تەنها چۆن گیرفانی خۆیان و دەوروبەرەکانیان پربکەن و کارەکانی تریان کە دوورە لەخزمەتی خەڵك بەئەنجام بگەیەنن ، هەرچەندە خەڵك داوای ئەوەی نەدەکرد رەوانەی هەندەرانی بکەن بەڵام ئەوەی کە مرۆڤ لەووڵاتێکی بێگانە پێویستی پێیەتی هاوکاری و چاوساخی و رێنمایی کردنە و هەندێ جاریش ئەو گرفتانەی دێنە رێ پێویستی بەهاوکاریە ، بەوپەڕی بڕواوە ماڵی شێخ ئەم ئەرکەیان گرتبووە ئەستۆ و ئەوانەی کە لەم رێگایەوە هاتوون و چەند رۆژێك لەم ماڵەدا نانیان خواردووە و خەوتوون و حەواونەتەوە دەزانن گەورەیی ئەم ماڵە لەچیدابووە و تاچەند رادەبەدەربووە و پێویستە هەمیشەش لەیاد نەکرێت و رەحمەت و خۆشەویستی بۆ گیانی ئەو بەرێزە و ئەوانەی لەوێ کاریان دەکرد و لەخزمەتی ئەو خەڵکەدابوون بنێردرێت . ئەوەش لەبیر نەکەین هەندێك هەبوون کە لەپەنای ماڵی شێخ دا خۆیان حەشاردابوو و لەخزمەتی ئەو تەکیەدابوون بەڵام بوونی ئەو خەڵکەو پێویستیەکانی بۆ دەربازبوون و پارە گۆڕینەوە و پارە حەواڵەکردن و هەندێ کاری تر کەوەك بازرگانی مامەڵەی پێوە دەکرا و ئەم ماڵ و کارو تەکیەیان وەك دەرگایەك بۆ کاسپی و بازرگانی خۆیان بەکاردەهێنا و ئەوانیش چەند کەسێك بوون خەڵکی دەیان ناسین و دیاربوون و لەگەڵ ماڵی شێخ جیادەکرانەوە .

هەندێ لەو کوردانەی کە پێش ئەوەی ماڵی شێخ بەم شێوەیە واڵابکرایە ، هەرکەسەو بەهۆی ناسیاوێکی خۆیەوە یان هاورێیەکەوە یان ئەو قاچاغ چیانەی

کەدەیان هێنان ڕەوانەیان دەکرن بۆ هەندێ شوێن و هەندێ کەسی خۆیان تا بتوانن کاریان بۆبدۆزنەوە هەرنەبێت پارەی خواردن و خەوتن پەیدابکەن و هەبوون کاریان دەکرد تەنها بۆئەوەی بتوانن لەو شوێنەدا بخەون و پارەی خەوتن نەدەن و کەمێك نان هەبێت بخۆن یان ئەو پارەی کەکاری پێدەکرا زۆر کەم بوو بەشی زۆر شتی نەدەکرد و ئەو پارە بۆ ئەوەنەبوو کە کۆبکرێتەوە بۆ سەفەر چونکە ئەوانەی کەکاریان دەکرد و خاوەن کارەکەش دەیزانی ئەمانە هاتوون بۆ دەرچوون لەتورکیا و زۆر نامێننەوە بۆیە زۆر لەو خاوەن کارانە ئەم هەلەیان دەقۆستەوە تا پارەی ئەو خەڵکە بخۆن پارەکانیان نەدەنەوە و ئەگەر قسەشیان بکرادایە ئەوە هەڕەشەی ئەوەیان لێدەکردن کە پۆلیس ئاگادارئەکەن و بەئاگاداربونی پۆلیس و گرتنی ئەوە سنورداش دەکرایەوە بۆیە زۆر جار ئەو کارانە بەبەلاش بەو کوردە دەکراو بەناچاریش دەیان کرد تەنها لەترسی گیران و بوونی شوێنی خەو و نان خواردن تا ئەو ڕۆژەی دەرگای چوونەدەرەوەی بۆ دێتە پێشەوە ، کەواتە ئەوانەی بەکارو بەئیشی خۆیان پارەیان کۆدەکردەوە ماوەیەکی زۆری دەخایاند و ئەوانەی کە پارەیان بۆدەهات و کەس و کاریان هاوکاریان دەکردن بەڕێژەیەکی وا باشترو خێراتر سەفەریان دەکرد . بەلام بەکردنەوەی دەرگای ماڵی جەنابی شێخ ئەو زوڵم و ناهەقیەی کە دەکرا بەرامبەر بەو گەنجە کوردانە کەم بووەوە ئەوانەی بێدەرەتان و بێ ڕێگاو بێ کاربوون هانایان بۆ ماڵی شێخ دەهێنا و لەوێوە هەوڵەکانیان بەرەو هەندەران دەستی پێکرد .

دوای ئەم هەموو چەرمەسەری و گرفت و کێشەو ڕێگای جۆراو جۆر بۆ دەربازبوون و ئەو ڕۆژگارانە دێنەوە یاد و ئەو ناو و کەسایەتیە وەهمیانەی کە زەمەندێك بوونیان هەبوو وەك کەسایەتیەکی جیاواز لەم کەسایەتیانەی ئێستامان و بەچەندین شێوە ناوی سەیرو سەمەرە کە ڕەنگە هەبن ئێستا بەخۆشیان ئەو باسانەیان بەلاوە سەیربێت و ئەو ناوانەش نەناسنەوە چونکە ئەوانیش لەبەرگێکی ترو لە نمایش

کردنی چەندین کەسایەتی جیاوازدابوون و ئەوەی دەیان کرد بۆ زەمەنێك بوو کە مەبەست کاسپی و پارە پەیداکردن و خۆدەوڵەمەند کردن و چوونە نێو دونیای قاچاغ و کاری سنوراو سنور و یاری کردن بەسۆزو شەرەف و ویژدانی خۆیانەوە کە ڕەنگە کامەیان باش بووبێت و کامەیان لەهەموویان زیاتر هاوکاری خەڵکی کردبێت بەڵام هەر قاچاغ چی بووە بێ ویژدان و زاڵم و مرۆڤ فرۆش بووە و بازگانی بەگیان و ماڵ و سەروەت و سامانی ئەو خەڵکەوە کردووە کە هەمووشمان گیانی خۆمانمان لەو کات و ساتانەدا داوەتە دەستی بەو هیوایەی کەلەم ڕێگایەوە بەرەو ئەو هیواو خواستەی کە هەمان بووە پێی بگەین و بەدەستی بێنین . لەو ناوانەی کە تائێستا لەبیرم مابن و بێگومان ئەوانەی ئەم ڕێگایەیان دیوە لەبیریانە و ڕەنگە قاچاغ چیەکان بەخۆیان ئەو ناوانەیان لەبیر کردبێ بەڵام من لێرەدا بۆ مێژوو بۆ لەبیر نەچوونەوەیان دەیان نووسم هەرچەندە ئەم ناوانە ناوی ئەسڵی ئەو کەسایەتیانە تیە لەوانە ( ئەمیر حەیدەری.. بەخەیی قەرەقۆل.. کەیوان ئێرانی.. فەرە عەپسی.. لوقمانی زەڕەنگە.. بێساران هەورامی.. حەمە سەرسپی.. حەمە سوور.. ئەیووبە ڕەش.. حەمە دانزێڕ.. فەرەیدوونی عەزەلات..... هتد) زۆر ناوی دی جۆراو جۆر کە ڕەنگە هەربەناوەکانیاندا شێوە و ڕەوشت و ڕەفتارو کرداری سەیر بەدیار دەکەون . بەرەو دونیایەکی نادیارو ئایندەیەك کە نەزانرێت چۆنەو لەکوێ دەگیرسێیتەوە و ئەو مرۆڤەش گیان و ڕەحمەت و ئایندەی دەداتە دەست ئەو شێوە ناوانەی کە باسمان کردن و ئەوانیش تەنها لە ڕوانگەی پارەو بەرژەوەندی و گیرفانی خۆیان و زۆر لەوانەی کە بەخت یاوەریان نەبوو و لەسەرەتای هەنگاوەکانیاندا و لە کاروانی نەگەیشتووی کۆتای بەو کاروانەی هات و لە و ڕێگاو بانەدا گیانیان لەدەست داوە . هەندێکی دی بەهۆی گرتنیان و سنورداشکردنیان و جارێکی دی نەیان توانیووە بگەڕێنەوەو کاروانەکەیان بەو شێوەیە کۆتایی پێ هاتووە .

ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەو كەسایەتیانە كە ماڵ و حاڵ و دوكان و سەیارەو ئاڵتوونی هەموو فرۆشراوە و بەگەڕانەوەی ژیانی لەسفرەوە دەست پێدەكاتەوە .

هەندێك لەو ڕێگاو شوێنانەی كە خەڵكی پێ ی دەرباز دەبوون بەكورتی ئەمانە بوون :

١. بەڕێگای فڕۆكە بەرەو چیك یان هەنگاریا و بولغاریا و ئۆكرانیا و ڕوسیا و هەندێ وولاّتی دی ، ڤیزە بۆ ئەم وولاّتانە هەندێك ئاسان بوو و بەتایبەت ئەوانەی كە پاسپۆرتەكانیان فەرمی بوون و گرفتیان نەبوو و لەوێشەوە بەڕێگای تروو بەشێوەی قاچاغ بەرەو وولاّتانی ئەوروپی .

٢. ڕێگای تر بەهەمان شێوە بەفڕۆكە و یەكسەر بەرەو ئەو وولاّتانەی كە ڕاستەخۆ بەرەو ئەوروپا ، ئەمەش پارەكەیەكی زۆری دەویست و پاش ماوەیەكی زۆر چاوەڕوانی و ئەگەر هەنگاوەكە سەری بگرتایە ئەوە دەبوو لەترانزێت ئەو پاسپۆرتە فڕێ بدات و دوای ماوەیەك خۆی تەسلیم بكات.. زۆر لەوانە دەگیران و تووشی گرفت بوون و لەوێشەوە بەورەو كوردستان ڕەوانە كرانەوە .

٣. ڕێگای ئاو ، بەبەلەمی بچوك ئەو خەڵكە دەخرایە دەریای ئیجە و لەوێشەوە فڕێ دەدرانە دورگەیەكی یۆنانی و بەرەلاّ دەكران ئەوەی دەگیرا و ئەوەی خۆی تەسلیم دەكرد یان دەرباز دەبوو ، هەرچەندە لەو ڕۆژگارانەدا ئەوانەی لەم دوورگانە دەگیران دوای چەند ڕۆژێك هەموو مۆڵەتی یاسای یان وەردەگرت و ڕەوانەی پایتەختی یۆنان دەكران و بەبێ كێشە و ئیقامەی چەند مانگیان وەردەگرت . بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ڕێگایە چەند ترسناك و بێ ئامان بوو و زۆر گەنج و خێزان و منداڵ لەم دەریایەدا خنكان و تەنانەت لاشەكانیشیان نەدۆزرانەوە ، هۆكارەكانیش لەوەدا بوون كە ئەو قاچاغ چیانە تەنها بیریان لەپارەوەرگرتن دەكردەوە و سەلامەتی ئەو خەڵكە بەلایانەوە گرنگ نەبوو، ئەوەی گرنگ بوو چەند پارە زیاتر وەرگرن و ئەو بەلەمانەش هیچ شێوە مۆڵەتی یاسایی چوونە نێو

دەریایان نەبوو واتە بەلەمەکان خراپ بوون نەدەشان بچنە دەریاوە لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر لەو ڕێژەی خۆی خەڵکیان تێدەکرد و دەبووە هۆی نقووم بونیان.. شەپۆلی مەرگ و قوڵی بێ کۆتایی ئەو دەریایە و نەبینی ئەم سەرو ئەوسەری خۆی لەگەروی منداڵ و گەنجی بێ دەسەڵات دەئاڵاند و هیواو حەزو ئاوات و دیدە نیگای ئایندەی بەرەو مەرگ و کۆتایی دەبرد ، خەونە ئەرخەوانیەکانی منداڵانی کورد ئەوانەی بەهیواوە هەنگاوی نوێیان بەرەو هەندەران و بەرەو ژیان و گوزەران و حەوانەوەو ڕەوینەوەی ئێش و ئازارەکان بەڵام کۆتای و گورزی بەهێزی نامۆبوون و شەپۆلی دەریاکان کۆتایی ئەم هیواو ئاواتانەی بوونەتە قوربانی . نمونەی هەندێك لەو ڕوداوانە کە لەمانگی ٦ ی ساڵی ٢٠٠١ دا (١٢) کەس خنکان و لەتورکیا باخیرەیەکی جۆرجی ڕەوانەی ئیتالیا کرابوون ٨٠ کەس کورد بەهۆی نقوم بوونی باخیرەکە وە هەموو گیانیان لەدەست داوە ، لە کۆتایی مانگی ٨ لە ساڵی ٢٠٠١ دا لەبەحری ئیجە بەلەمێك وەرگەڕا ٢٧ نەفەر بوون ١٧ کەسیان کورد بوون هەمویان خنکان و لاشەی ٨ نەفەریان دۆزرانەوە ، ژمارەی ئەوانەی کە تا ئەم چەند ساڵانەی دوایی لە بەحری ئیجە خنکاون گەیشتۆتە ٤٥٠ نەفەر .

٤. ڕێگایەکی دی هەبوو کەبەهەمان شێوە لەڕێگای دەریاوە بوو بەڵام بەشێوەیەکی دی ، ئەویش بەدروست کردنی پاسپۆرت بۆ نەفەرەکان و تیکتی باخیرەیان بۆ دەکرڕا و ئەویش دەکەوتە سەرشانسی ئەو نەفەرەو تاچەند دەیتوانی بەو شێوەیە ڕەفتاربکات بۆ ئەوەی نەناسرێت و دەربازبێت و هەندێ لەو کەسانە بەهۆی دەم و چاو و ڕەفتارو هەڵەکردنەوە دەگیران و لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خەڵکە باشیش بوو دەیان توانی خۆیان لەو کارەبدەن چونکە کەسایەتی کورد ئەوەتەی هەیە کەی بەو ڕێژەیە ئاشنایی لە گەڵ فڕۆکەخانەو چۆنیەتی سواری باخیرە و سەفەری دوورو درێژ بووە ئەوەی کورد و کەسایەتی کورد لێ ی شارەزابێت شەرو ئاوارەیی و ژیانی شاخ و ئۆردوگا و دەبەدەری و ژیانی خەیمەو

نەهامەتی . بەگێرانی ئەو نەفەرانەش لەم شێوێنانەدا ئەوانیش بەهەمان شێوە سنورداش دەکرانەوە .

٥. ڕێگای پیَ واتە ئەو ڕێگایەی کە دەبوو چەند شەوێك بەڕێگا و بەپیَ ئەو سنوورانەی نێوان یۆنان و تورکیا و چەندین نەهامەتی و ناخۆشی و بڕینی ئاو و شاخ تا ئەو شێوێنەی کە بتوانرێ سواری پاس یان قیتار یان سەیارەو شاحینە بێت بۆ دەربازبوون . ئەم برگەیە زۆر بەوردی باسی لەسەر کراوە واتە لەبرگەی سەفەرێك بۆ هەندەران باس لەوە دەکەم چۆن پەنابەرێك ئەوهەنگاوانە دەنێ تابگاتە بەمەستی خۆی و لەو ژیانەی کە ئارام و خۆشگوزەران نیە بەرەو ئارام و خۆشگوزەرانی بڕوات بەهەموو خۆشی ناخۆشی نەهامەتیەکانیەوە باسی لێوە کردووە.

گرفت و ترسی ئەوانەی بەرەو ژیانی پەنابەری هەنگاویان دەنا کاتێك کە وولاتی تورکیایان بەجیَ دەهێشت و دەگەیشتنە یۆنان ئەوە دەبووە بڕینی هەنگاوێکی گرنگ و گۆڕانێکی باش و دڵخۆشکەر بۆئەو کەسایەتیە چونکە تورکیا ترسی ئەوەی هەبوو کە هەرکاتێك چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد بگیرێت و بەرەو کوردستان ڕەوانەبکرێتەوە و تەنانەت بەترسەوە بەرەو بازاڕەکانی تورکیاش دەڕۆشتن . یۆنانیش بەدەروازەیەکی ئاسان دەزانرا بەرەو ئەوروپا لەوێ ترسی گرتن و گەڕانەوە نەبوو و دەتوانرا کاربکرێت و پاش ماوەیەك بەرەو ئەوروپا هەنگاو بنێت و لەوێش چەندین ڕێگا هەبوون . وولاتی یۆنان و خەڵکەکەی زۆر شت لەئێمەیان نزیك دەکردنەوە لەوانە کوردیان خۆشدەویست و ڕەفتاریان باش و دلسۆزانەبوو هاوکاری تەواوی کوردەکانیان دەکرد ، لەلایەکی ترەوە جوانی ئەو وولاتە و ئەو تێکەڵ بونەی لەنێوان داب و نەرێتە ئەوروپی و شەرقی کە دەتوانی هەردوو شێوازەکانی تێدا ببینی و لەگەڵیان هەڵسوکەوت بکەیت ، ئەمەش ئەو جیاوازیەی دانیشتوانی ئەو وولاتە لەگەڵ دانیشتوانی سەرسنورەکان چونکە ئەوانەی سەرسنوورەکان

بەوشێوەیەنەبوون و لەگەڵ نزیک بونیان لە تورکیاوە ئەوانیش هەمان ڕەفتارو شێوەی ئەوانیان وەرگرتبوو . بەهۆی ئەوەی کە کوردەکان بێ مۆڵەتی یاسایی هاتووچۆیان دەکرد و لەناو شارەکاندا پۆلیس دەگەڕان و ئەوانەیان دەگرت کە بەڵگەی یاسای و مۆڵەتی مانەوەیان نەبوو یان گرفت دروست دەبوو و پۆلیس کۆنترۆلیان دادەنا و لەگەڵ ئەوەی کە هندی و پاکستانی و وولاتانی دی دەگیران و کوردیش تەنها بەووشەی (کوردۆس) هیچی لەگەڵ نەدەوترا و بەڕێزەوە بەڕێدەکرا . زۆر جار پاکستانیەکان دەیان وویست ئەم ووشەیە بەکاربێنن و بلێن ئێمەش کوردۆسین بەلام بە ڕەنگو و ڕو و قسەکردن خێرا ئاشکرادەبوون و ئەمەیان بۆ نەدەچووە سەر. لێرەدا دەمەوێ باس لەسەر ژیان و گوزەرانی ئەو خەڵکە بکەم کە چۆن بوون چۆن دەژیان و ڕۆژانە پێیەوە خەریك بوون و چۆن خۆیان ئامادەدەکرد بۆ دەربازبوون لە یۆنان و گەیشتنیان بە ئیتاليا و وولاتانی تری ئەورووپی.. دوای ئەوەی چەند ڕۆژێك ڕێگا بەپێ ی و دوای ماندوو بونێکی زۆر و ناڕەحەتی ئەو نەفەرانە لەشاری ئیکزانتی وەك دووا قۆناخی ڕێگا سواری پاس دەبوون و بەرەو سالۆنیك و لەوێشەوە بەرەو ئەسینا و ئەو سەنتەرەی شار و ئەو گۆرەپانەی بەناوی (ئامۆنیا) کە کوردەکان لێی کۆدەبوونەوە و دواتریش بوو بووە شوێنێك بۆ فرۆشتنی هەندێ خواردن و دواتر مامەڵە کردنی قاچاخ چیەتی و سەفەرو و هەندێکی تر باسی کارو ئیش دۆزینەوە ، سەبارەت بە حەوانەوەی ئەو خەڵکە هەبوون لە ئوتێلەکان ژوریان گرتبوو و هەبوون لەوانەش کە چەند کەسێك پێکەوە شوقەیەکیان گرتبوو و تێیدا دەژیان و لە نزیك پارکی ئامۆنیاشەوە گۆرەپانێکی چۆڵ هەبوو لەگەڵ زۆر بوونی کوردەکان و کەمی ئیش و دروست بوونی گرفت وایی کرد ئەو شوێنە بکرێتە پارکی نیشتەجێ بوونی ئەو کوردانە کە سەرەتا لەکارتۆن و نایلۆن ژوریان لێدروست کردبوو تێیدا دەژیان و دواتر بەشێوەیێکی تر کرایە لەوح و هەندێك گۆڕانکاری پێوە کرلو بەتەواوی بووە ئۆردوگایەك لەناوەڕاستی ئەو شارەدا

کە کوردەکانی تێدا دەژیان و بەجۆرێك وایی لێهات بووە شوێنی بازارو بازرگانی و چەندین کەباب خانەوە نانەواخانەو دەلاك خانەوە زۆر شتی تری لێدروست کرا .

پاش ئەوەی کە سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان کە ئەو کات بەرێز جەوهەر نامق سەرۆکی بوو بەسەردانێك هاتە یۆنان و لەرێگای بەرێزیە هەوڵی ئەوە درا کە لەگەڵ بەرپرسانی پەرلەمان و حکومەتی یۆنانی گفتوگۆ بکات لەو بارەیەوە ، ئەو کات من چەند وێنەیەکی فۆتۆگراف و ڤیدیۆیی ئەو شوێنەم گرت و تەسلیم بەبەرێزیانم کرد بۆ ئەوەی لەنزیکەوە ئاگاداری ژیان و گوزەرانی ئەو گەنجانەبن و پاشانیش گوێنەدان و پشت گوێخستنی دەسەڵاتی یۆنان بۆ داواکانی خەڵکی کورد چونکە چەند جارێك هەوڵی ئەوە درا لەرێگای مانگرتن و رێپێوانەوە بەرەو پەرلەمان و دەسەڵاتی یۆنان و چەندین هەوڵ درا لەرێگای لایەنە سیاسیەکانەوە کارێك بکرێت بەڵام هەوڵەکان بەو شێوەیە جێگای خۆیان نەگرت و دوای ماوەیەکی زۆر توانرا ئۆردوگایەك دروست بکرێت و ئەو شێوە پارك و کۆبوونەوانە لابرێن و هەموو کوردەکان لەوێ کۆبکرێنەوە . کارو کاسپی و قاچاخ چیەتێ بەشێوەیەکی ترو جیاواز لەوەی تورکیا ، هەرچەندە هەموو قاچاخ چیەکان بەیەکەوە بەسترابوون و پەیوەندی لەنێوانیان دا هەبوو چونکە کاریان بۆیەك دەکرد و هەندێ جاریش یەك سەرچاوەیان هەبوو بۆیە لەوێش دەستیان دەرۆیشت و بەئارەزووی خۆیان ئەو خەڵکەیان رووت دەکردەوە و یاریان بەچارەنووس و دەروونی ئەو خەڵکە دەکرد و رۆژانە چەند کەسێك لەو پارکانەدا دەدرانە بەرشەق و دارکاری دەکران و ئەو رێگایانەی کە لەوێوە هەبوون بەرێگای شاحینەبوو واتە لەپشتی شاحینەوە نەفەرەکان دەشاردرانەوە و لە ٦٠٠ دۆلار تا ١٥٠٠ دۆلار نرخی ئەو سەفەرەبوو، ئەمەش دوای ئەوەی کە چەند رۆژو چەند هەفتە چاوەروانی و هەندێ جار لەمانگ تێدەپەری.. لەگەڵ ئەوەی کە رێگای ئەلبانیا هەبوو ئەو خەڵکە دەبرایە ئەلبانیا و لەوێوە سواری بەلەم دەکران و ئەم رێگایەش گرفتو کێشەی زۆر دروست کردو زۆریش لەو رێگاو بانەدا و لەو ئاوەی کە

دەپەڕینەوە خنکان و تیاچوون. لەوانە لەمانگی ٨ ساڵی ٢٠٠٠ دا کە ١١٥ نەفەر لەدەرایا گیران و ڕەوانەی ئیتالیا کرابوون ، ئەمانە لە تورکیاوە چوبوون . لە ٢٢,٠٤,٢٠٠١ دا باخیرەیەك گیرا بەرەو ئیتالیا دەچوو ١٠٠٠ نەفەری پێبوو کە زۆربەیان کورد بوون و ژمارەیان دەگەیشتە ٦٠٠ نەفەر لەو باخیرەیەدا ئەمەش لەتورکیاوە ڕەوانەکرابوو . لە ٠٥,٠٥,٢٠٠١ دا باخیرەیەکی تر گیرا کە بەهەمان شێوە بەرەو ئیتالیا ڕەوانەکرابوو کە زۆربەیان کورد و پاکستانی و مصری بوون و لە ٠١,٠٢,٢٠٠١ دا باخیرەیەك کە ٩١٠ کوردی عێراقی لە تورکیاوە بۆ فەرەنسا پێ بوو گیران و چەندین ژن و منداڵیان تێدابوو . باسمان لەوە کرد کە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی خەڵکی یۆنان و دەسەلآت و ڕای گشتی بەرامبەر بەکورد گۆڕانی بەسەرداهات و لەو شێوە باشەوە بەرەو خراپی رۆشت ، ڕێژەی پەنابەریش لە سنوری خۆی تێپەڕاند و دەزگا پەیوەندیدارەکانیش کەوتنە ئەوەی سنورێك بۆ ئەم شێوە لێشاوە دابنێن و ئەمەش لەو ڕوانگەیەوە هات کە کوردەکانیش بەو شیوەی پێشووی خۆیان نەمانەوە بەڵکو دەستیان دایە خراپەکاری و کاری ناشەرعی و دەرمان فرۆشتن و شەڕو کوشتن و خراپەکاری و ئەمەش وای کرد خەڵکی یۆنان لەهاوکاری و چاکەو خزمەتەوە بگۆڕێن بەرەو دژایەتی و ڕەفتاری ناشیرین بەرامبەر بەکورد .

بەپێی ئامارێکی فەرمی لەسەرسنوری ئیبراهیم خەلیل و ژمارەی ئەوانەی کە سنورداش کراونەتەوە و لەماوەی نێوان مانگی ٦ی ساڵی ١٩٩٩دا و بۆ مانگی ٤ ی ساڵی ٢٠٠٠ گەیشتە ٣٢٦٧ نەفەر .

# چەند زانیارێك سەبارەت بە یاسای كار و پەنابەری

لەم برگەیەدا دەمەوێ تیشك بخەمە سەر هەندێ خاڵ لەوانەی كە یاساكانی پەنابەری لەم وولاٌتانەدا چۆنن و بەچ شێوازێك رەفتار كراوەو دەكرێت هەرچەندە بەو شێوازەی كە ساڵانی پێشوو بەهۆی ئەو لێشاوە زۆرەی پەنابەرانەوە بۆ ئەم وولاٌتانە ناچاربوون یاساكان یەكخرێن و بەیەك شێوازی ستاندار رەفتاربكرێت هەرچەندە بەشێوەیەكی گشتی ئەم ستاندارتە هەر هەبووە و بەردەوامیشە..

لەو رێككەوتنە نێونەتەوەییەی ٢٨ی تەموزی ساڵی ١٩٥١ سەبارەت بە پەنابەریەتی و باری پەنابەری و پاشان هەمان بڕیار لە ساڵی ١٩٥٤ وە دەست بەجێ بەجێ كردنی كرا و زەروریەتی هاتنەكایەی ئەم شێوە بڕیارو ڕاسپاردانە دەگەڕێنەوە سەر ئەوەی كە بەهۆی شەڕەكانی یەكەم و دووەمی جیهانیەوە زۆر لەو خەڵكانە تووشی ئاوارەیی و پەنابەری بوون و لە شوێنی شەڕو ناوچە ترسناكەكانەوە هانایان بۆ ئەو ناوچانەبردووە كە ئارامترو دور لە كێشەو شەڕەكانەوە بوون و دواتریش لە ئاكامی ئەو شەڕە وێرانكاریانەوە و تێكدانی خانووبەرەو بێلانە بوونی خەڵكانێكی زۆر و ئەو زەرورەتە مێژوویەی كە خزمەتی بە مرۆڤایەتی كرد و لانەیەكی بۆ بێ لانەكان دامەزراند.. یاسای پەنابەری و پاراستنی مافەكانیان و هاوكاریە مرۆییەكان و ژیانەویان بۆ جارێكی دی كارێكی باش و دەستكەوتێكی گەورەبوو زۆر خزمەتی بە مرۆڤایەتی كرد بەتایبەت ئەوانەی كە بەڕاستی پێویستیان بەم شێوە هاوكاریانە بوو .لە وڵاتی ئەڵمانیادا چەندین شێوازو جۆری یاسا گۆڕانیان بەسەرداهات و بەپێ ی ئەو رۆژگارانەی كە پەنابەران پەنایان بۆ هێناوە گۆڕان بەسەر یاساكاندا هاتووە و ئەو یاسا كۆنەی كە تا پێش ساڵی ٢٠٠٤ پەیڕوی دەكرا .

لە بەرواری ٥ / ٨ / ٢٠٠٤ دا یاسای نوێ بۆ رێكخستنی باری پەنابەری و مافەكانی لە ئەڵمانیا جێی گرتەوە ، كار بەم یاسایەش بەشێوەی فەرمی لە مانگی ١ی٢٠٠٥

کرا و بۆ یەکەم جار پێداچوونەوە بەم یاسایەی کە ئێستا پەیرەوی دەکرێت کرا ، یاسایەکی نوێی پەنابەری کە بەرژەوەندی و پێویستیەکانی کۆمەڵگای ئەڵمانی لە ڕووی ئابوری و کۆمەڵایەتیەوە لە بەرچاو دەگرێت ، بەڵام ئەو مەبەستە سەرەکیەیەی کە پێویستی بەم یاسا نوێ یەکرد ئەوەبوو : کۆچ بەمەبەستی کارکردن... کاروبارە مرۆییەکان... ئاوێتە بوونی کۆمەڵایەتی و بابەتە ئاسایشیەکان . هەروەها ئەو کۆمەڵە زانیاریە باوەرپێکراوانەی کە پەیوەندارن بە هاتنەناوەوەی وڵات و شێوازی پەنابەری و چۆنیەتی پەنابەری سیاسی . لەسەر ڕۆشنایی یاسای بیانیەکانی کۆن ، بۆ بیانی نیە لە دەرەوەی چوار چێوەی وڵاتانی کۆمەڵەی ئەوروپی کە مۆڵەتی مانەوە و کارکردنی بەردەوامی پێبدرێت ، تەنها لەکاتی نائاسایی و تایبەت دا . ئەو ڤیزەی کەوەردەگیرا لە ڕێگای نوێنەرایەتی یەکانی ئەڵمانیاوە بوون لە دەرەوەی وڵات بە مەبەستی خوێندن ، چارەسەری نەخۆشی ، تاقیکردنەوە زانیستیەکان ، گەشتوگوزار ، بەڵام کارو پەنابەری تیانەبوو ، بۆیە وابەستەبوو بە چەند کاتێکی دیاری کراو و کورت و ئەگەر هۆکاری توندو پەسەند بۆ گۆڕین و تازەکردنەوە هەبوون ئەوە دەتوانرێ گۆڕانکاری تێدابکرێت ، ئەوەش بەپێی یاسایەك بە بەرێگرتن لە بەردەم یاسای کاری بیانی کە حکومەتی ئەڵمانی لەساڵی ١٩٧٣ دا دەریکردبوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی بێکاری لەوڵات . بەڵام یاسای نوێ چەندین گۆڕانکاری بنەڕەتی بەخۆوە بینیوە لە یاساکانی کارکردن و ماف پەنابەری گرنگ ترینیان گۆڕینی ئەڵمانیا بۆ وڵاتی پەنابەری ڕێکخراو لە شێوازی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کەنەداو ئوسترالیا، ئەمەش لەوانەیە بەشێوازو ڕێژە کەمتر لەو دەوڵەتانە بێت. ئەتوانین کورت کردنەوەی ئەو یاساو زانیاریانەی تایبەت بە پەنابەری و مافەکانی بەپێی یاسای نوێ بەم شێوەیە شی بکەینەوە :

**١. شێوەکانی ماق پەنابەری :**

لابردن و سڕینەوەی هەموو شێوازەکانی تری ماق پەنابەری و گۆڕینی بەم دوو شێوەی خوارەوە :

مۆڵەتی مانەوەی.. کاتی **Aufenthaltserlaubnis Befristete**

مۆڵەتی مانەوەی.. هەمیشەیی **Niederlassungserlaubnis Unbefristete**

بەلام لە هەردوو حاڵەت دا پێویستە یەکەم جار مۆڵەتی هاتنەناوەوەی فەرمی بۆ ناو ولات هەبێت و پاشان بۆی هەیە ئەم شێوازە بگۆڕێت بو مۆڵەتی مانەوەی کاتی یان هەمیشەیی، ئەویش بەپێ ئەو مەرجانەی لە یاساکەدا هاتووە.

**٢. مۆڵەتی مانەوە بەهۆی خوێندنەوە :**

ئەمەش مۆڵەتی کاتی وەردەگرێت بەپێی ئەو پێویستیانە پێش بینی دەکرێن کە یاساکە ئاماژەی پێداوە کە ئەویش خوێندن و کارکردنە، هۆیەکانیشی دەگرێنەوە سەر یاسا نێو دەوڵەتیەکان و ئەوانی دی سیاسی و مرۆیی و خێزانیە، بەلام سەبارەت بە مۆڵەتی مانەوەی هەمیشەیی ئەدرێت بەو بیانیەی کە زیاتر لە ٥ ساڵ بەسەر ماوەی لە ئەڵمانیادا تێپەڕیووە و کۆمەڵێك مەرج و گرنکترینیان دابین کردنی بژێوی ژیان واتە ئەو کەسە دەبێ کاری هەبێت و هیچ کاری خراپ و نایاسای لەو ولاتەدا نەبێت و بەشێوەی پێویست زمانی ئەو ولاتە بزانێت.

هەروەها دەکرێت مۆڵەتی مانەوەی بیانیەکان تازەبکرێتەوە بەمەبەستی خوێندن یان هەوڵدان لەڕێگای زانکۆیەکەوە یان کۆمەڵگایەکی زانستی و پەروەردەیی، هەروەها دوای تەواوبوونی خوێندن بەشێوەی سەرکەوتوویی ئەتوانرێ ئەو مۆڵەتە نوێ بکرێتەوە بۆ ساڵێکی تر تا بتوانێ بۆ کاربگەڕێت لەو بوارەی کەخوێندویەتی .

لە هەندێ حاڵەتی تایبەت دا دەتوانرێ مۆڵەت بدرێت بۆ بەشداری کردن لە کۆرسی زمان فێربوون بەبێ ئەوەی پەیوەندی هەبێت بە خۆئامادەکردنەکانی خوێندنەوە و تۆمارکردن لە زانکۆیەکی دیاری کراو و هەروەها دەکرێ بەپێی ڕەزامەندی دەزگا

تایبەتیەکان بەکار مۆڵەتی مانەوە بە هۆی ئەنجامدانی ڕاهێنان و خۆئامادەکرن لە یەکێك لە کارگەکانی ئەو وڵاتە.

٢. گۆڕ بەمەبەستی کارکردن :

لە بەرواری ٢٠٠٥/٠١/٠١ دا وەك یاسای نوێ دەسەڵات دەدات بە دادوەر بە دانی مۆڵەتی مانەوە و کارکردن بەو بیانیانە پێکەوە لەجێی ئەو یاسا کۆنەی کە جیاوازی و پێکەوەنەبەستنی ئەم دووانەی پێوەدیاربوو. ئەمەش ئەوەدەگەیەنێ کە بیانیەکان لە ئەڵمانیا لەئایندەدا هەڵسوکەوت لەگەڵ یەك دەزگای فەرمی تایبەت بە کاروباری پەنابەری و مۆڵەت و کارکردن پێکەوە دەکەن ، بەڵام لەدەرەوەی وڵات نوێنەرەکانی ئەڵمانیا (سەفارەتەکان) بەم کارە هەڵدەستن . بەنسبەت ئەوانەی خاوەن تواناو شارەزایی زانستین کە یاساکە ڕێگادەدات بەوەرگرتنی مۆڵەتی هەمیشەی و بۆشیان هەیە ببنە هاوڵاتی لەو وڵاتەدا واتە (جنسیەی) ئەو وڵاتەیان هەبێت ، پاشان کەسوکاریان کە ژمارەیەك بۆیان هەیە لەگەڵیان بن و یان دوایی پەیوەندیان پێوەبکەن ، ئەوەش دەکەوێتە سەر ئەوکارەی کە ئەنجامی دەدەن . ئەمەش ئەوەدەردەخات کە یاسای پەنابەری و مۆڵەت دان بەم شێوەیە ڕەزامەندی ئەو دەرچوانەی زانکۆکان و پەیمانگا ئەڵمانیەکان تا سوود لەو بیانیانە وەرگرن ، وەك وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا .

ئەمەش بەهەمان شێوە کاریگەر دەبێت لەسەر ئەو خاوەن کارە ئازادەکان کە یاساکە ڕێگادەدات مۆڵەتی مانەوەیان پێ بدرێت بۆ ئەوانەی کە بازرگانی دەکەن و ئەوبڕە پارەیەش لە یەك ملیۆن ئۆیرۆ کەمترنەبێت ، و کاربۆ ١٠ کرێکار دابین بکات بەلایەنی کەمەوە ، لە حاڵەتی ئەوەی ئەم مەرجانە هەموویان جێبەجێ نەکران و دوای لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی و بوونی بەرژەوەندی گشتی ئەڵمانی و تایبەت و بوونی پێچەوانکاری لە سەر باری ئابووری و بەرامبەر ئەوەش نەدانی مۆڵەت بەوکەسانەی کە نزیکن لە کەسە خاوەن توانا سادەکانەوە بەردەوام دەبێت ، تەنها

لـە حاڵـەتی زۆر کـەم کەبەرژەوەنـدی پێویـست بکـات . مەرجـە سـەرەکیەکانی وەرگـرتنی مۆڵـەتی کـار ئەوانـەن کـە بەشـێوەیەکی گـشتی لەگـەڵ پێویـستیەکانی کۆمەڵگای ئەڵمانی دەبێ ، بەلەبەر چاوگرتنی داواکاریەکانی بازاری کارکردن.

٤. کۆچ بە هۆکاری مرۆیی :

بەپێی یاسای پەنابەری نوێ و گونجانی لەگەڵ ئەو یاسایانەی کاریان پـێ دەکرێـت لە یەکێتی ئەوروپا کە دەتوانرێ مۆڵەتی پەنابەری لە ئەڵمانیا دا بـدرێت ، تەنانـەت ئەگەر ئەو کەسەش لە وڵاتی خۆی هیچ چەوساندەنەوەو بەدواداچوونی کەسیەتی لە وڵاتەکەی خۆی نەبێت ، چونکە یاسا نوێکە ئەو چەوساندنەوەی کە پەیوەسـتە بـە (جنس) ەوە هۆکارێکە بۆ وەرگـرتنی مـاف پەنابـەری . لەگـەڵ ئـەوەش دا ئەوانـەی پەنابـەری سیاسـین مۆڵـەتی سـەفەرو گواسـتنەوەو نیـشتەجێ بـوون لـەنێو ئـەو هەرێمانەی ئەڵمانیا دا بەئازادی هەیە ، هەروەها بۆ ئـەو کەسـانەی ئـەم مۆڵەتـەیان هەیەو منداڵەکانیان لە خوارتەمەنی ١٤ ساڵەوەن ئەتوانن بێنە لای دایـك و باوکیـان لە ئەڵمانیا .

٥. بەیەك گەیشتنەوەی خێزان (جمع شمل) :

لەم برگەیەدا کە پەیوەندی بەیەك گەیشتنەوەی خێزان و هێنانی منداڵەکانیانە، کـە لەیاسـا کۆنەکانـدا چـۆن هـاتووە بـەو شـێوەیە زۆر گۆڕانکـاری بنـەڕەتی بەسـەردانەهاتووە و ئەوانـەی مـەرجی بنـەڕەتین کـە مۆڵـەتی مانـەوە و جێگـای نیشتەجێبوونی بەپێ مەرجەکانی داواکراوە .

ئەوەشی پەیوەستە بە هێنانی ئەومنداڵانەی کە پێویستە بەدایك و باوك بگەنـەوە ، مەرج هەیە کە تەمەنیان لە ١٦ ساڵی دابێت و بەپێی ئەو ئیشارەتانەی کـە توانـای ئـەو کەسـانەی کـە تەمـەنیان لـە ١٦ تـا ١٨ سـاڵە بـۆ پەیوەنـدی کـردن بـە خێزانەکانیانـەوە وهەیـە لـەو حاڵەتـە تایبەتیانـەی کـە دێنـەپێش و لەگـەڵ بـوونی ئەوفرسەتانەی بەیەك گەیشتنەوەی خێزان لە کۆمەڵگای ئەڵمانی دا هەیە .

**٦. ئاوێتە بوونی کۆمەڵایەتی :**

یاسای پەنابەری نوێ بۆ یەکەم جار پێ لەسەر ئەوەدادەگرێت و بەپێویستی دەزانێت کە ئەو کەسانەی لەم وڵاتەدا مۆڵەتی مانەوەیان پێدەدرێت دەبێ پەیوەندی بەو بەرنامەو خولە تایبەتیانەوە بکەن بۆ پاڵ نان و بەرەوپێش بردنی کاری ئاوێتەبوونی بیانی لە کۆمەڵگای ئەڵمانیدا ، ئەویش لەڕێگای پەیوەندی کردن بە دەوراتی فێربوونی زمان و یان بەوشێوەی کە ناسراوە بە وەرگرتنی زانیاری لە هەموو لایەنەکانی ژیانی یاسای و ڕۆشنبیری لە وڵات دا ، لەگەڵ دەرکەوتنی ئەوەی ئەو پەنابەرە تواناى قسەکردن و تێگەیشتنی نیە بەئەڵمانی ، ئەوە ئەو یاسا نوێیە ناچاری دەکات بەوەی پەیوەندی بەو کۆرسانەوەبکات کەتایبەت مەندن بە فێربوونی زمان بۆ ئاسان کردنی بەرنامەی ئاوێتەبوونی کۆمەلایەتی و ئابووری لە وڵات دا .

**٧. دور خستنەوە لە ئەڵمانیا :**

یاسا نوێکە ئەو هۆکارانە دیاری دەکات کە دەبنە هۆی دورخستنەوەی بیانی لە ئەڵمانیا و گرنگ ترینیان ئەنجامدانی کاری نایاسایی و تاوانە کە سزاکان لەسەریان بگاتە سێ ساڵ بەندی بەپێ بڕیاری دادگا ، ئەو تاوانانەی کە ئیشارەتی پێدراوە لە یاسای بازرگانی بە مادە بێهۆشکەرەکانەوەو تێکدانی ئەمن و ئاسایشی گشتی لە وڵات و هێنانە ناوەوەی بیانی بە شێوەی قاچاخ و بەپێچەوانەی یاسا .

هەروەها دوور خستنەوەش دەبێ بەپێی ئەو زانیاریانەی کە دەسەلمێنن ئەو کەسە پەیوەندی بە کۆمەڵەو ڕێکخراوە تیرۆریستیەکانەوە هەیە ، یان هاوکارییان دەکات یان هەڕەشەدەکاتەسەر بنەما سەرەکیەکانی کە بەندن بە ئازادی و دیموکراتی یەوە یان بەشێوەی ئاشکرا داوای بەکارهێنانی توندو تیژی و هەڕەشەی بەکارهێنان دەکات . لەگەڵ دەرکردنی هەموو بیانیەك کە بسەلمێنرێ کەسەرکردایەتی

ڕێکخراوێکی بێ مۆڵەت و نهێنی کەپێچەوانەی یاسا سەرەکیەکانی پابەندن بە ئازادی و دیموکراتی بێت لە وڵات .

**مۆڵەتی هاتنە ناوەوەی عەرەب :**

هاوڵاتیانی دەوڵەتە عەرەبیەکان کە دەبێ ڤیزەی هاتنەژورەوەیان هەبێت ئەگەر سەردان بێت یان مانەوە . بەرپرسایەتی وەرگرتنی ئەم ڤیزانەش دەکەوێتە ئەستۆی ئەو سەفارەت و قونسلیانەی ئەڵمانیا لە دەرەوە ، ئەو دەزگا بەرپرسانەش پێویستیان بە ٢تا ١٠ ڕۆژ کارکردن هەیە بەبێ ئەوەی کە ڕۆژانی پشو بژمێردرێت ، بۆ وەرگرتنی ڤیزە بەمەبەستی سەردانی کورت . لەکاتێك دا ئەم جۆرە ڤیزانەی مانەوە و کار دەگاتە چەند مانگێك . ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی چەند لەو شێوە داواکاریانە هەن لەگەڵ کەم و زۆری ئەو فەرمانبەرانەی ئەو کارانە ڕادەپەڕێنن لە سەفارەتەکان دا ، تەنها بۆ زانیاری کە زیاتر لە ٢,٢ ملیۆن داوای وەرگرتنی ڤیزە هەبوو بۆ چوونە ناوەوەی ئەڵمانیا لە ساڵی ٢٠٠٣ دا .

**ڤیزەی شنگن :**

لەساڵی ٢٠٠٣ دا نوێنەرایەتیەکانی ئەڵمانیا لە دەرەوە دەستیان بەدانی ڤیزەی ماوەکورت کەناویان نا ( Visa –) schengen ە بەم پێە ئەوەی ئەم ڤیزەی هەبێ دەتوانێ بچێتە هەموو ئەو دەوڵەتانەی ئیمزایان لەسەر ڕێککەوتنی شینگن کردووە ، ئەوانیش وڵاتەکانی (ئەڵمانیا ، بلجیکا ، دانیمارك ، فلندا ، فرنسا ، یۆنان ، ئایسلاند ، ئیتالیا ، لوکسمبۆرگ ، هۆڵەندا ، نەرویج ، نەمسا ، پرتوگال ، سوید ، ئیسپانیا) لە هەموو حاڵەتێکدا پێویستە لەسەر ئەوانەی کە داوای ئەم شێوە ڤیزەیە دەکەن پەیوەندی بەو سەفارەت و قونسڵیانەی کە لەوڵاتەکانیاندا هەن و ئەو زانیاری داواکاریانەی کە پێویستن پێشکەشی بکەن بۆ وەرگرتنی ڤیزەکانیان .

# بەخشینی مۆڵەتی مانەوەی پەنابەران لە ئەڵمان

لە ڕۆژانی ١٦-١٧ی نۆڤێمبەر و بە ئامادەبوونی هەموو وەزیرەکانی ناوخۆی هەرێمەکانی ئەڵمانیا و دوای گفتوگۆیەکی درێژخایەن لە نێو چەند بیروڕایەکی جیاواز و دژ بەم بڕیارانە ، گەیشتنە پەسەند کردنی دوابڕیار کە ئەوانەی لەم وڵاتەدا داوای مافی پەنابەریان کردووەو داواکانیان بەهەرشێوەیەك بێت ڕەد کراونەتەوە و تەنها مۆڵەتی کاتییان پێ دراوە بۆ مانەوە لە ئەڵمانیا و دواتر ئەوانە ئەو مافانەی کە پەنابەرێکی ئاسایی هەیەتی ئەو بێ بەشە لێیان و زۆر گرفت و کێشە لەم ڕووە وە دروست بوون دواتر ئەڵمانیا لە ڕووی بێ کاری و زیادبوونی بەتاڵە گرفتی زۆری هەیە و ژمارەی ئەوانەی کە لە کارو مافی پەنابەری بێ بەشن نزیکەی ٢٠٠ هەزار کەسن و زۆر لەوانەش هەن زیاتر لە ١٠ و ١٥ ساڵ هەن لەم وڵاتەدا دەژین منداڵەکانیان گەورەن و هەموو لە قوتابخانەکانی ئەم وڵاتەدا دەخوێنن بەڵام هیچ مافێکی پەنابەریان نیە.. بۆ حکومەتی ئەڵمانیا دوای تاوتوێکردنی سەرجەم لایەنەکانی ئەم شێوە بڕیارە . گەیشتنە ئەو ئەنجامەی ئەوانەی کە خاوەن خێزانن ومنداڵەکانیان لە خوار تەمەنی یاساییەوەن و زیاتر لە شەش ساڵە لەم وڵاتەدا دەژین و کاردەکەن و هیچ هاوکاریەکی لە لایەن دەزگا دەستەبەریە کۆمەڵایەتیەکانەوە وەرناگرن و ئەوانەشی کە بەتەنهان و بۆ خۆیان دەژین و ماوەی شەش ساڵ دەبێ لەم وڵاتەدا بێت و ئەویش دەبێ کاری هەبێت واتە کاربکات. ئەوکات ئەمانە بەپێی ئەو بڕیارە کە لە ڕۆژی دووشەمەوە کە دەکاتە ڕۆژی ٢٠,١١,٢٠٠٦ وە پەیرەوی دەکرێت . بۆ ئەوانەشی کە کاریان نیە ئەوە مۆڵەتی تا ٣٠ ی سێپتەمبەری ساڵی ٢٠٠٧ یان پێ دراوە بۆ ئەوەی کار بدۆزنەوە تا ئەو بڕیارانە بیاگرێتەوە ئەگەر تا ئەو کاتە کاریان نەکرد ئەوە لەهەر ئان و ساتێك دا

بێت ئەوە ڕەوانەی وڵاتەکانی خۆیان دەکرێنەوە و تا کاتی کارکردنیان ئەوە هەر بەوشێوەیەی پێشوو دەمێننەوە واتە مۆڵەتی کاتی وەردەگرن.. بەڵام ئەمانە ژیانیان زیاتر دەکەوێتە مەترسیەوە لە جاران کە تێیدا بوون چونکە ئێستە وابەستەبوون بە مۆڵەتێکەوە و دوای ئەوە لە هەر ئان ساتێکدابێت ڕەوانەی وڵاتەکانی خۆیان دەکرێنەوە.

پێش بینی دەکرێت بەهۆی ئەم بڕیارەوە لە نێوان ۳۰ تا ۵۰ هەزار کەس لە کێشەی مۆڵەتی مانەوە ڕزگاریان ببێت. ئەوانەش زۆر عێراقی و ئەفغانی و تورك و عەرب و هەندێ نەتەوەی دیش دەگرێتەوە .

هەروەها بەرپرسی کۆنگرەی وەزیرە ناوخۆیەکانی هەرێمەکان (Beckstein) ( بێك شتاین ) دەڵێت کە ماوە نادەم ئەم کۆمەڵە خەڵکانە لە ئەڵمانیادا بمێننەوە بەهۆی ئەو هاوکاری و کۆمەکیە کۆمەڵایەتیانەی ئەڵمانیا وە بێ کاربمێنێتەوە.

لەگەڵ ئەوەی حکومەتی فیدڕاڵی ئەڵمانیا بە ڕەسمی خۆشحاڵی خۆی بەو ڕێککەوتنانە نیشان دا ، چونکە ئەم گرفتە ماوەی چەند ساڵێکە باس و خواستی زۆری لەسەرە و هەروەها وەزیری ناوخۆی حکومەتی فیدڕاڵ بە هەمان شێوە خۆشحاڵی خۆی دەربڕی کە ئەم شێوە بڕیارانە زۆر گرفت بۆ دەوڵەت و بۆ ئەوانەی کە چەند ساڵە بەهیوای ڕۆژێکی وەك ئەمڕۆوەبوون و ئێستا دڵخۆشن .

بەشێوەیەکی گشتی ئەم بڕیارانە زۆر لەو کوردانەی کە لەساڵانی ۱۹۹۷ وە لەم وڵاتەدان و هیچ مافێکی پەنابەریان نیەو لەزۆر گرفتی دەورنی ناخۆشدان بۆ ئەم جۆرە زۆریان ئەوانەی مەرجەکانی ئەم بڕیارە دەیان گرێتەوە لە ئایندەیەکی نزیکدا ڕزگاریان دەبێت .

# چەند بڕگەو زانیاریەك دەربارەی چۆنیەتی وەرگرتنی پەنابەری

وەرگرتنی مافی پەنابەری و بەپێی ئەو یاسایەی کە تایبەتە بەم مافە و هەموو ئەولنەش دەگرێتەوە کە بەهۆی باسی سیاسی و نائارامی وولات و گرفتی ئابوری و چەندین گرفتی دی کە دەبنەهۆی ئەوەی کەسایەتی وولاتی خۆی بەجێ بهێلێت و ڕابکات و پەنابەرێتە بەر ئەو وولاتانەی کە ئەم شێوە مافەدەبەخشن و لەوانەش ئەلمانیا ، ڕەنگە ئەمڕۆ وەك ئەو بارو دۆخانەی عێراق و کوردستان و سەرجەم ئەو گۆڕانکاریانەی کە دەیان بینین و بەهەمان شێوەن مافەکانی پەنابەریش سەبارەت بەم وولاتانە گۆڕانی بەسەردا دێت . لێرەدا باس لەو یاسای پەنابەریەدەکەم کە بەشێوەیەکی گشتی ڕەفتارلەگەڵ ئەوانەدا دەکات کە داوای پەنابەری پێشکەش دەکەن و ئەم یاسایە لەهەریمی ( Baden Württemberg ) ( بادن فۆرتم بێرگ ) یەکێکە لەو هەرێمانەی ئەلمانیا و لەلایەن وەزارەتی ناوخۆی ئەو هەرێمەوە ئەو یاسایە دەرچووە و لەسالی ١٩٩٥ وە کاری پێدەکرێت و تائێستاش پەیڕەوی دەکرێت و هەندێك گۆڕانکاری تێداکراوە و ئەو یاسای پەنابەریە نوێیەی کە لەسەرەوە باسم کرد دەبێتە تەولوکەری ئەم یاسایەو پەیڕەویان دەکرێت ( Innenministerium Baned Württemberg ).

**مافی وەرگرتنی پەنابەری :**

بۆت هەیە مافی پەنابەریەتی وەرگریت لە ئەلمانیا بەمەرجێ ڕاکردووی سیاسی بیت ، دوای تاقی کردنەوەی هۆکارەکانی ڕاکردووە سیاسیەکان و بۆ دلنیابوون لەڕاستیان و لەوماوەیەدا وەك میوان ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێت .

ئەولنەش ئەم بڕیارەیان بەسەردا ناسەپێ و لەم دووحالەتەدا :

١. ئەگەر پێشتر مۆڵەتی کاتی مانەوەت وەرگرت لەئەڵمانیا وەك پەنابەری شەڕ یان شەڕی ناوخۆ.

٢. ئەگەر هات و لەڕێگای ئەم وڵاتانەوە هاتیتە ئەڵمانیا (ئیسپانیا - پورتوغال - فەرەنسا - بەلجیکا - هۆڵەندا - لوکسمبورگ - ئیتالیا - نەمسا - یۆنان - فیلەندا - ئینگلترا - ئیرلەندا - سوید - پۆلونیا - چیك - سویسرا - نەرویج و ئەو وڵاتانەی تری ئەورووپی). ئەم وڵاتانە دەتوانێت بەهێمنی تێیدا بمێنیتەوە و بژیت .

٣.

**یاسا و ئەرکەکانی میوان**

میوان تەنها یاسای نیە و بەڵکو کۆمەڵێك ئەرکی لەسەرە ، یەکێك لەشارەزایانی بێ لایەن چارەسەری داواکاری پەنابەریت بۆ دەکات کە بەشێوەیەکی ڕاست ئاراستەت کردووە . ماف ئەوەت هەیە تائکید لەڕاستی ئەو بڕیارە بکەیت کە بڕیاڕ دراوە لەسەری لەلایەن ئەو شارەزایەوە دەربارەی پەنابەریت لەلایەن یەکێك لەدادگا بێ لایەنەکانەوە .

پەنابەریش ملکەچە بەهاوکاری کردن لەگەڵ بەرپرسان کە بەرپرسیارن سەبارەت بەداوای پەنابەریت .

پێویستە وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە بدرێتەوە و بەشێوەیەکی بەرفراوان هەموو ئەو زانیاریانە بدرێت بەڕاست و دروستی . ئەویش بەو شێوەی کە ئەو کەسایەتیە دوربخاتەوە لەهەموو زیانێك کە کاریگەری سلبی هەبێت لەسەر داواکاریەکەی . لەگەڵ ئەوەشدا جێگای حەوانەوەو نیشتەجێ بوون دیاری دەکرێت لەگەڵ هەموو پێداویستیەکی ژیان و بەڕێوەچوونی گوزەران و سەرباری ئەوەش مەبلەغێکی کەم پارە دەدرێت بۆ سەرفیات . هەروەها چارەسەرکردنی نەخۆشی لەکاتێك دا کە ئەو

کەسە بەخۆی نەتوانێت ئەم ئەرکە بەئەنجام بگەیەنێت و بۆشی نیە ئەوناوچەیە بەجێ بهێڵرێت کە پەنابەری لێ دلواکراوە بەپێچەوانە ئەو کەسە سزادەدرێت .

دوای سێ مانگ و زیاتر ماوە دەدرێت کە بە دوای ئیش دا بگەرێیت و بۆ خۆپاراستن لەسزادان دەبێ دەزگابەرپرسەکان لەدەست بەکار بوونی بەکار ئاگاداربکاتەوە هەرچەندە ئەم بریارە ئەمرۆ گۆرانی بەسەردا هاتووە و ئەوەی داوای پەنابەری دەکات و داواکاری رەت دەکرێتەوە و ئەوانەی لە ١٧,٠٥,١٩٩٧دا لەئەڵمانیان ئەوە بۆیان نیە کاربکەن و دواتریش ئەو بریارانەی کە لەسەرەوە باسمان لێکردن و تازە دەرچوون شوێنی هەندێك لەو بریارانەی سەرەوەیان گرتۆتەوە .دەبێ هەموو دانیشتوانی ئەڵمانیا هەڵسوکەوتی باش و یەکسانیان بەرامبەرهەبێت ، ئەمەش لەلایەن هەندێك جار وادەکات بەهەل وەرگرتن لەم رێزوو یەکسانی و بروابپێکردنەوە کە بۆ کاری خراپەو بۆ بەرژەوەندی تایبەتی و سوود وەرگرتن کە دەبنە لادان لەیاسا داسەپاوەکانی ئەم وولاتە و لەم روانگەیەشەوە چەندین رەفتارو بێ یاسایی و فێڵ و تەڵەکە بەرامبەر بەم وولاتەکراوە و ئەو خەڵکانە توانیویانە لەم رێگایەوە سوودی مادی بەخۆیان بگەیەنێن و پارەیەکی باش کۆبکەنەوە..

لەو یاسایەدا هاتووە کە ئەڵمانیا سزای ئەوانەدەدات کە کاری دزی و نایاسای و سەرپێچی دەکەن وەك دانیشتوێەکی ئەم وولاتە ئەمانەش شەرو لێدانی خەڵك و بازرگانی بە مادەبێ هۆشکەرەکان ئەو تاوانانەی کە بەپێ یاسای ئەم وولاتە سزادەدرێن .

لەلایەکی ترەوە دەڵێت : ئەو کەسانەی رێز لەیاسا و بریارەکانی هەرێمەکانی وولاتەکەمان نەگرێت و پەیرەویان لەسەرنەکات و ئەو هەڵسوکەوتە باشەمان لەمیوانداری کردنی ئیستغلال بکات ئەوە لەئەنجام دا ئەو میواندارییەی پێ رەوانابینین و دەبێ لەئەڵمانیا دەربکرێت بەزووترین کات و لەهەندێ جاردا ئەگەر پێویست بکات زیندانی دەکرێت تاکاتی دەرکردنی .

دوای قبولّ کردنی داواکاریەکەت بۆ پەنابەریەتی و مانەوەی بەردەوامی لەئەڵمانیا کە بۆت هەیە بژیت و نیشتەجیّ بیت و کاربکەیت وەك هەر دانیشتویەکی ئەڵمانی . بەلاّم لەکاتی ڕەدکردنەوەی داوای پەنابەریت ئەوە دەبیّ ئەڵمانیا بەجیّ بهێلیت و ئەگەر ئەو وولاتە بەجیّ نەهێلیت ئەوە لەڕێگای پۆلیسەوە دەردەکرێت.. (هەرچەندە ئەم بڕیارەش گۆڕانی بەسەردهاتوە ئەویش پەیوەندی بەبارودۆخی کوردستان و عێراقەوە هەیە و دواتریش ئەمە ئەوانە دەگرێتەوە کە وەلاّمی کۆتاییان هەبێت و دواتر ئێستا ئەو بڕیارە بۆ عێراقی نەماوە واتە ئەوانەی عێراقین بەهۆی بارودۆخەکانی عێراقەوە گەڕانەوە بۆیان نیە ئەگەر داواکاریەکانیشیان ڕەد بکرێتەوە بەلاّم بەبیّ مۆڵەتی مانەوە دەتوانن لە کەمپەکاندا بمێنەوەو تا دواتر بڕیارێك یان یاسایەکی دی بیان گرێتەوە). ئەو مەسەلەی کە تایبەتە بەم شێوە کەسانە لەسەرەوە باسمان لێوە کرد لەو بڕیارە نوێیەی کە دەرچووە .

**چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کاروباری پەنابەری :**

بەڕێوەبەرایەتی فیدرالی تایبەت بەداواکاری پەنابەری کەسانی بیانی ( Bundesaamt für die Anerkennung ausländische Flüchtlinge) ئەویش ناوی ( بوندس ئامتی ) لیّ دەنرێت بۆ تاقی کردنەوەی داواکاریەکان کە پێشکەش دەکرێن.. بۆ گەیشتن بەوە پێویستە ڕەچاوی ئەم خالاّنە بکرێن..

**پەیوەندی کردن**

لەهەرێمی ( بادێن - فۆرتمبێرگ ) پێویستە خۆت پەیوەندی بکەیت بەنووسینگەی ناوەندی تایبەت بۆ پێشکەش کردنی داواکاری پەنابەری کە لە ژێر ئەم ناونیشانە دایە :

Zentrale Anlaufstelle für Asylbewerber (zast). Durlacher Alle ١٠٠. Karlsruhe

لەوێش پێویستە وەڵامی هەموو پرسیارەکان بدەیتەوە سەبارەت بەناوو زانیاری تایبەتی بەخۆت و تەسلیم کردنی هەموو ئەو بەڵگەنامانەی کە پێتن . دوای چەند ماوەیەك کە ئەویش پەیوەستە بەبارودۆخی ئەو کاتەوە کەکات بۆ کات جیاوازی هەیە ، لەوێشەوە ڕەوانە دەکرێیت بۆ چەند کەمپێك کە داواکاری پەنابەریت تێدادەکەیت و وەڵام وەردەگریتەوە ، لەم هەرێمەدا ئەم شوێنانە هەن کە پەنابەریان بۆ ڕەوانە دەکرێت (فریبۆرگ Freiburg - گۆپینگین Göppingen - ڕاشتات Rastatt - لویدفیگسبورگ Ludwigsburg - ڕۆیتلینگین Reutlingen).

## داوای پەنابەری

دەزگای پەنابەرێتی ناوچە ، نووسینگەی سەربە ( بوندس ئامت ) کە ماوەی تۆمارکردن لەو دەزگایە و دانی ژوان بۆ دووبارە چوونەوە بۆ بوندس ئامت کە دەبێ بەخۆت لە کات و شوێنی دیاری کراو ئامادە بیت بۆ ئەوەی داواکاری پەنابەریت پێشکەش بکەیت. سەبارەت بەمناڵان کە تەمەنیان لە ١٦ ساڵ خوارترەوە ئەوە دایك وباوکیان یا ئەوانەی بەشێوەی یاسایی بەرپرسن لێیان ئەوە داوای پەنابەریان بۆ دەکەن..

## ڕێڕەوی کاری پەنابەرێتی

لەوکاتەوە داواکاریەکەت بۆ پەنابەرێتی پێشکەش دەکەیت ئەوە کاروبارەکانت دەکەونە سەر ڕەوتی خۆیان لە بۆندس ئامت.. تۆش پابەندی لەسەر هاوکاری کردنی نوسینگەی پەنابەری بۆ باسکردن و لێ دوان لەسەر کێشەکەت و

شیکردنەوەی.. بەلاَم ئەگەر بەدەم ئەو داواو هاوکاریەوە نەچوویت کەنووسینگەی پەنابەریەتی لێت دەکات ئەوە دوای یەك مانگ بریاری داواکاریەکەت لەسەر پەنابەرێتی رەد دەکرێتەوە و بریاری دەرکردنت لەئەلمانیا دەدرێت و ئەوەش لەسەر ئەوانە پەیرەوی دەکرێت کە دادگای تایبەت بەکێشەکەت نەتوانن پەیوەندیت پێوەبکەن .

کەواتە گرنگە هەمیشە لەگۆرینی ناونیشان و ئاگادارکردنەوەی نوسینگەی پەنابەری (بۆندس ئامت) و بەرێوەبەرایەتی بیانی کە بەرپرسە لێت و دادگای تایبەت کە داواکاریەت بەوانەوە پەیوەست بێت ، ئاگادار بکرێن و ناونیشانی تازەیان بدرێتێ یا بۆ رەوانە بکرێت .

نووسینگەی پەنابەریەتی هەلدەستێ بەوێنە گرتنت و بردنی پەنجە مۆرت بۆ ناساندنی کەسایەتیت بەشێوەیەکی باش و روون . دوای ئەوەش پێناسەیەك ( Ausweis) وەردەگریێ بۆ بەکارهێنانی لەماوەی داواکاری پەنابەریەتی.. ماوەی بەکارهێنانی ئەم پێناسەیە ۳ مانگە کە بەرێوەبەرایەتی بیانی دوای ئەوە تازەی دەکاتەوە بۆ ٦ مانگی دی.. لەم پێناسەیەدا دیاری کراوە کەلە کویێ نیشتەجیێ بیت و بۆت نیە ئەو جێگایە بەجیێ بهێلێت ، تەنها ئەگەر وەربگریت بۆ دەرچوون لەشوێنی خۆت و سەفەرکردنت لەناو ئەلمانیا بۆکاتی دیاری کراو کە نوسینگەی پەنابەرێتی (بوندس ئامت) پێت دەبەخشێت بەپێچەوانەوە ئەگەر سەرپێچی بکرێت ئەوە یەکەم جار تووشی سزای مادی دەبێت و بۆ جاری دووەم زیندانی .

## گویێ گرتن لە قسەکانت

دوای پێش کەش کردنی داوای پەنابەریت یەکێك لەکارمەندە تایبەتی یە کان بەگویێ گرتن لە ووتەکانت کە بۆ خۆی ئامادە دەبێت لەگەلێ وەرگێرێك لەوکاتەی کە نەتوانی بەزمانی ئەلمانی قسەبکەیت و پێشتر پرسیاری ئەوەت لێدەکریێ بەچ

زمانێك دەتـەوێ قـسەبکەیت ، هـەروەها بەڕێوەچـوونی دانیـشتنەکە و قـسەکانت هەموویان تۆماردەکرێن و وەك پرۆتۆکۆلێکی تایبەت .

ئەم دانیشتنە پەیوەندی بـە پاشـەڕۆژ و ئاینـدەی تـۆوە هەیـە لـەم وولاتـە و دەبـێ گرنگی پێ بدرێت و پێویستە ڕەچاوی ئەم خالانەبکرێت..

١. دەست نیشان کردن و دیاری کردنی هـەموو ئـەو جێگـاو هۆیانـەی بونەتـە ترس و ڕاونانی سیاسی تۆ لەوولاتەکەت .

٢. ڕونکەردنەوەی ئـەو گیروگرفـت و کێشانەی کـە تووشـت بـوون بـەو هۆیـە سیاسیە گشتی یەی وولاتەکەت و ئەو کارانەی لەسەر تۆ هەیانە .

٣. پێشکەش کردنی هەموو ئەو بەلگەنامانەی کە پەیوەنـدیان بەقـسەکانتەوە هەیە و داوای پەنابەریان لەسەردەکەیت وەك بلاوکراوە و نوسراو و گۆڤارو ڕۆژنامەو نوسراوی تر..

٤. لەگـەڵ دەسـت نیـشان کـردن.و گێڕانـەوەی چـۆنیەتی جێگـای دانیـشتنی پێشووت و چـۆنیەتی دەرچـوونت لـەوولات تـا گەیـشتنت بـە ئـەڵمانیا . یـا ژیانـت لەوولاتانی تر و یا پێشتر لەئەڵمانیا بویت یان پـێش ئـەم داوایـە جـارێکی تـر داوای پەنابـەریت کـردوە لـە ئـەڵمانیا یـان لـەوولاتێکی تـر لەگـەڵ دیـاری کردنـی هـەموو هۆکارەکانیان بەجۆرێك ڕێگای ڕەوانەکردنەوەت بۆ وولاتێکی کە بگریت .

٥. داوات لێدەکرێت کـە ڕاسـت گۆبیـت هەمیـشە ئـەو بەلگەنامـە ڕاپۆرتانـەی پێشکەشیان دەکەیت تەواو و ڕاست بن .

٦. ئاگاداریەك.. پێویستە لەسەرت هەموو زانیاریـەك کەتایبـەت بـەخۆت بێـت لەم کاتەدا لەبیریان نەکەیت چونکە دواتـر هـیچ قـسەیەك ڕەچـاو ناکرێـت و حـساب دەکرێ بەووتەی ناڕاست و باوەڕپێ نەکراو .

٧. لەکۆتایی دا دڵنیابە لەڕاستی ئەو قسەو بەڵگەنامانەی کە داوتن و بەشێوەیەکی دروست تۆمارکراون لە ڕاپۆرتی دانیشتنەکەت دا .

٨.

**بڕیاردان**

بڕیاری بەڕێوەبەرایەتی پەنابەری (بۆندس ئامت) لەبەر چاودەگیرێ لەسەر ئەو داوایەی بۆ پەنابەریت کە دەیکەیت لەگەڵ هەڵسەنگاندنی هەموو ئەو هۆکارو بەڵگانەی کە پێشکەش کراون و ئەم بەڕێوەبەرایەتی یە بۆی هەیە ئەم بڕیارانەی لای خوارەوە بدات :

١. بڕوامێنان و قبوڵ کردنی پەنابەری (Anerkennung ). ئەم بەڕێوەبەرایەتیە بڕوا بەو بڕیارە دێنێ کە پەنابەریت قبوڵ بوو لەو وولاتەو وەك پەنابەرێك دەتوانی بژی و هەموو مافێکی پەنابەریت هەیە کەئەویش دوو شێوە قبوڵ بوون هەیە :

- یەکەم : بەپێ بڕیاری پەرەگراف ١٦ کە دەبێت قبوڵ بوونی سیاسی و کۆمەڵێك ماف و کارهەن دەتوانرێ ئەنجام بدرێن و بەپەنابەری ژمارە یەك قبوڵ دەبیت و ئەو مۆڵەتی مانەوەیە کە وەری دەگریت بێ ماوە دەبێت و دیاری کراو نیە و پەیوەندی بەبارودۆخی سیاسی وولاتەکەتەوە دەبێت...
- دووەم : بەپێ ی پەرەگراف ٥١ و ٥٣ ی ژمارە (١) ئەویش قبوڵ بوونە و بەهەمان شێوە هەموو مافێکی پەنابەریت هەیە و تەنها ماوەی ئیقامەکە دووساڵ جارێك تازەدەکرێتەوە و هەندێ جار دەبێتە یەك ساڵ و دواتر نوێ دەکرێتەوە و بەشێوەیەك کە ئەم مۆڵەتی مانەوەیە بە مرۆیی دەناسرێت..

بەهەرحاڵ لەهەردوو حاڵەتدا ئەو کەسە وەك پەنابەرێك دەناسرێت و داواکاریەکان قبوڵ دەبن و تەنها چەند جیاوازیەکی کەم لەنێوان ئەم دوو بڕیارەدا بەدی دەکرێت و هەندێك لەو جیاوازیانە :

- ماوەی مۆڵەتی مانەوە

- لەسەرەتادا گواستنەوە و گەڕان بەئەڵمانیادا بەو شێوە ئاسانیە نەبوو و پێش وەخت لەو هەرێمەی کە تێیدا دەژیت بۆت نەبوو بچیتە هەرێمێکی دی بۆژیان تەنها دوای ساڵێك کارکردن بۆت هەبوو بگوازیتەوە (ئەمە نەك بۆ هاتوو چۆ بەڵکو بۆ ماڵگواستنەوەو نیشتەجێ بوونیش) .

- خوێندن.. واتە خوێندنی زانکۆ و باڵا.. هەرچەندە ئەمەش لەهەرێمێك بۆ هەرێمێك جیاوازی هەیە .

- ئەوانەی منالیان دەبێ نزیکەی ٣٠٠ ئۆیرۆ مانگانە دەدرێتە دایکەکە لەهەندێ هەرێم سێ ساڵ و هەندێك هەرێم دوو ساڵ بەلام ئەو کات و تاپێش ساڵی ٢٠٠٠ یش ئەوانەی پەنجاو یەك بوون وەریان نەدەگرت و ئەو بڕیارەش گۆڕاو ئێستا ئەو جیاوازیە نیە .

بەلام ئەوەی گرنگە هەردوو وەك یەك بڕیاری ئیقامە و مانەوەیان بۆ هەیە لەئەڵمانیا (بە جیاوازی ماوەی مانەوەیان).

Aufenthaltsgenehmigung لەگەڵ ڕێگا پێدانی کارکردن Arbeitserlaubnis بەشێوەیەك کە دەتوانرێ لەسەرانسەری ئەڵمانیا کاربکرێت هەرچەندە لە ١٥,٠٧,١٩٩٧ دا بڕیارێکی نوێ دەرچوو سەبارەت بەوانەی کە پاسپۆرتیان پێ نیە و وەك پەنابەر قبوڵ نەبوون ئەوە بۆیان نیە کاربکەن ئەمە پێشان چەند بڕیارێك هەبوون بۆ کارکردنیان ، لەگەڵ دووبارە پیاچوونەوە بەم بڕیارەدا و ئێستا ئەوانیش بەهەندێ پابەندبوون بەبڕیاری تایبەت و شێوە ئیشەکەو

ڕەزامەندی خاوەن ئیشەکە و پێش کەش کردنی داواکاری بۆ کاردن ئەو مۆڵەتە دەدەن و لەم بڕیارە نوێیەی ئەڵمانیادا بۆ پەنابەرانی عێراقی یەکێك لەمەرجەکانی مانەوەی ئەوانەی کە قبوڵیان نیە کارکردنە بۆ نەناردنەوەیان و مانەوەیان لەم وولاتە..

٢. قبوڵ نەبوون ( Abglend).

بەڕێوەبەرایەتی پەنابەری دەتوانێ داواکەت ڕەد بکاتەوە ئەگەر بۆی دەرکەوت کە ڕاکردووی سیاسی نیت و دواتر بەڕەوای نەبینن کە وەك پەنابەرێك وەرگیرێیت ، ئەویش بەهۆی هاتنی هەندێ لەوانە لەرێگای ئەو دەوڵەتانەی لەبرگەی (٢) دا ئیشارەتمان پێداوە یان بەهەڵە و باوەڕپێ نەکردنی قسەکان هۆیەکی ترن بۆ قبوڵ نەبوون . لەلایەکی تر و بارودۆخی سیاسی وولات هۆکارێکی تری سەرەکیە بۆ ئەم کارە چونکە وولاتێکی وەك عێراق ساڵ لەدوای ساڵ گۆڕانی بەسەردا دێت و بارودۆخەکان سەقامگیرنەبوون و تا بەئەمرۆش دەگات بارو دۆخەکان ئارام و سەقامگیر نین و وولاتێکی وەك ئەڵمانیا بڕیاری ناردنەوەی کەس نادات لەبەر ئەو بارو دۆخانەی ئێستای عێراق. ساڵانێك ئەوانەی ڕوویان لەئەڵمانیا دەکرد و زیاتر لە ٥ ساڵ چاوەڕوانیان دەکرد تەنها وەڵامێك وەرگرن ئەمەش پێش ڕاپەڕین زۆر لەو کەسایەتی و خێزانانە ئەوکات ناچار دەبوون ئەڵمانیا بەجێ بهێڵن و ڕوو لە وولاتانی تری وەك سوید بکەن ، بەڵام لەدوای ڕاپەڕین و ناوەڕاستی ساڵی ٩٠ دە کان و تا ساڵی ١٩٩٧ خەڵکی واهەبوون بەچەند ڕۆژێك وەڵامیان وەردەگرت و بڕیاری سیاسیش و گرنگیش نەبوو چۆن قسەبکەیت و بەڵگەنامە بدەیت یا نەدەیت تەنها گرنگ بوو کورد بویتایە و مەسەلەیەك باس بکرایە ئەوە سیاسی وەردەگیرا و بەڵام لەسەرتایی ٩٦ وە کەمێك گۆڕانی بەسەرداهات و سیاسیەکان کەمێك قورس بوون

ئەوەی دەدرا تەنها ٥١ بوو واتە ئینسانی بوو.. بەڵام لەساڵانی ١٩٩٧ وە گۆڕانی تەواوی بەسەردا هات و تەنها بەناو هێنانی کورد بوون و دانیشتووی هەرێمی کوردستان ئەوە بەهەموو شێوەیەك داواکاریەکەت ڕەد دەکرایە و وەرنەدەگیرایت .
لێرەدا ئەو کەسە هەمو کاتێك بۆی هەیە داواکاریەکەی وەرگرێتەوە و ڕای وەستێنێ لەو کاتەدا بڕیارێك لەبەڕێوەبەرایەتی پەنابەری یەوە دەردەچێت بەڕاوەستانی کاری پەنابەریت و بۆشی هەیە بڕیاری دەرچونت بدات لەئەڵمانیا..

٣. دەرکردن (Abschiebung) بڕیار لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی پەنابەری بەدەرکردن ئەگەر هاتنە ناو وولات بەو شێوەی لەبڕگەی دوودا هاتووە پەنابەریت پێ ڕەوانابینرێت لەبەر ئەم هۆیە... بۆیە لەسەر ئەم بڕیارە کاروباری دەرکردن لەئەڵمانیا جێ بەجێ دەکرێت و ڕەوانەی ئەو وولاتە دەکرێت کە لێوەی هاتووە و زۆر بەخێرای. هەمان بەڕێوەبەرایەتی لەهەموو کاتێکدا بۆ ڕەوانەکردن و دەرکردن بەهۆی نوسراوی تایبەتی یەوە ئاگادرا دەکرێت بۆ دیاری کردنی ماوەی دەرچوون و ئەو بڕیارەش جێ بەجێ دەبێت لەوکاتەی کە نوسراوەکە وەردەگیرێت تا ئەوماوەی بۆی دیاری کراوە..
ئەو بڕیارە و ماوەی کارپێکردنی لەماوەی یەك هەفتە بۆ یەك مانگ دەبێت و لەماوەی دەرچوونیەوە و ماوەی دەرچوونی و بەجێ هێڵانی ئەڵمانیا دەتوانرێ بۆ ماوەی ٣ مانگ ئەگەر بڕیاری وەستانی پەنابەری بکرێت یان داواکاری پێداچوونەوە کە بەرزکراوەتەوە بۆ دادگای تایبەت کە ئەو کەسە دەتوانێ بەئارەزووی خۆی لەوکاتەدا ئەڵمانیا بەجێ بهێڵێت..

### پێداچوونەوە

لێرەدا چەند بارودۆخێك هەن ڕێگا نادەن ئەڵمانیا بەجێ بهێڵێ ئەگەر بڕیاری ڕەد وەرگرتن لەو داوای پەنابەریە وەرگیرا . ئەمەش لەکاتێك دا قبوڵ دەکرێت کە

بەڕێوەبەرایەتی پەنابەری هەست بکات کە ژیانی ئەو داواکارە لەمەترسی دایە و بەگەڕانەوەی ئەشکەنجەدەدرێت یان نەبوونی ئازادی و چەند مەترسی تر کەدژی مرۆڤایەتین و مەترسیان لەژیانی ئەو کەسایەتیە دەبێت لەکاتێکدا ئەگەر ڕەوانەی وڵاتەکەی بکرێتەوە..

هەروەها دواکەوتنی و هێڵانەوەی بڕیاری ناردنەوە و دەرکردن لەخاکی ئەڵمانیا بۆ ماوەیەك ئەویش بەهۆی نەبوونی ڕێگای گواستنەوە بوون لەنێوان کوردستان و ئەڵمانیا هەرچەندە دوای پرۆسەی ئازادی و ڕوخانی ڕژێمی فاشی بەغدا ئەم گرفتەش نەما و ئەو هێڵە ئاسمانیە دروست بوون کە پێشتر یەکێك بوو لەو کێشانەی کە ئەو شێوە بڕیارە سەری نەدەگرت.. لەهەمان کات دا ڕەزامەندی ئەو حوکمەتە یا ئەو دەسەڵاتەی کە دەسەڵاتدارە بەڕەزامەند بوونی بەوەرگرتنەوەی ئەو پەنابەرانە ئەو بڕیارە یاسای ترو خێرا تردەکات و ئەوکات ئەو وڵاتانە بەئاسانی ئەو شێوە بڕیارانە دەدات وەك ئەو پەنابەرانەی بەریتانیا کە بەچ شێوەیەك ڕەفتاریان لەگەڵ کرا و چەند پەنابەرێك بەزۆر و بەناشیرین ترین شێوە ڕەوانەی کوردستان کرانەوە و هەندێ وڵاتی تری ئەوروپی دەیانەوێ هەمان شێوە ڕەفتاربکەن و ئەو پەنابەرانە ڕەوانە بکەنەوە.. بێ گومان کەس نیە پێ ی خۆش نەبێت بگەڕێتەوە بەڵام ئەوەی گرنگە کامە گەڕانەوە و بەچ شێوەیەك و ئەم بڕگەیەش بۆخۆی بابەتێکی تایبەتە و دواتر باسی لێوەدەکەین....

## دادگا Gricht

دەتوانرێ لەڕاست ئەو بڕیارەی دادگا دڵنیابیت کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی پەنابەری یەوە لەسەر داوای پەنابەری کە دراوەتە یەکێك لەو دادگا بێ لایەنانەکان ، دادگاش هەڵناستێ بەلێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە مەگەر ئەو داواکارە بەخۆی داوای

ئەو بەدواداچوونە بکات و بەداوایەکی خێرا لە دادگا بەجۆرێك داوای پێداچونەوە بەرزبکرێتەوە.

بەرزکردنەوەی پێداچونەوە لەلایەن دادگاوە لەماوەیەکی کورت و دیاری کراو دایە و ئەم ماوەیەش لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی پەنابەریەوە دیاری دەکرێت و دەست پێکردن و کارپێ کردنی ئەم بڕیارە لە کاتی وەرگرتنی بڕیارەکەوە دەبێت..

هەمیشە ماوەی پێداچونەوە بۆ دادگا لە هەفتەیەکەوە بۆ دوو هەفتەیە ، ئەویش دەکەوێتە سەر جۆری حاڵەکە ، لەو ماوەیەتێپەڕدەبێت ، بەنەمانی ماوەی پێداچونەوە ئەو بڕیارەی بەڕێوەبەرایەتی پەنابەری جێ بەجێ دەکرێت .

## بەڕێوەبەرایەتی بیانی Ausländeramt

چارەسەری کێشە سیاسیەکانی پەنابەری دەکات لە ئەڵمانیا بەشێوەیەکی ناوەندی لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی پەنابەری بەجۆرێك کە بەڕێوەبەرایەتی بیانی( Ausländeramt ) بەرپرسیارە لەپەنابەران وهاوکاریان دەکات بۆ جێ بەجێ کردنی کاروبارو داواکاریەکانیان ، ئەویش لەوکاتەی کە پێویستە لەناوەندیان ئەو جێگایەی کە داواکارانی پەنابەری تێدادەژین (هایم) Heim لەدوای تەواو بوونی ئەو ماوەی کەدەبێ لەو ماڵ و ناوەندانەی کە داواکارانی پەنابەری تێدادەژین ئەو کات بەڕێوەبەرایەتی بیانی لەچەند حاڵەتێکی جیاوازدا ماوەدەدرێت کە خانوو بگیرێت لەدەرەوەی ئەم ناوەندانە ، بەلام بەمەرجێ لەچوارچێوەی ئەو ناوچەیە دابێت کە لەژێر دەسەڵاتی ئەو بەڕێوەبەرایەتیەی بیانی دایە ئەویش بۆ ماوەیەکی دیاری کراو ، ئەگەر پەنابەری سیاسی بێت ئەوە بۆت هەیە لەسەرانسەری ئەڵمانیا جێگای ژیانی خۆت هەڵبژێری بەلام ئەگەر پەرەگراف ٥١ یان شێوە پەنابەریەکانی دی بن ئەوە تەنها بەئیش دەتوانرێ جێگای ژیان بگوازرێتەوە یان دوای ساڵێك ئیش کردن و ئەو کات دەتوانرێ بەویستی خۆی بۆ

ئەو شوێنەبڕوات کە دەیەوێ.. ئەویش کە دەبێت ( arbeitliss) لەکارکەوتوو یان بێ کار..

مانەوەو ڕێگانەدان بە جێگای گواستنەی ژیان لەسەر ئەوانەش جێبەجێ دەکرێت کە لەو کەسانەبن کەبەهۆی کاری ئینسانی (مرۆیی) وە وەزارەتی ناوخۆی ئەو هەرێمەی تێیدادەژیت بڕیاری دەرکردنت بۆ وولاتەکەی خۆت ڕاگیراوە کە بەهاوکاری لەگەڵ وەزارەتی ناوخۆی فیدراڵی ئەڵمانیا بۆ ماوەی ٦ مانگ دواخراوە (وەستانی دەرکردن Abschiebungs stopp)، هەروەها ئەم وەستانەش لەکاتی هۆکارە مرۆیی و گرفتەکانی گواستنەوە و بوونی نەخۆشی کە دەبێتە ڕێگر لەجێ بەجێ کردنی ئەم بڕیارە ، هەروەها ڕێگا دەگرێت بەدواخستنی دەرکردنت لەخاکی ئەڵمانیا لەکاتێدا کە دەبێ خێزانت هاوەڵێت بکات یان منداڵەکانت نەگەیشتونەتە تەمەنی یاسایی لەکاتی سەفەرکردنیاندا..

ڕێگا نادرێت داوای مانەوە بکرێت یان بڕیاری دەرکردن هەڵبوەشێتەوە بەهۆی ئارەزووی کارکردن و ڕاهاتن لەسەر ژیانی ئەو وولاتە و یان بوونی منداڵ لەقوتابخانە و ئەگەر هۆی لەم جۆرە هەبن بەهیچ شێوەیەك ڕەچاوناکرێن .

ئەگەر دادگا بەشێوەیەکی بنەبڕ کۆتایی بڕیاری دەرکردنی دابێ لە ئەڵمانیا ئەوە هیچ کات ڕاوەستانی ئەو بڕیارە نابێت .

## جێگای ژیان

هەرکات کارە ئیداریەکانی بەڕێوە چوونی داوای پەنابەری یان دواکەوتنی دەرکردنت لە ئەڵمانیا یان وەستانی فەوری ئەوە لەو جێگای دانیشتنە کاتیە دەکرێت بۆ ناوەندی داواکاری پەنابەری و ژیانت لەوێ واتە (هایم) کە کەمپی بەردەوامە یان خانویەك لەوێ دەژیت و چاوەڕوانی ئاکامی داوای پەنابەریت دەکەیت .

لێرەدا بۆت نیە ئەم جێگایە بەجێ بهێڵیت تەنها بە پێی ڕەزامەندی بەڕێوەبەرایەتی بیانی نەبێت ، سەرپێچی لەم بڕیارەش تووشی سزا دانی پارە دەبیت و بۆ جاری دووەم دووبارە کردنەوەی سزای زیندانیە .
لەناوەندی سەرەکی بۆ داواکاری پەنابەری لەبنکەیەکی وەك کالسرۆ جێگای ژیان و دابین کردنی پێداویستی تێدایە و چەند یاسایەك بۆ ئەم مەبەستە هەن و هەروەها لەکەمپەکانی (هایم) تردا یاسای تایبەت بۆخۆیان و چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کاروبارەکانیان هەیە و پێویستە لەسەر داواکاری پەنابەرێتی پەیڕەویان لەسەر بکات و سەرپێچیان نەکات .

## دابین کردنی پێداویستی ژیان

لەوکاتانەی کە وەك میوانێك هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو داواکارە پەنابەرەدا دەکرێت و ئاکامی داواکاری نادیارە ئەو لەڕوی نیشتەجێ بوونەوە و جێگای حەوانەوە و خواردن و جل و بەرگ و ئەو شت و مەکانەی لەڕووی تەندروستی یەوە پێویستن و پاشان لەکاتی نەخۆش کەوتن و چارەسەرکردنی بەبێ پارە جێ بەجێ دەکرێن..
بەڵام پێداویستی ناوماڵ ئەوە لەسەر ئەو کەسە تۆماردەکرێت و دوای دەرچوون لەو جێگایە دەبێ بەبێ نوقسان بدرێنەوە.. بۆ سەرفیاتی ڕۆژانە هەموو مانگێك ٨٠ ئۆیرۆ وەردەگیرێ کە هەر پانزە ڕۆژ جارێك ٤٠ ئۆیرۆ دەدرێت.. لەگەڵ ئەو منداڵانەی لەخوار تەمەنی پانزە ساڵەوە یەکی ٤٠ ئۆیرۆ وەردەگرن ئەمەش تەنها تا ئەوکاتانەی لەهایم دەبیت .

## کارکردن

ڕێگادان بەکارکردن تا ئەو کاتانەی داوای ماف پەنابەریت ئەنجامی نەبێت و هێشتا لەهایم دابیت ئەوە ناتوانرێت کاربکرێت ، بەڵام کاتێك کە بوویتە خاوەنی پاسپۆرت یان ئەو بڕیارانەی کە ڕێگا دەدەن کاربکەیت و پاشان دەبێ مۆڵەتی کارکردنت

مەبێ ( Arbeitserlaubnis ) ئەگەر بەپێچەوانە کاری نارەسمی و بێ مۆڵەت (کاری رەش) بکرێت و دەزگاکانی پەیوەندی دار ئاگاداربن ئەوە سزاکانی توند دەبن و دەگاتە رادەی زیندانی و سزای پارەیەکی زۆر.. ئەو مۆڵەت پێدانەش لەرێگای بەرێوەبەرایەتی کارەوە وەردەگیرێ ( Arbeitsamt) .

**کۆتایی ماوەی مانەوە**

هەرکات داوا کاریەکەت بۆماف پەنابەری رەدکرایەوە و هیچ هۆکارێك نەبوو بۆ هێڵانەوەت لەئەڵمانیا و بریاری دەرکردنت درا بەئارەزوو بێت یان بەزۆر.. بەڵام دەرچوونت بەئارەزوو یان بەخواستی خۆت باشترە لەوەی بەزۆر.. چونکە لەم کاتەدا دەزگای پۆلیس لەماڵەوە دەرت دەهێنن و زیندانیت دەکەن تا کاتی سەفەر پێکردنت و لەو کاتەدا رێگا نادرێت شت و مەك لەگەڵ خۆت بەریت و دەبێ سەرفیاتی سەفەرەکەت لەسەر حسابی خۆت بێت.. ئەم دەرکردنەش ئەگەر بۆ وولاتی خۆت بێت یان بۆ وولاتێکی تر .

**پێشکەش کردنی هاوکاری لەکاتی دەرچوون لەئەڵمانیا**

زۆر هاوکاری و یارمەتی هەن کە لە ئەڵمانیا دەدرێن بەوانەی کە بەخواستی خۆیان دەیانەوێ بگەرێنەوە وولاتی خۆیان یان وولاتانی تر. ئەم هاوکاریانەش لەرێگای نێونەتەوەیی بۆ کۆچ و سەفەر (IOM) .

**گرفتەکانی پەنابەری کورد....**

هێندەبە ئاستەنگ ئێمەی کورد بەتەنگ کێشەو گرفتەکانی خۆمانەوە دەچین ، رەنگە جاروبار بەلابەلای و زۆربابەتی لاوەکی دا کاتی خۆمان بەفیرۆدەدەین و دەرئەنجام سەرجەمی مەبەستەکانمان و ئەوکارانەی بەهیوایانەوە بوون لەدەستمان دەچن ئەوەش دەبێتە مایەی داخ هەڵکێشان و پەشیمان بوونەوە... ئەمەو

لەلایەکی دی دووبارە بەرژەوەندی یە تایبەتی و کەسایەتی یەکانی خۆمان هەمووکات لە پێشەوەن\و هیچ کات گوێ بەوەنادەین کە دوای ئێمە کەسانێکی دی هەن و ئەوانیش هەمان هیواو ئاواتی ئێمەیان هەیە و ئەوانیش ماندووبوون و دەیانەوێ وەك ئێمەبەخۆشی بگەن و بحەوێنەوە و دەرەنجامێکیان لە ژیان هەبێت... هەمیشە ئەم خاڵە سەرەکیە پشتگوێ خراوە بەتایبەت ئەم دیاردەیە لەو کوردانە بەدی دەکرێ کە ئەمڕۆ لەهەندەران و بەچاوی ڕۆشنبیرو پێشکەوتوو خاوەن ئەزمون کە لەدونیای شارستانی ئەمڕۆدا دەژین... بەڵام ئەم چینەی کە لەم دونیایەدا دەژین دەتوانین بەپێشڕەوی ئەو خۆپەرستی یەی دابنێین لەوانەش نمونەی زۆربەرچاو و بابەتی و زانستی بۆ ئەم کارەهەن ، بەڵام ئەوەش لەیادی خۆمان نەبەین کە ئەم جۆرە مرۆڤانەش ڕێژەیان هەیە واتە ناتوانین هەموو ئەوانەی ڕویان لەهەندەران کردووە بەم جۆرەن و بەم شێوەیە بیردەکەنەوە.. کەواتە دەتوانین ڕێژەیەکی نسبی دیاری بکەین و بڵێین لە سەدا پەنجا و لەوانەشە کەمێك زیاتر ئەو جۆرە مرۆڤانە هەن و لەووڵاتی خۆشماندا هەمان دیاردە دەتوانین دیاری بکەین.. بەڵام ئەو جۆرە دیاردانە لەووڵاتی خۆت داو لەووڵاتێکی بێگانەدا کە تۆ دەبێتە ئاوارە یان پەنابەر و کەسێکی دوور لەووڵات و خێزان و کەس و کارو هاووڵاتیانی خۆت.. کەواتە دەبێ ئەو دیاردەیە وەدەر نرێ نەك تەشەنەی پێ بدرێت... دەتوانم زۆر لەو دیاردانە دیاری بکەم و ئەوانەی کە ئەم بابەتە دەخوێننەوە و بێ ئاگان لەم ڕەفتارانەو ئەو کەسانەی بەتەنها لەناوەوە بوون یان لەدەرەوە یان خاوەن پاسپۆرتێکی بیانی ئەوە هەموو شتێکە.. ئەم بیروڕایە هەڵەیە چوونکە ئەوەی لەدەرەوە دەژی مەرج نیە کەسایەتێکی نمونەیی بێت کە چاوەڕوان دەکرێت.. بەبڕوای من ئەمەش تەنها لەلایەن ئەوانەوە سەیر دەکرێ کە لەکوردستان دەژین ، گەنجێکی کورد یان کەسایەتی یەکی دی کوردی لە تەمەنێکی دیاریکراودا دەگەڕایەوە کوردستان بەپارەیەکی زۆرەوە و جل و بەرگێکی سەیرو پاکەوە

بەجۆرەها ڕەفتارو قسەکردنێکی دی یەوە وای لەو دەروبەرەی خۆی دەکرد کە ڕێزیان لیّ دەگرت وایان دەزانی ئەو مرۆڤە دڵسۆزی کوردەو زۆرکاری گەورەو پیرۆزی بۆ کورد ئەنجام داوە ، ڕەنگە لەلایەن زۆر خێزانەوە لەو ڕوانگەیەوە تەماشا کرابێت کە گیرفانی گەرم و پڕبووە و ئەو خێزانە لەکەم دەرامەتی و بیّ دەسەڵاتی خۆیانەوە بە شێوەیەکی تر سەیری ئەو دەکرا.. بەڵام کەسێکی دی نەیدەپرسی ئەریّ کاکی برا ئەوە چەند ساڵە لەدەرەوەی وڵاتی..؟ چیت بۆ کورد کردووە یان خۆت چی ئەکەیت..؟ ئەگەر دەرگای پرسیار والاکەین ئەبیّ پرسیاری زۆر خۆیان ڕاست دەکەنەوە .

یان ئەریّ کاکی برا ئەوە سالێکە لە دەرەوەی وڵاتی ئەم هەمووەت لەچی..؟ کەسانی تریش بەساڵ و دووساڵ ناگەنە جیّ.. ئەم دیاردەیە سەردەمانێك باس لەسەر ئەوە دەکرا ئەوانەی ئەوروپا یان وڵاتانی تر وەك ئەمریکا و ئوسترالیا لەسەر شۆستەکان یان لەکونی دیوار پارەدەردەکەن... ڕەنگە ئەو نەپرسینەوانە زیاتر هاندەربوون بۆ بە هەڵەداچوون و چەواشەبوونی ئەو گەنجانە و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گوێمان لە بابەت و باسی سەیرو سەمەرە دەبیّ ، لێرە دا دەمەویّ هەندیّ لەو بابەتانە بخەمە پێش چاوو هەتالای خوێنەری خۆشەویست ئاشکرا بێت و ئەو ڕاستیانە بکەونە پێش چاوو... بیّ گومان مەبەستم ئەوەنیە هەموولایەك بتوانین ئەو دیاردە ناشیرین و دزێوە مرۆڤایەتی یەی کە کورد تووشی دەبیّ وەلای بنێین و بتوانین کۆمەڵگایەکی شارستانی پێشکەوتووی ڕۆشنبیر دروست بکەین کە لە ئایندەدا بە ئاواتەکانی خۆمان بگەین و هەبیّ ڕۆژێك لە ڕۆژان لەم وڵاتانەدا دەنگێکی پێشکەتوو و ڕۆژشبیرو و سیاسی و زانستی و هونەری گەورە بەناوی کوردەوە بەرزبێتەوە و بەتەنگ داواو مافەڕەواکانی ئەم میللەتەوە بێت و بتوانیّ هەنگاوێك لەو هەنگاوانە بەرەوپێشەوە بەرێت.. ڕەنگە بارودۆخی کورد و جۆری

ژیانیان لە شارێکەوە بۆ شارێکی دی لەم وولآتانە جیاوازی هەبێت ئەوەش دەکەوێتە سەر ئەو کەسایەتی و خێزانانەی کە تێیدادەژین...
باری سیاسی و ئەو دۆخە نائاسایەی کە کورد تێیدا دەژیا واتە ئەو دووبەرەکی یەی کوردستان بەشێوەیەکی سلبی و زۆر ئاشکرا کاردانەوەی گەورەی هەبوو لە سەر کوردەکانی دەرەوە و لەزۆر لەو ولاتانەی کە کورد تێیدا دەژیان بەرێژەیەکی زۆر و لەهەندێك لەو شارانەدا کار وای لێهاتبو کە رقەبەرایەتی و جنێودان و دژایەتی و قسەی ناشیرین و قسەی پاشەملێ کە لەشێوەی شەڕی ساردا خۆی دەدیەوە..
تاگەیشتە ئەوەی شەڕی گەورە دروست ببێ وەك لە یۆنان و لەشاری نۆرنبێرگ لە ئەڵمانیا و لە سویسرا ، کارگەیشتە شەڕە چەقۆ چەند کەسێك گیران و چەندیش برینداربوون و کێشەش بۆ زۆر لەوپەنابەرانە دروست بوو کەهەندێکیان ئەوە چەند ساڵە تائێستاش پێوەی دەگلێنەوە . لێرەدا دەتوانم ئەوە بڵێم کە زۆر جار ئەوانەی پێوەدەبوون و تووشی ئەو جۆرە کارەساتانە دەبوون و دەکەوتنە ئەو گێژاوانەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ تاوانبارنەبون ، بە واتایەکی کە کەسانێکی دی هەبوون لەپشتی ئەوانەوە ڕەوتی کارەکانیان لەدەست دابوو و بۆخۆشیان لەپشتی پەردەوە بوون بەبێ ئەوەی کەس بیان ناسێ... ئەمەش مەبەست لەوانەیە کە خۆیان بەبەرپرس دەزانن لە ڕێکخراو و لایەنە سیاسیەکاندا.. کەواتە هەریەك لەو کێشانە پێش هات و هۆکاری تایبەتی خۆی هەبوو و ئەگەر لە ناوەڕۆکیان ووردببینەوە ئەوانەمان بۆ دیاری دەبێت کەباسمان کردن.. کەواتە شەڕکردن و دژایەتی کردن و گواستنەوەی مەیدانی شەڕی دووبەرەکی لە کوردستانەوە بۆ ئەو وڵاتانەی کە پەنابەری تیایە دەبێ چ ناوێك لەم کارەبنێین.. ؟؟
گرفتی سیاسی و دژایەتی کردن کارێکی وای کردوە ئەو جەماوەرە بووەتە دوو بەرەی سەرەکی و دواتر بەرەکانی تری ئیسلامی و لایەنە جیاجیاکانی دی بابوەستن ، ڕەنگە ئەم جۆرە هەڵوێستانە لەزۆربەی ئەوانە دەردەچن کە بۆ

بەرژەوەندی خۆیان پاڵیـان بەلایەکـەوە داوە کـە بەمەبەسـتی گەڕانـەوە و سـەردان بێت یان بردنەوەی سەیارە و کاسپی یەوە بێت یان بەهەربیانویەکی دی بـۆ ئـەوەی خۆیان بەخۆشەویست و دڵسۆزی لایەنەکانیان نیشان بدەن ئەو جۆرە قسەو بـاس و کێشە و گرفتانە دێنەئاراوە و کاتێکیش کاردەگاتە لایەنی جدی ئـەو وەك بـەرزەکی بانان بۆی هەڵدێ و وەك نـەبای دیبێ نـەبۆران... نموونـەی زۆر هـەن کـە لایـەنگرو ئەندام و دۆستانی لایەنەکان شاهدن..

ئـەم هەڵوێـستە هەمیـشە دژی بەرژەوەنـدی یـە گـشتیەکانی گـەلی کـورد و ژیـانی ئاوارەیی و دەربەدەری پێ قبوڵ کراوەو دەیەوێ پارەوە نانێك بۆ پاشـە ڕۆژی خـۆی و مندالآنی دابین بکات ، بەلآم هەلپەرستی و بەرژەوەنـدی تایبـەتی ڕێگانـادەن ئـەو کارو چالاکی و جموجولآنەی ئەمڕۆ تەواوی کورد پێکەوە دەبەستێتەوە و دەتوانرێ لـەو ڕێگایانـەوە ئـەو جـەماوەرە کۆبکرێتـەوە بـە یـەك دەنگـی یـەگگرتوو ، یـەك هەلوێست کۆبکرێنەوە ، ئەویش بەهۆی دروست بوونی کۆمەڵەو ڕێکخراو و مەڵبەندی کلتوری و ڕۆشنبیری و هونەری و مێـژوی تـا لەوڕێگایـەوە دەنگـی کـورد بـە دوونیـا بگەیەنرێ ئەم کۆمەلآنـە لـە نوانـدنی چـالاکی جیـاوازو جـۆراو جـۆر دەوری خۆیـان دەبیـنن ئـەم خالـەش بەشـێوەیەکی تێـرو تەسـەل لەبڕگـەکانی داهـاتوو باسـیان لەسەردەکەین....

ڕەنگە لەسالێك دا چەند ئاهەنگ و چالاکی هونەری و ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەوانی هەبن کاریگەری گەورەیی هـەبێ بـۆ گـەلی کـورد بەشـێوەیەکی شارسـتانی و پێـشکەوتن نیـشان دەدرێـت دەکرێـت یادکردنـەوەی کارەسـات و نەهامەتیـەکانی کـورد پـێش چاووبخرێن یان لـەڕێگای نووسـین و پەرتووکـەوە یـان بـە ڕێگـای کـاری هونـەری و سینەماو شانۆ و شێوەکاریەوە ، بەلآم بەداخەوە دیسان ڕەوتـی سیاسـەت و کـاری حزبی دەستی والآو درێژە و هەموو لایەنەکانی دەگرێتەوە ، چونکە ئەمڕۆ لـە ژیـانی ئێمەی کورد دا سیاسەت و لایەنە سیاسیەکان هەموو بارەکانی ژیانیان لە ئەسـتۆی

خۆگرتووە و هەموو لەژێر ڕکێفی ئەواندایە ، زۆر نمونەی بەرچاو و دیار هەیە کە زۆر لەوشارانەدا هەوڵی ئەوەدراوە کە کاری لەو جۆرە بەئەنجام بدرێت بەڵام ئەوانەی کە بەناو سیاسین یان بەرپرسانی سیاسین لەو لایەن و ئەو لایەن هەمیشە ڕێگە گربوون و ئەو هەوڵانەیان پووچەڵ کردووەتەوە.. نمونەیەکیش کە خۆم تێدابووم شاری (ڕۆیتلینگین) لە ئەڵمانیا کە یەکێکە لەو سەدان شارانەی لە گێژاوی ئەم جۆرە گرفتانەدا دەتلێتەوە ، چەندین هەوڵ درا کۆمەڵەیەکی کەلتوری بۆ پەنابەران دروست بکرێت دوور لەکاری سیاسی بەڵام سیاسیەکان و ئەوانەی لە ژێر پەردەی ئەم سیاسەت و ئەو سیاسەت هەڵەکانیان پوچەڵ دەکردنەوە .

ڕەنگە بارە سیاسیەکە و ئەم ڕوانگەیە گەلێك گرنگ ترە و جڵەوی هەموو لایەنەکانی دی بەدەستەوەیە.. ئەم دوو بەرەکی و دابڕانە بەشێوەیەکی کاریگەری هەبوو تاگەیشتەوە ئەو ڕادەیەی پێك هاتنەوەی پارتی و یەکێتی.. ئەم خێزان و کەسانەی پێکەوە نەدەژیان و کێشەیان هەبوو بەهەمان شێوە کێشەو دووبەرەکی و دژایەتی کردنیان هەر بەردەوامە.....

ئەگەر لەناوەڕۆك و ڕاستی ژیانی ئاسای ئەو کە سایەتی یانەدا بکۆڵینەوە ، دەتوانم بڵێم زۆربەی زۆریان لەوکەسانەن کە هیچ کات بۆ ئەو لایەنانە هیلاك نەبوون و خزمەتی ئەو لایەنەی خۆیان نەکردووە و ڕۆژێك لە ڕۆژان ماندوو نەبوون و بگرە زۆربەیان لەسیاسەت و پەیڕەو و هەڵوێستی لایەنەکانی خۆشیان نازانن و هەندێکیش لەوانە لەوانەیە ڕۆژگارێك دژی ئەو لایەنە کاریان کردووە.. کەواتە دەبێ ئەم جۆرە کەسانە ناوی چیان لێ بنرێ..؟ و ئەوەی دەیکەن بۆ چی بێت..؟ بۆکێ یەو لەپێناوی چیدایە...؟

بۆ وەلامی ئەم پرسیارانە دەمەوێ ئێوەی خوێنەر وەڵام بدەنەوە و لەبیرو بۆچوونی خۆتاندا ڕاوبۆچونەکانتان دیاربخەن . هەرکەسێك لەم ژیان و گرفتانەی دا نەژیابێت بەو شێوەسانایيەنیە کە هەستی پێبکرێت و ئەگەر ئەوکەسەش لە دەرەوە یان

دووره پـەرێزبێت بەوشێوه گەورەوگرانـە ئـەم گرفتانـە وەرناگیرێـت . ئـەم جـۆره ڕەفتارانه نـەك تـەنها لـە كەسێكەوه بـۆ كەسێكی دی لـە دەرەوەی خێـزان بگـره زۆربەی ئەوانەی لەناو خێزانەكەیاندا ژن و مێـرد ، منـداڵ و دایـك و بـاوك و كـەس و كاردا بەجۆرێك ئەم دیاردەیە وەك كارێكی ناشیرین و ناشەرعی بڵاوبـووەوه تـا ئـەم كاتەی ئێستاش كۆتایی پێ نەهاتوو.. كەواتە لێرەدا بۆمان هەیـە بپرسـین ئەوانـەی دەبنە تاوانبارو دەستیان لەم كارەدا هەیە و ئەم دوونیایە دەخولقێنن كێن..؟ ئایـا ئـەو كەسـانە هەڵـەن و هۆكارەكەشـی دەگەڕێتـەوه بـۆ نـەفامی و نارۆشـنبیری و ناكارامەییان..؟ یان پاراستنی بەرژەوەندی و ویستەكانیان.. یان لایەنەكانیان و ئەو كۆمەڵـە و كەسـانەی ڕەوتـی ژیـان و كارەكانیـان بەدەسـتەوەیەو بەویـستی خۆیـان بەڕێوەی دەبەن.. ؟؟ زۆر پرسیار هەن و وەڵامەكانیان بـە هـەموو جۆرێـك پەسـەند دەبن چونكە هەموو پێكەوه تاوانبارین و دەستمان لە تێكدانی ئەم دۆخ و ڕەوتانەدا هەیـە.. بـەم شـێوەیە لێـك نزیـك بوونـەوەی كۆمـەڵگا و پتـەوبوونی بنـەماكانی كۆمەڵایەتی و پێكەوه ژیان ، لەگـەڵ پـسان و لێـك ترازانـی شـیرازەو كۆتـایی هـاتن بەوپەڕی دڵنیاییەوه دەمان پارێزێ . لە دوونیای ئەمڕۆمانـدا پـچڕانی شـیرازەو لێـك ترازان بەرەو زیـاد بـوون دەڕوات و جیابوونـەوه و تێـك شـكانی قـەوارەی خێـزان و پرەنسیپەكانی زوتر و زیاتر ئاوەڵادەبن و هەڵدەوەشێن.. خزمایەتی و دۆستایەتی و خۆشەویـستی لـە كـەم بـوون و بنبڕدایـە و بـەرەو نـەمان دەڕوات.. كوردایـەتی و نیـشتمانپەروەری بـەكردار بوونیـان نـەماوه.. پاراسـتن و هێـشتنەوەی شـەرەف و كەرامەت و نەفسیەتی بـەرزی كـورد لـەگرفت و كێـشەدایە و جـەنگی مـان و نـەمان دەكات ، كەواتە پێویستە بەرەنگاری ئەم دیاردانە بینەوه و كاری جدی و بەپەلەیان بۆبكەین و هـەموو پێكـەوه ئـەنا دوای چـەند سـاڵێكی دی و بـەپێ ڕۆژگـار هـەموو شـتێك لەدەسـت دەدەیـن و دەبینـە وەك ئەوانـەی كـە ئێـستا بـەخراپ باسـیان دەكەین..

ڕەنگە بڵێین باگیانی دیموکراتیەت و فرەلایەنی وگفتووگۆ لەنێوانماندا هەبێ ، بەلام لەهەمان کات دا ئێمە کەسانێکین لە دونیاو ئاوو هەوایەکی دی دا دەژین و دوورین لە چەك و شەڕەنگێزی و ئەم کەش و هەوا دیموکراتیەی ئەوروپا و ولاتانی دی ئەم دوونیایە دەبینین.. بەلام بۆ خوا کام لەئێمە ڕۆژێك لەڕۆژان تۆزێك لەم ئاو هەوا دیمەکراتیەمان هەڵمژیوە.. ئێستاش دوای چەندین ساڵ ژیان و ئاوارەی هێشتا بیرو بۆچوون و ئاخاوتن و تێروانین بەو شێوەیە کە ئەوڕۆژەی لە سنووری ئیبراهیم خەلیلەوە دەرچووین و تۆسقاڵێك نەگۆڕاوە ، من ناڵێم هەموو بەلام بەڕێژەیەکی زۆر ئەوانەن کە نەگۆڕاون ، لەوانەیە گۆڕابن بەلام لەفکرو و بۆچوون و زانیاری دا نا بەڵکو زۆر بابەتی لابەلاو دوور لەداب نەریتی کوردەواری و ڕەسەنایەتی کوردی گۆڕابین کە باشترین نموونە لە منداڵەکانمانەوە دەتوانین باسی خۆمان ببینین...

ئەگەر زۆر زیاتر لەم بارەیەوە بدوێین ڕەنگە بمانباتەوە سەر ئەوەی ئەو پەیوەندیەی هەیە بەو دۆخەوە کە ئێستا لە کوردستان دا هەیە و بەڕێوە دەچێ و خۆی لە خۆیدا دروست بوون پارچە کۆمەڵگاییەکان و دروست بوونی جیاوازی چینایەتی لەوێوە سەرهەڵدەدات.. ڕاستە ئێستا دوونیای شەڕو پێکدادان نەماوە و دونیای پێکەوە ژیان و پێکەوە کارکردنە و لایەن و گروپە کۆمەڵگیاییەکان ژیانی پێکەوەیان هەڵبژاردوە و دۆخەکان تاڕادەیەك و لە چەند لایەوە ئاساین و باشە.. بەلام پرەنسیپە سەرەکیەکان و ئەو کارە گرنگانەی دەبنە هۆی دامرکاندن و سارێژکردنەوەی برینەکان هێشتا ماونیانە و بەپێچەوانەشەوە ئەو برینانە هەمیشە دەکولێنەوە و باری گرژی و خراپ بوون لە هەنگاوەکاندا دەبینین نەك چاك بوونەوە ، مەبەست لە پەیوەندی لایەنەکان نیە بەڵکو ئەم پەیوەندیە لەنێوان سەرجەم لایەنەکان و جەماوەر یان کۆمەڵگا بەشێوەیەکی گشتی..

سەرەڕای یەکگرتنەوەی هەردوو حکومەت هێشتا یەکبوونەوەکە یەکجارەکی نیە و هێشتا ماویەتی ئەگەر بەچەند پاساوێکی یاسایش بێت.. بەهەرحاڵ ئەوەی ئێمەو

سەرجەم جەماوەری کورد دەیەوێ تێکەڵ بوون ئاوێتەبوونەوە بەجۆرێك بێت هیچ وەخت و زەمەنێك ئەو ڕۆژانەمان نەیێتەوە یاد.. لێرەدا گرنگە فکری ڕامیاری و بۆچوونەکان لە ڕوانگەیەکەوە هەڵبقوڵێن کە هەموومان پێکەوە بیریان لێبکەینەوە و هەموومان پێکەوە کاریان بۆبکەین و هەست بکەین ئەم کارە و دەرەنجامەکانی لەبەرژەوەندی میللەت و نەتەوەکەماندایە. بەرژەوەندیە تایبەتی و کەسیەکان وەلادەنرێن و جیاوازی چینایەتی نامێنێ کەسێك دەبێتە ملیۆنێرو کەسێکی لە برسیەتی و هەژاریدا دەمرێ و ناتوانێ منداڵەکانی پەروەردەبکات ، چونکە ئەمڕۆ دوونیایەکە تەنها بۆ ئەوانە دەست دەدات کە خاوەن سەرمایەو دەسەڵات و هێزن لەگەڵ ئەوانەشی کە بەدەورو خولیاندا دەسوڕێنەوە ئەمە نەك تەنها لەوڵاتی ئێمەدا بەڵکو لە وولاتانی دونیای سێهەم و زۆر وڵاتی تر ئەم گرفتوو فکرانە هەن.. لێرەدا نامەوێ زیاتر درێژە بەم بارە بدەم چوونکە ئێمەی کورد و بەتایبەت ئەوانەی ڕۆژکارێك تۆزێك لە کاروباری سیاسی دا کاری کردبێ هەست بەهەموو ئەو گرفت و کەم وکوڕیانە دەکات و هەمیشەش هەوڵدەدات بە گیانێکی دڵسۆزانەوە بەرامبەر بەکورد ئەوانەی بەدڵسۆزی لەپێناویدا خەبات دەکەن و تابەئەمڕۆ ماندوون و کۆڵیان نەداوە ، تا وڵات و نەتەوەکەمان لەم گرفت و ئافاتە ناوچەی و نێونەتەوییانەدا ڕزگاری بێت و بەماف و خواستەکانی خۆی بگات..

لە لایەکی دی باری ئابوری و لایەنی مادی ، ئەمەش برگەیەکی زۆر گرنگ و زۆر جار زاڵیش دەبێ بەسەر باری ڕامیاریش دا ، (هەرچەند لە دوونای ئەمڕۆی ڕامیاری کە باری ئابووری هەڵیدەسوڕێنێ ، واتە باری سیاسی وا بەدەست ئابووریەوە بۆ کوردستانیش ئەتوانم بڵێم بەرەو ئەم هەنگاوە دەڕوات ئەگەر وانەبێ بەلام لەهەوڵدایە) پارەو سەروەت و سامان و دروست کردنی ڤێلاو خۆبنیاد نان و کۆکردنەوەی بەشێوەیەکی مۆدێرنانە باوەو ئەمڕۆ بازاری هەیە ، کە ئەمەش دەکەوێتە سەروی بیرو باوەڕەو سیاسەتەوە............

ئەمەش بۆتە جۆرە سیاسەتێك كە هەموو كەسێك ناتوانێ بەشێوەیەكی لێهاتوو كارلەی كاری بۆ بكات.. مەبەستم لەوانەیە كە لەدەرەوەی وڵاتن و لەدونیای ئاوارەیدا دەژین و هەریەك بەهۆكارێكەوە لەم وڵاتانەدا دەژی ، ئەم شێوە كارانەش جۆرەها رێگاو شێوازی هەیە ، سەرجەم ئەم گرفتانە پێش ئەوەی كاریگەری جەستەییان هەبێت گەورەترین گرفتن لەڕووی دەروونیەوە ، لەلایەك باسمان لەوەكرد گرفتی رامیاری و كاریگەری ئەو سیاسەتەی كوردستان لەسەری و شێواندنی رەوتی فكری ئەو كەسایەتیە ، پاشان هەوڵی كاركردن و بیركردنی هەموو شتێك واتە تەنها ئامانجێك پارەو بەس ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك لەوانە زۆر لەو پەنابەرە كۆنانە و ئەوانەی بەزۆر شێواز بوونەتە خاوەن پارە یان ئەو لێشاوە پارە رژانەی كە ئێستا لەكوردستان رژاوە كە زۆر جار گوێمان لە سەرچاوەكانی دەبێت ، دواتر گرفتە كۆمەڵایەتیەكان و ئەوگرفتانەی لەرێگای منداڵەوە زۆر لەوخێزانە كوردانە توشی دەبن چونكە ئەمڕۆی پێشكەوتن و گۆڕانكاری كاریگەری تەواوی هەیە لەسەر كەسایەتی كورد زۆر جار نەك منداڵان بەڵكو گەورەكانمان دەگۆڕێن و گۆڕاویشمان هەیە چوونكە ئەگەر خۆی نەگۆڕێ ئەو رێگا نادات بەئەندامی خێزانەكەی ئەو شێوە گۆڕانە بگۆڕێن كە لەشێوەی لادانە بەیەكجاری ، كەواتە دەتوانین بڵێین دۆڕانی مرۆڤ لە سەرەتاییەوە دەست پێ دەكات و دۆڕانیش تەنها پارەنیە بەڵكو دۆڕانی مرۆڤ لەڕووی فكری و داب و نەریت و تواندنەوەی لە نێو كۆمەڵگا ئەوروپی و بیانیەكانی دی بە جۆرێك زۆر جار ناتوانی لێكیان جیابكەیتەوە ، لە هەندێ وڵات و سیاسەتی ئەو وڵاتە هەوڵی ئەوەدەدات ئەم شێوە توانەوەیە دروست بكات و یەكێك لەو وڵاتانەی كە ئێستا بەیاسای تایبەت كاری بۆدەكات ئەویش ئەڵمانیایە بەبیانووی ئەوەی ئەوانەی داوای ناسنامەی ئەم وڵاتە دەكەن دەبێ ئامادەی تەواویان هەبێ بۆ توانەوە و تێكەڵ بوونیان لە گەڵ كۆمەڵگای ئەڵمانیا بە بێ هیچ كێشەیەك و قبوڵ كردنی هەموو داب و نەریتەكان و

هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیان ، ئەمە وڵاتێك بەپێ ی بەرنامەی کاری خۆی بۆ پاراستنی بەرژەوەندیە نیشتمانیەکانی کاری بۆ دەکات بەڵام زۆر کورد هەن بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لەم یاساو هەنگاوانە بزانن ئەوان لەم گۆڕانەدا زۆر بەباشی گۆڕاوون و لەوانە بۆخۆیان هەست بەوە نەکەن.. کەس ناڵێت تۆ لەوڵاتێك دادەژی مەگۆڕێ.. چونکە بەدەستی ئەو مرۆڤە نیە ئەو گۆڕانکاریە خۆی دەسەپێنێ و دەبێ وەربگیرێ بەڵام دەتوانرێ لە ئاستیك دا ڕابگیرێ و داب و نەریتی کوردەواریش بپارێزرێ..

باری کۆمەڵایەتی و کێشەکانی لەم چەند ڕووە وە لەدەرگای کەسایەتی کورد دەدەن :

* لایەنی دەرونی و دوور کەوتنەوە و تەنهای و غەریبی و گۆڕینی جۆری ژیان و ڕەفتارکردن و جل وبەرگ و ئاخافتن و زۆری تر.

لەمەڕ هەرکێشەیەکی دەروونی دەشێ خۆ لەبەر جەستەکردنی هەر هۆکارێك بگرین.. لەوانە کەسایەتی کورد لەو ژیانە چەرمەسەریەی کە پێشترتێدا بووە لە جووتیارێکەوە تا کەسایەتیکی دەولەمەند و خاوەن سەروەت و سامان بەهەموو بەشەکانیەوە.. ئەم کەسایەتی یە ڕوو لەم وڵاتانە دەکات و ژیان و گوزەرانێك بۆ خۆی دابین دەکات لێرە دەوڵەمەند و فەقیر ، بەدەستەڵات و بێ دەستەڵات بەیەك ڕەفتارو بەیەك چاو سەیردەکرێت و زۆر جار هەژارەکان ژیانی باشترو مسەوگەرتریان دەبێت ، بەتایبەت ئەو شێوە بەرنامە کۆمەڵایەتیەی کە ژیانی هەموویەکێك بەبێ هیچ جیاوازیەکی ڕەگەزی یان چینایەتی دابین دەکات.. لەلایەکی دی تێکەڵ بوون واتە بەشێوەی ئاوێتەبوون کە لەم وڵاتانەدا تووشت دەبێت بەزۆر کەسایەتی سەیروو سەمەرەوە ئەگەر لەنەتەوایەتیەکی کوردیش نەبێت و هەندێ جار ئەو کەسایەتیە کوردەش دەکەوێتە ڕیزی ئەو کەسە سەیرو سەمەرانەوە ، کەواتە تێکەڵ بوونێکی لەو جۆرە هێندە ئاسان نیە و زۆر گرفت و کێشەی تایبەتی

خۆی بەدواوەیە . ئەویش لە زۆر شتدا لەوانە ئەوانەی کە کوردن و هاوزمـانی خـۆتن بەڵام وەك كەسایەتیەك هیچ دەربارەی ئەو کەسە نازانیت کەس و کاری ڕابردووی و ئاستی کۆمەڵایەتی و جۆرەها زانیاری دی کە زۆر پێویستن بۆ هەریەکێك بیانزانێت و ئەوکات لەسەربنەمای ئەو زانیاریانە دۆسـتایەتی خـۆی گـرێ بـدات.. لەلایـەکی دی ئەوانەی کە بیانین و بەهیچ شێوەیەك نایاناسین نازانین ئاین و ئاستی کۆمەڵایـەتی ، ڕەوشت و چۆنیەتی بیرکردنەوەی و ڕەفتارو جوڵانـەوەی ، شـێوازی جـل وبـەرگی و خواردن و زۆر شتی دی کە بەتەواوی پێچەوانەی ڕەوتی ژیانی ئێمەن...

کەواتە هەموو ئەم گرفـت و هۆکـارو بنەڕەتانـە کـە دێنـە پێـشمان یـان دێنـە پـێش کەسایەتی کورد کە دوو جۆرە یان شێوە کاریگەری دەکاتە سەر کەسایەتی کورد.. یاکاریگەریە باشەکان ئەو کەسایەتیانەن کـە سـودمەندەبن و لایـەنی بـاش و ڕێگـاو کردارە باشەکانی ژیان بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن و ئەگەر تاکەکـەس بێـت یـان خـاوەن خێزان ، بوارەکانی ژیان لەکارکردن و خوێندن و خۆپێکەوەنان و سوودوەرگرتن لەو تەکنەلۆجیا پێشەوتووە چ بۆ خۆی یان مندال و خێزان بێت.. چوونکە تەکنـەلۆجیا و زانیاریە زانـستیەکان لـەم وڵاتانـەدا هێنـدە خێـران و بـەزووی بڵاودەبنـەوە ئێمـە هێـشتا ئـەوەی بەدەسـتمان گەیـشتووە لێـی تێنەگەیـشتوین زانـستێکی دی بڵاودەبێتەوە بۆ یـەدەبێ بـەجۆرێك لەگـەڵ ئـەم زانـست و داهێنانـە سـەردەمیانەدا هەنگاو بنێین و هەوڵ بدەین بنەمایەك بۆ ژیانمان دروست بکەین .

لێرەدا هەن لەو کوردانەی ڕوو لەدەرگای زانست و زانیاری دەکـەن و هـەوڵ دەدەن لەم ڕێگایەوە بـەئاکامێك بگـەن و پاشـەڕۆژ لەکۆمـەڵگای خۆیانـدا ڕۆڵـی بەرچاویان هـەبێت . بـەم شـێوەی کـرداری بـاش و بۆچـوونی بـاش و تێکـەڵی و ئاوێتـەبوون لەنێوکۆمەڵگایەکی باش و بەسود بێ گومان کەسایەتێکی خزمەت گوزارو بەسود بۆ کۆمەڵگا دێتە ئاراوە .

کاریگەریـە خراپـەکان.. لـەم کۆمەڵگایانـەدا زۆر لایـەنی خـراپ هەیـە کـە ڕەنگـە کۆمەڵگایەك بەرەو لادان و هەڵدێربەرێ . لەوانە دەبینین گەنجی کورد یـان هەنـدێ کەسـایەتی کـامڵی خـاوەن خێـزانیش هــەن لـەجۆری جـل و بـەرگ گـۆڕانێکی تەواوبەخۆیاندا دەهێنن ، بەو پێیەی کە ئەم جل وبـەرگ و شـێوە گۆڕانکاریانـە لـە ماهیەت و ناوەڕۆکیان دەگۆڕێت و بەم شێوەیە دەبنە ئـەوروپی.. کـە زۆر جـار بـەم دیاردەیە دەگاتە ڕادەیـەك شـێوازو جـۆری وا سـەیر دەبیـنین کـە بەوپـەڕی بـڕواوە ئەوانەی بەخۆیان سەرچاوەو داهێنەری ئەم شێوەلادانەن بەو جۆرە ڕەفتارناکـەن و پۆشاکی وا ناپۆشن ، وەیان گوارە کردنە گوێ ملوانك و چەندین متوومووڕو پاشـان جۆری قژ بڕین بۆیاخ و سمێڵ و ڕیش تاشین و هێڵانەوەی بەشێوازی سەیر و لەگـەڵ برۆتاشین و جۆرەها پێڵاوی هەمە جۆری بابەتی کە بەم شـێوەیە ئەگـەر لەکـەس و کاریان بپرسین و قسەیان لەگەڵ بکرێت یان هەندێکیان بەبێ ئەوەی تـۆ هـیچ بـاس بکەیت ئەو باسـی جەربـەزەیی و بـوێری و کـارە سـەیرو سـەمەرەکانی کوڕەکانیـان بەشێوەیەکی گشتی یـان کـچەکانیان کـە مایـەی شـانازی و سـەروەریانە... ڕەنگـە هەبن ئەوانەی ئێستا بڵێن ئەوە مـاف ئاسـایی تاکـە کەسـە و بۆخـۆی خـاوەنی ئـەو بڕیارەیـە کـە چـۆن ژیـانی خـۆی هەڵبـژێرێ ، ڕاسـتە منـیش لەگـەڵ ئـەو مافـە کەسایەتیانەدام و هەموو کەسێك بەبێ ئەوەی کـەس دەسـت لـەکاروباری ژیانیـەوە بدات مافی خۆیەتی کە چۆن بژی و چـی بکـات بـەڵام ئـەم شـێوازە بیرکردنەوەیـەش هەموو کات ڕاست نیەو هەندێ جار دەبێتە گرفتێك کە ئەو هەڵەو لادان و کێشانەی لەئەنجامی ئەم جۆرە ڕفتارانە دێنە پێش مرۆڤ بـەو سـانایيە نـاتوانی چارەسـەریان بکات وەك چۆن ئێستا لە ئەوروپادا بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ ئەو هـەموو ئازادیـە کۆمەڵێك گرفتی کۆمەڵایەتی هەن کە خۆیان بەم شێوە بیردۆزانە بوونەتـە کۆسـپێك کە نەتوانن چارەسەری ئەو گرفتانەیان بکەن ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کۆمەڵگاکانیان بـەرەو هەڵدێردەچـن و بەهــەموو شـێوازێکی شارسـتانی و مـۆدێرن هــەوڵ دەدەن بـۆ

چارەسەرکردنیان بەلام چارەسەرکردنیان مەحاڵەو کارلەکارترازاوە.. کەواتە مەبەستی من ئەوەیە پەروەردەیەکی جوان وڕاست و دروست لەسەربنەمایەتی پتەو و کۆنکرێتی و لەگەڵ ئەوەشدا مافی کەسەیتی ئەو کەسە بپارێزرێت و هەموو سەربەستیەکی هەبێت بەم شێوەیە دەتوانی دڵنیابیت ئەو کەسە تووشی هەڵە نابێت و دەتوانێ بەرگەی هەموو گرفتەکانی ژیانی خۆی بکات.. ئەمە کۆمەڵێکی دیاری کراو لەگەڵ ئەوانەی کە زۆر بەپێچەوانەوە لە ئاست ڕووداوەکاندا حەپەساون و لەنێوان هەوڵ و کۆششی فێربوونی زانست و زانیاری و شارەزابوون و تێگەیشتن لە تەکنەلۆژیانی ئەمڕۆی سەردەم و لەنێو ئەو لادان و سەرلێشێواوویە دا ماون و ئاگایان لەهیچیان نیەو هەوڵی ژیان و بیرکردنەوەیان و هەڵپەیان بۆ کۆکردنەوەی پارەو کڕینی خانوو ئالتوون و سەیارەو جۆرەها بابەتی تری مادی کە تەنانەت ژیانی ماڵ و منداڵیشیان بەلاوە ناوە و ئاگایان لێ نیە و لەم شێوازانەش زۆرن و بەبەرچاوی هەموومانەوە ، لە هەرشارێك چەند دانەیەك لەمانەت بەرچاو دەکەوێ و زۆر کێشەی کۆمەلایەتی لای ئەم جۆرەکەسانە هەیە لەوانە جیابوونەوەی خێزانەکانیان و گرفتی بەرچاوی ئافرەت و منداڵەکانیان ، کە زۆر جار مرۆڤ بەتەواوی دڵگران دەبێت ، بۆیە دەڵێم هەموو کات مافی کەسایەتی و سەربەخۆبوونی خزمەت بە مرۆڤایەتی ناکات و بگرەگرفتیشی بۆ دروست دەکات...

لادان و سەرلێشێواوی.. بە هەر لاو سوچێکی ئەم دوونیایەدا بگەڕێت لادان و سەرلێشێواوی و دۆشداماں بەشێوەیەکی دیارو بەرچاو دەبینیت و لەهەندێ وولات وەك باو و مۆدێل ئەم دیاردەیە بەکاردەهێنرێت ، بەلام بۆ گەنجێکی ئەم وولاتانە جیاوازی زۆری هەیە لەگەڵ گەنجێکی کورد ئەگەر کوڕبێت یان کچ.. دەرەنجامەکانیش لەوەوە سەرهەڵدەدەن کە ئەم گەنجانە لەم وولاتانەدا هەموو پێداویستی و هەموو ئارەزوو و حەزەکانیان بە بێ هیچ بەربەستێك بەکاری دێنن و لە ئاستیکدا یان لەتەمەنێکی دیاری کراو دا کە هێشتا گەنجێکی ئێمە لە ولاتی

خۆماندا لە نهێنیەکانی نەگەیشتووە و هێشتا ناتوانێ باسیان لەسەربکات لێرە لە خواردنیشی بوونەتەوە و خەریکی حەوانەوەشن ، بۆیە لەو ئاست و تەمەنەدا تووشی ماندوو بوون و بێ تاقەتی و مەلەل و وەستان دەبن و نازانن چی بکەن یان ئەوەتا لە دەرەنجامی ئەو لادان و رێگا چەوتانەدا تووشی زۆر گرفت و لادانی تەواوەتی بوون لە سەر ڕەوتی بوون بوونیاندا ، بۆیە دەتوانین بڵێین ئاساییە بۆ ئەوان.. بەلام بۆ کەسێکی کورد کە تەمەنی لە نێوان ١٠ بۆ ١٨ ساڵ بووە و هەندێکی زۆریشیان لەوە زیاترو بە هۆی هێنانی ماڵ و منداڵ بۆ ئەورووپا و بەپێ ی ئەو یاسایەی کە دایك و باوك لە تەمەنێکی دیاری کراودا دەتوانن ئەو منداڵانەیان بێنن بۆیە ئەگەر تابیستیش بوویێت ئەوە کردوویەتی بە ١٤ یان ١٦ بەم پێیە زۆر لەو تەمەنانە ڕاست نین و بەم شێوەیە دەست کاری کراون و زۆر کێشەو گرفتی لەم شێوەیەش دروست بوون... بە بڕوای ئێوە دەبێ ئەو بەناوە منداڵانە ئەو ڕەفتارانە بکەن کە منداڵێکی ئەم وولاتە دەی کات ، ئەمە نەك کارە باشەکان بەڵکو ئەوەی کە خراپەو ئەوانەی کە لەلایەن ئەو کەسە زۆر خراپانەوە دەکرێت ئەوانە کۆپی دەکەنەوە و وەك ئەکتەرێکی سەرکەوتوو نمایشی دەکەن و کەس و کاریش شانازی پێوەدەکەن...کەواتە کێشەی دەرمان و بەکارهێنانی بە هەموو شێوەیەك یان کاسپی پێوەکردنی کە دیاردەیەکی زۆر باوە و تائێستا لە ئەڵمانیادا چەندین باندی کوردی گیراون ، ئەمەش کاریگەری خراپی بۆ سەر نەتەوەی کورد بەتایبەت ئەوانەی لەم وولاتەدا دەژین یان هەندێ ڕەفتاری دی وەك ئەوەی (هێرش) کە ئەو کابرا دەوڵەمەندە ئەڵمانیەی کوشت کە هۆکارەکەشی بابەتی ئەخلاقی و پارەبوو ، کەواتە ئەمانە دەرەنجامەکانی لادانن و پێویستە لە ئاستیاندا هەڵوەستە بکەین و کەمێك بەخۆماندا بچینەوە بۆ ئەوەی بنەمایەکی ڕاست و دروست بۆ خۆمان و ئەوانەی دەوروبەرمان دابڕێژینەوە ، تا خۆمان لەم شێوە کێشەو گرفتانە دور بخەینەوە..

بۆیە دەتوانم بڵێم گەنجی کورد زۆر کات نێچیرێکی سادەو ساویلکە بووە لە ئاست ئەو بازرگان و گەورە پیاوانەی کە ئەو بازارە بەڕێوەدەبەن و ئەوگەنجانەیان لەو گرفت و کێشانەوە ئالاندووە ، لە شیرازەو پەرەوازەیی خێزان و داب و نەریتەکانیان کردووە.. منداڵ و پاشەڕۆژی لاوان..... یەکێك لەبنەما سەرەکیەکانی کۆڵەکەی ژیان منداڵە و پاشەڕۆژو ئەو شێوە ژیانەیە کە بەبۆنەیەوە دەستەبەر دەکرێت یان تێدا دەژی . چونکە دروست بوونی پاشەڕۆژێکی گەش و ڕوون بۆ منداڵ دابین کردنی بنیادنانی کۆمەڵگایەکی مۆدێرن و پێشکەوتوو زانستی یە.. کەواتە ئێمەی کورد لەووڵاتانی ئەورووپی و ووڵاتانی دی بیانی لەلایەکەوە دڵخۆشین بەوەی منداڵی کورد کە منداڵەکانی خۆشمان دەگرنەوە لە وێزگەی زانستی و تەکنەلۆژیای پێشکەوتووانە جێگایەك یان ئایندەیەك بۆ هەریەك لەو منداڵ و گەنجە پێگەیشتوانەمان مسەوگەر بکەین و ئەمانە لە ئایندەیەکی نزیك دا ئەوەی لە نەوەی ئێمەدا بەدەست نەهات و نەتوانرا بەئەنجام بگەین بەڵکو ئەوان تەواوکەری بن و بەدواناکامی بگەیەنن و بەچاوێکی گەشبینانەوە لە دوورگەیەوە دەڕوانین... ئەمە وەك بیرو بۆچوونێکی سەرەتایی و بەشێوەیەکی دی بیرو بۆچونە مەبدەئیەکان واتە ئەوەی کە خواستە و بەهیوای بۆ بەدەست گەیاندنی بەڵام ڕاستی ژیان و ئەوبارودۆخەی کە بەڕاستی تێیدا دەژین وا ناڵێت یان وای نابینین.. ئەگەر هەبێت ئەوە ڕێژەکەی زۆر کەمە.. کەواتە ئەوەی لە ناوەڕۆك دا و لە نێو ئەم واقیعە تاڵەدا دەیبینین زۆر پێچەوانەیە و هەریەك لەئێمە چەندین نمونەی زیندوی لایە واتە هەریەك لەئێمە لەنزیکەوە چەند کەسێك لەم شێوازانە دەناسێت و دەیابینێت.. یان ئەوانەی بۆ خۆیان لەم شێوازە کێشانەدا دەژین و دان بەم گرفتانەدا دەنێن بەڵام چاریان ناچارە و هیچیان پێناکرێت..

ئەمە واقیعێکی زۆر تاڵ و ناخۆشە و ڕۆژگارو داهاتووەکانی نەوەکانمان زیاتر ڕاستی ئەم باسەمان دەسەلمێنن و بۆمان دەردەکەوێت کە کەسایەتی کورد دەگاتە چ

ئاستیك و دەرەنجامی پەروەردە بوون بە چی دەگات ، ئەوەی ئێمە دەمانەوێ و بۆی دەخوازین کە منداڵان و لاوانی کورد داهاتوویەکی گەش و پرشنگداریان هەبێت ؟ بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی لەهەموو بوارەکاندا دەبینین ئەو منداڵانەی کە لە خێزانە هەژار یان دەوڵەمەند پەروەردە دەبن لە چوار چێوەی ئەو ئاستە کۆمەڵایەتیەی کەتێیدا دەژین کاریان تێدەکات و پاشان فێربوون و پەروەردەی زۆر جیاواز لە پەروەردەی کوردستان و ئەو شێوە یاساو ڕێسایانەی ئەم وڵاتانە و چۆنیەتی ڕوانین لە سەرجەم بابەتە پەروەردەییەکان.. لەوانە زۆر نمونەی سادە کە لەناوەڕۆك دا کاریگەری تەواویان لەسەر فکری ئەو منداڵانە دەبێت ئەویش ئەوەی کە منداڵی لەسەر پەروەردەدەکرێت ئەوەیە کە منداڵ یان ئەولاوە هەستی بەوە کرد لەلایەن دایك و باوکەوە قسەی بەرزو نزمیان لەگەڵ کرا ئەوە بۆیان هەیە ئاگاداری پۆلیسی ئەو وڵاتەبکەن و بەم شێوەیە دێن بەهانایانەوە و زۆر لەم بابەتە کێشەی لێ دروست بووە نەك لەنێوان دایك و باوك و منداڵاندا بەڵکو لەنێوان ژن و مێردا ئەمەش ڕووی داوە... کەواتە هێزێك یان دەزگایەك هەیە پاڵپشتی ئەوە دەکات کە تاك بەویست و ئارەزووی خۆی ڕەفتاربکات و تۆ بۆت نیە ڕات تێیدا هەبێت... ئەمەش هۆکارێکی هەرەگرنگ و سەرەکیە بۆ لادان و چەواشەبوونی ئەو گەنجانە.. ڕەنگە شێوازەکان بەجۆرێك دەگۆڕێن واتە لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دی ئەم گرفتانەش لەوڵاتانی ئەورووپی و ئەمریکی و هەندێ وڵاتی دی پەیڕەوو دەکرێت و ئەوانیش لەنێوان خۆیاندا شێوازی کارکردن و ئەو جۆرە یاسایانەی کە کاروباری پەنابەری پێ بەڕێوەدەبرێ جیاوازی هەیە ، بەڵام لەناوەڕۆکدا هەموو یەك سەرچاوەن و یەك مەبەستیان هەیە.. ئەو پێکهاتەی کە وڵاتێکی وەك سوید جیاوازی لەگەڵ وڵاتێکی وەك ئەڵمانیا یان فەرەنسا یان ئیتالیا هەیە.. لەبەشەکانی داهاتوو باس لە گرفتە یاساییەکان دەکەم کە یاسای پەنابەری و ڕەفتاری ئەو

وولاتانە ئەوانیش هۆکارێکی ترن لە هێنانەکایەی گرفت و کێشە بۆ پەنابەری کورد...

لەوولاتێکی وەك سوید کە کەسایەتی کورد لە نزیکەی(٣٠) سی ساڵەوە کورد ئاشنایە بە پەنابەری لەم وولاتەدا هەرچەندە وولاتانی تری وەك ئەڵمانیاش یان هۆڵەندا و هەندێ وولاتی دی هەمان شێوە بەلاَم وولاتی سوید شێوەی ڕەفتارو یاساکانی کەمێك جیاوازترە ، بۆنمونە لەم وولاتەدا کاتێك پەنابەر داوای ماف پەنابەری دەکات و ئەو مافەی لە لایەن دەزگاپەیوەندارەکانەوە پێ دەدرێت گرفتی خانووبەرەو کڕینی شتومەك و پاشان دەبێ ئەو کەسە بەرەوکۆرسەکانی زمان بڕوات و چەند ساڵێك تا فێری زمان دەبێت.. ئەم شێوەیە دەبێت هۆکاری ئەوەی تێکەڵ بوون ئاوێتە بوون لەنێوان نەتەوەکاندا زیاترو خێراتربکات و کورد و کەسایەتیەکەی لە دابڕان و دوورەپەرێزی دەربازبکات و پاشان ئەمەش بۆ لەوانەی کە تەمەنیان گونجاوە یان بۆ خۆیان ئارەزووی خوێندن و فێربوون و بەردەوامی هەیە لەوانە زۆربەی ئەو پەنابەرانە خاوەن کارن و لە بەڕێوەبەرایەتیەکاندا کاربەدەستن و جێگایان دیارە و لەهەمان شێوەش دا وەك ووتمان هۆکارێکە بۆ خێرا ئاوێتەبوون و وەرگرتنی هەموو داب و نەریت و کاریگەری هەموو ئەوشتانە بۆ سەرژیانی کەسایەتی کورد خۆ ئەگەر ئەو کەسایەتیە لاوازبێت و توانای خۆڕاگیری نەبێت ئەوە کاریگەری خێراو ڕاستەوخۆی دەکرێتەسەر و بەوشێوەیە هەنگاو بەهەنگاو لادان و ونبوون دێتەئاراوە و شێوازی ژیان شێرازەکانی دەشێوێنێ بۆ ڕێژەی جیابوونەوەلەم وولاتەدا زیاترە لە چاو وولاتانی دی.

هەوڵی باشیش هەیە لەلایەن زۆر لەوانەی هەمیشە بەپەرۆشەوەن بۆ پاراستنی داب و نەریتە کوردەواریەکان و هەوڵدان لە زۆر ڕێگاوە لەوانە کردنەوەی قوتابخانەی فێربوونی زمانی کوردی لە زۆر لەشارەکاندا و هەندێ لەو خێزانانەی کە بەپێچەوانەی زۆر لەوانەی کە منداڵەکانیان هەمیشە لە ماڵەوە ئەگەر پێکەوە یان

لەگەڵ منداڵاتی تری کورد پێکەوە قسە بەزمانە بیانیەکان دەکەن و نامۆ دەبن بە زمانی کورد و زۆر جار دایك و باوك ماندەری ئەم کارەن. بەڵام هەشن وەك ووتم بەپێچەوانەوە هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدان ئەم دیاردەیە تەشەنە نەکات منداڵەکان تابکرێت بەزمانی دایك قسەبکەن و ئەمەش لە لایەن دەزگا پەروەردەییەکان و تەنانەت لە لایەن پزیشکانی منداڵانەوە هەمیشە لە سەرەتای زمانگرتنی منداڵدا داکۆکی لەسەر ئەوە دەکەن کە ئەم منداڵە پێویستە یەکەم جار زمانی دایك فێربێت و پاشان زمانی دووەمی کە زمانی ئەو وولاتەیە کەتێیدا دەژین فێربێت.. چوونکە بڕوایان وایە ئەو منداڵە ئەگەر بەتەواوی فێری زمانی دایك نەبێت ئەوە ناتوانێ فێری زمانی ئەو وولاتەش بێت و دواتر تووشی گرفت دەبێت..

تێکەڵ بوونی خێزان و کەسایەتی کورد و گرفتەکانیان و ئەو پەیوەندیانەی کە هەمیشە خۆیان لە گێرمەو کێشە و گرفتی سەیرو سەمەرەوە داوە و بگرە لەم وولاتانەدا بوونەتە هۆی جۆرەها ڕووداو و کارەساتی دڵ تەزێن و ناشیرین کە کاریگەری سلبی و خراپیان بۆسەر نەتەوەی کورد هەبووە ، زۆر لەو ڕووداوانەش بوونەتە گفتووگۆو بابەتی سەرەکی میدیاو کەناڵە بیانیەکان و لەراگەیاندنەکانی خۆشماندا هەندێکیان باس کراون.. ئەمانەش بەهۆی ئافرەت و چوونە دیسکۆو ئینتەرنێت و کاری دەرمان فرۆشی و بەکارهێنانی یان کاری قاچاخچیەتی و زۆر کاری تر کە زۆر بەیان دەگەڕێنەوە سەر ئەو هۆیەی کە پەیوەندیە هەڵەو کۆێرانەکان و بەکارهێنانی ئەو ڕەفتارانەی کە هەمیشە هەڵەن و بە کەسایەتی کورد نامۆن چوونکە لە وولاتانی خۆماندا هەمیشە ئەم کارانەمان نەك نەکردووە بەڵکو نەشمان دیون و لەوانەیە تەنها لە ڕێگای تەلەفزیۆنەکانەوە دیبێتمان ، بۆیە کە دەگەینە ئەم وولاتانە خێرا بەبێ بیرکردنەوە هانا بۆ ئەو شێوازە ژیانەی کە بەژیانی ئاسایی خۆمان نامۆیە دەبەین . ئەو پەیوەندیانەی کە هەمیشە دوور لە مەنتق و فکرەوە پەیرەودەکرێن و بێ هیچ بیرکردنەوەو تێڕوانینێك بۆ دواڕۆژ و

دەرەنجامەکانی و تەنها بیر کردنەوە لەحەزو ئارەزووەکان و شکاندنی ئەو تینویەتیەی کە هەمان بووە و ئەو ژیانە سەیرەی کە خەومان پێوە دەبینی و هەمیشە لە شاشەی تەلەفزیۆن و سینەماکانەوە دەمان بینی وامان دەزان ژیانی ئەم وولاتانەش ئەو شێوە فلیمانەن و تێیاندا دەبینە ئەکتەر ، بۆ لەنێو ئەم سەرکێشیە نامۆیانەدا گرفتاری و کێشەو وونبوون چاوەڕوانمانن و وەك دەریایەك دەبێ مەلەوانێکی شارەزاو بەتوانا و خاوەن ئەزموون بیت تا بتوانی خۆت و ئەوانەی کە ژیانیان بەتۆوە بەستراوە بە کەناری ئاسوودەی و ئارامیان بگەیەنی... لە بەشەکانی پێشوودا باسمان لە زۆر لایەن کرد کە هۆکارن بۆ هێنانەپێشی گرفت لەڕێی پەنابەردا کە زۆر جار هۆکارەکان دەگەڕێنەوە سەر ئەو پەنابەرەو هەندێ جار ئەو کۆمەڵگایەی کە تێیدا دەژی کەواتە دەمەوێ لێرەدا لە لایەنێکی گرنگترەوە لە سەکۆی ئەم باسەمان بدەین ئەویش دەسەڵات و ئەو یاسایانەی کە پەنابەریان لە چوارچێوەیەدا گرێ داوە و ئەو کەسایەتیە چاوەڕوانی ئەو چەند یاساو بەرنامە داڕێژراوانەیە کە دەبێ لەسەریان بڕوات و ئەوانەش دەبنە بنەمایەك بۆ دروست بوونی ئەو کەسایەتییە ئەگەر باش یان خراپ ئەگەر بەسوود یان بێ سوود کەواتە لە هەموو یاساو خواستەکانی پەنابەری کە کەسێك ڕوو لەوولاتێك دەکات دەبێ پابەندی داب و نەریت و یاساو ڕێساکانی ئەو وولاتە بێت و بەو پێوەرە ڕەفتار بکات.. کەسێك دێتە وولاتێکی وەك ئەڵمانیا و لە زەمەنێکی دیاری کراوا کە گرفتە سیاسیەکانی وولاتی خۆمان لە ئانوو ساتێکی نالەبارو خراپدان و لەم وولاتانەدا یاسایەك هەیە مافی پەنابەری دەدات بەوانەی کە بەهۆی باری نائارامی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی لەوولاتەکانی خۆیان هەڵدێن و ئەم وولاتانە بە پەنابەر دەیانناسن.. کەواتە ئەوەی لەو کاتانەدا هات و بەر ئەم لێشاوە کەوت بووە پەنابەر بەڵام دۆخەکان گۆڕان و شێوازی بیرو بۆچوونەکان بەرامبەر بەمەسەلەی عێراق گۆڕا بەتایبەت دوای پرۆسەی ئازادی و پێشتریش کە دەتوانم بڵێم لە ساڵی ١٩٩٧ وە

دەستی پێ کرد کە بارودۆخی پەنابەری کوردی عێراق لە وولاتێکی وەك ئەڵمانیا بەرەو خراپی هەنگاوی نا ئەوانەی بۆ چەند ساڵێك بێ هیچ وەڵامێك لە کەمپەکاندا دەمانەوە بێ کار و بێ پارە کەزۆرکەم بوو ئەو پارەی وەردەگیرا ، نەتوانینی سەفەرکردن لە سی کیلۆمەتر زیاتر و هۆرکاری دی و نەتوانینی خوێندن ، ئەمانە هۆکارێك بوون بۆ دروست بوونی گرفتی دەرونی زۆر لەوانەی خاوەن خێزان بوون هەندێکیان خێزانەکانیان لە کوردستان بوون هەندێکی تریان لە هەندەران بوون بەڵام ژیانەکە بەو شێوە سادەییە نەبوو ئەو مرۆڤە نەیدەتوانی وەك مرۆڤێك بژی.. نمونەی هەرە نزیك ئەو دوو کەسەی لەم کاتەدا خۆیان کوشتووە لەبەر ئەم کێشانە بووە. ولاتێکی وەك ئەڵمانیا کە یەکێکە لەو وولاتانەی کە نەتەوەی زۆر جیاوازی تێدایە بەپێ ئەو سەرژمێریانەی کە لە ساڵی ٢٠٠٥ کراون ، نزیکە ١٥,٣ ملیۆن کەس کە دەکاتە لە سەدا ١٥ی تێکڕای دانیشتوانی ئەڵمانیا ئەسڵیان دەگەڕێتەوە بۆسەر نەتەوەکانی تر . کە تێکڕای دانیشتوانی ئەڵمانیا ٨٢,٤ ملیۆن کەسە.. بەڵام ئەگەر بەوردی لە ژیانی ئەو ڕێژە زۆرەی ئەو دانیشتوانەی کە بەرەگەز ئەڵمان نین زۆر بەکەمی کەسێکت بەرچاو دەکەوێ کە لە نێو ئەم کۆمەڵگایەدا خاوەن پلەو پایەیەکی بەرزی سیاسی و ئیداری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی بێت لەگەڵ ئەو هەموو باس و خۆاسانەی کە لایەنە پەیوەندیدارەکانی ئەم وولاتە باسی لێوەدەکەن بۆ ئاوێتەبوونی بیانی لەگەڵ کۆمەڵگای ئەڵمانیدا بەڵام گرفت و ڕێگیریەکان لەو هەوڵ و ووتنانە زۆر گەورەترن و پێویستیان بەپێداچوونەوە هەیە بۆ دارشتنەوەی بەرنامە و پلانی دی تا پەنابەر وەك کەسایەتیەکی زیندوو لەم وولاتەدا دیاربێت و جێگاو ڕێگای خۆی هەبێت وەك کەسێك کە هاوبەشە لەژیان نەك وەك پەنابەرێکی سەر ڕەش و بێگانە و بەس.. ڕەنگە ئەو دەزگایانەی کە هەمیشە داکۆکی لەمافەکانی پەنابەری و مافەکانی مرۆڤ دەکەن هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدابوون ئەم شێوە گرفتانە بەرەو کۆتابەرن و هەوڵ بدەن شێوە پەیوەندیەك لە نێوان کۆمەڵگای

ئەڵمانی و کۆمەڵگاکانی دی کە لەم وڵاتەدا دەژین دروست بکرێت ، بەڵام وەك ووتن گرفت زۆرن.. لەوانە ئەو قوتابیانەی لەسەرەتای دەست پێکی خوێندنەوە دەست بە قۆناغەکانی خوێندن دەکەن گرفتەکان لەسەرەتای خوێندنەوە دەست پێدەکات کە ١٨,٧ ی ئەو خوێندکارە بیانیانە کە دەکاتە ٩,٩ ی لەسەدا ڕێژەی خوێندکارە ئەڵمانەکان لە قۆناغەکانی سەرەتای کە بە(هاوپت شوله) ( Hauptschule) دەناسرێت و ١٣,١ ی ئەو خوێنکارانە بەرەو قۆناغەکانی داهاتوو دەڕۆن کە بە قۆناغەگشتیەکان ناودەبرێت بە (گیزامت شوله) (Gesamtschule) دەناسرێت و تەنها ٤,١ ی سەرجەم ئەو خوێنکارانە بەرەو قۆناغەکانی ناوەندی سەردەکەون کە بە (گیمنازیۆم) ناودەبرێت( Gymnasium) کە بێگومان سەرکەوتنی ئەو کەسایەتیە و زامن کردنی پاشەڕۆژ وابەستەیە بە پلەکانی خوێندن و بەتایبەتی لەم ولاتانەدا ، ئەگەر بەوشێوەیە لە قۆناغەکانی سەرەتای کۆتای بەم کاروانە هات و ئەو کەسایەتیە لە(بیروف شوله) یەك خۆی دۆزیەوە واتە قوتابخانە میهەنیەکان و لەوێدا ئەگەر بۆی کراو سەرجاوە ئافرەت و کاری خراپە ڕێگای دا ئەوە تەواوی دەکات ئەگەر نا ئەوە هەر لەناوەڕاست دا بەجێی دێڵێ.. کەواتە ئاوێتەبوون و تێکەڵاوی نێو کۆمەڵگا چۆن دروست دەبێت ئەگەر تورك لە چایخانەو و دوکان و شوێنی تایبەت بەخۆی کۆبووە و کورد بەجیا و عەرەب و فارس و هیندی و پاکستانی و ئەفریقی و سینی و نەتەوەکانی تر هەریەك بەجیاو ئەڵمانیش بۆ خۆی لە کەنارێکی ترەوە کەواتە گرفت و کێشەکان بێ چارەسەر لەبەردەم پەنابەردا دەمێننەوە و یاساکانیش توانای چارەسەریان نابێ چوونکە بۆ خۆیان لایەنێکی هەرە گرنگن لە دروست بوونی ئەو کێشانەدا . کەواتە ژیان لە وڵاتێك وەك بێگانەیەك و کەسێکی غەریب و لە سووچێکدا بێ هاودەم.. گرفتێکی گەورەیە ، پاشان ئەو یاسا نوێیانەی کە ئەڵمانیا لەم نزیکانەدا دەریکردن و ئێستا لە زۆر

لەوولایەتەکاندا پەیڕەووی لەسەر دەکرێت ئەویش بەرنامەی ئاوێتە بوونی بیانیە لەگەڵ کۆمەڵگایی ئەڵمانیدا بەشێوەیەك کە چارەسەر نیە بۆ گرفتەکانی پەنابەر بەڵکو شێوە پارێزگاریەکە بۆ کۆمەڵگای ئەڵمانی و پاراستنی لە وونبوون بەدرێژای نەوەکانی داهاتوو چوونکە پێشتر ئەوانەی کە داوای وەرگرتنی ناسنامەی ئەڵمانیان دەکرد و ئەو بەڵگەنامانەی کە لێیان دەویست هەندێك کارو چەند پرسیارێك و پاشان کەمێك زمانی ئەڵمانی ، ئەمەش لەهەندێ جێگا دوای شەش ساڵ ئەو پەنابەرانە دەبوونە خاوەن ناسنامەی ئەم وولاتە.. بەلام دوای ئەم یاسای ئاوێتە بوونە لە نێو کۆمەڵگای ئەڵمانیدا . خۆی لەخۆیدا بڕیارێکی سیاسی و کۆمەلاتی یە چوونکە بەبێ ئەوەی لەناوەڕۆکی ئەو کەسایەتیە بکۆڵرێتەوە ئەم ناسنامەی وەردەگرت و بیر لەوە نەدەکرایەوە بیرو بۆچوونی ئەم کەسایەتیە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی ئەم وولاتەدا دەگوونجێ یان بەپێچەوانەوەن ، بۆ ئێستا شێوازی ڕەفتارو چۆنیەتی کارەکان گۆڕاون و ئەم کارەیان گران و سەخت ترکردووە و پێویستە ئەو کەسە بەو قۆناغانەدا تێپەڕبێت کە ئەم یاسایە داکۆکی لەسەر کردووە و بەتەواوی دڵنیابن ئەم کەسە لەگەڵ هەموو داب و نەریتەکانی ئەم وولاتەدا دەگونجێ و هەموویانی لاپەسەندەو دەتوانێ پەیڕەویان بکات و پاشان زمان و کارکردن و لێپێچینەوەی دی کە پێشتر نەدەکران.. کەواتە ئەم وولاتانەش شێوازەکانیان گۆڕیوە و ئەمانەش لەگەڵ هەموو ئەو مەرجە یاسایانەیان بەلام زۆر جار پەنابەر گیرۆدەی ئەم شێوە یاسایانەیە کە خزمەت بەمرۆڤایەتی ناکەن و کەسانی چاك و باش دەبنە نەوەکانی داهاتوو چوونکە پێشتر ئەوانەی کە داوای وەرگرتنی ناسنامەی ئەڵمانیان دەکرد و ئەو بەڵگەنامانەی کە لێیان دەویست هەندێك کارو چەند پرسیارێك و پاشان کەمێك زمانی ئەڵمانی و ئەمەش لەهەندێ جێگا دوای شەش ساڵ ئەو پەنابەرانە دەبوونە خاوەن ناسنامەی ئەم وولاتە.. بەلام دوای ئەم یاسای ئاوێتە بوونە لە نێو کۆمەڵگای ئەڵمانیدا . خۆی لەخۆیدا بڕیارێکی

سیاسی و کۆمەڵاتی یە چوونکە بەبێ ئەوەی لەناوەڕۆکی ئەو کەسایەتیە بکۆڵرێتەوە ئەم ناسنامەی وەردەگرت و بیر لەوە نەدەکرایەوە بیرو بۆچوونی ئەم کەسایەتیە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی ئەم وولاتەدا دەگوونجێ یان بەپێچەوانەوەن ، بۆ ئێستا شێوازی ڕەفتارو چۆنیەتی کارەکان گۆڕاون و ئەم کارەیان گران و سەخت ترکردووە و پێویستە ئەو کەسە بەو قۆناغانەدا تێپەڕبێت کە ئەم یاسایە داکۆکی لەسەر کردووە و بەتەواوی دڵنیابن ئەم کەسە لەگەڵ هەموو داب و نەریتەکانی ئەم وولاتەدا دەگونجێ و هەموویانی لاپەسەندەو دەتوانێ پەیڕەویان بکات و پاشان زمان و کارکردن و لێپێچینەوەی دی کە پێشتر نەدەکران.. کەواتە ئەم وولاتانەش شێوازەکانیان گۆڕیوە و ئەمانەش لەگەڵ هەموو ئەو مەرجە یاسایانەیان ، بەلاّم زۆر جار پەنابەر گیرۆدەی ئەم شێوە یاسایانەیە کە خزمەت بەمرۆڤایەتی ناکەن و کەسانی چاك و باش دەبنە گیرۆدەی ئەم شێوە کارە بیرۆکراتیانەو ژیانیان بەشێوەیەکی گشتی دەگۆڕێن و تووشی جۆرەها نەخۆشی و باری نائارامی دەروونی دەبن .. لێرەدا دەمەوێ خوێنەری بەڕێز ئەوانەی بەلایانەوە گرنگە لە ئێستای باری پەناری و گرفت و پێشهاتەکانی بگەن ئاگاداریان دەکەم دوای ئەوەی لە برگەکانی پێشووماندا کە سەرەتا بەبڕگەی قۆناغەکان دەستمان پێکرد و خۆی لەچوار بەشدا گرتەوە و پاشان برگەی هۆکارەکان کە خۆی لە سێ بەشدا بینیەوە و ئێستا برگەی گرفتەکان کە تێکڕا خۆی لە پێنج بەش دا و برگەکانی داهاتوو چەند زانیارێك سەبارەت بەچۆنیەتی پێشکەش کردنی داوای پەنابەری و یاساکانی پەنابەری لە وولاتێکی وەك ئەڵمانیادا و دواتر هەندەران لەمنبەری ڕاگەیاندن و میدیا کوردیەکانەوە و ئەو پەیوەندیە هاوبەشەی نێوان کوردەکانی دەرەوەی وولات و ناوەوەی وولات و دواتر خەونەکانی کەسایەتی کورد لە تاراوگە و ئایندەو پێشهاتەکانی و دواتر بە برگەیەکی کۆتایی لەسەر تێکڕای بابەتەکان و ئەنجامەکانیان لە ژیانی پەنابەری کەسایەتی کورد....

# ئافرەتی کورد و ژیانی پەنابەری

لەم برگەیەدا گرنگی و تایبەتی ئەوەمان بۆ پێش دێت کە ئافرەت و کچی کورد لەهەموو بوارەکاندا بەشێوەیەکی کارامەیی توانیویەتی رۆڵی دیارو بەرچاووی خۆی هەبێت ، رۆژگارێك ئافرەتی کورد وەك پێشمەرگەیەك لەسەنگەرەکاندا شان بەشانی پیاو لەخەبات و تێکۆشاندابوو و ژیانی چیاو لە سەرماو گەرماو ئاوارەبوون و بێدەرامەتی و پڕلەمەینەتی دا دەژیا تا رۆژێکی وەك ئەمرۆ بتوانێ لەسێبەری ئازادی و سەربەرزی دە ژیانێکی ئاسوودەو کامەران بەسەربەرێت ، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە لەهەموو ماف و خۆاستەکانی بێبەش بووەو بەردەوام هێرشی نارەوای کراوەتە سەر و مافەکانی نەپارێزراوبوون .

سەرەرای ئەو هەموو نەهامەتی و چەرمەسەرییەی کە ئافرەتی کورد لەنێو دۆخە گێژاوەی کۆمەڵگای کوردەواری دا بەسەری دا دەهات بەو کۆمەڵە کۆت و زنجیرەو دەسبەسەریەوە کەتێیدا ژیاوە و گەمارۆدراوە ، رەنگە لە هەندێ بواردا تا ئەمرۆشمان هەمان کێشە و گرفت بەردەوامیان هەبێ .

لەو گرفتانە نەبوونی ئازادی بۆ ئافرەت لەرووی رادەربرین و نیشانەکردنی هەست و سۆزی و گوێ لێنەگرتنی و دانی بەشوو بەبێ خواستی خۆی و ژن بەژن و گەورە بەبچوك و مارەبرینی لەبێشکەدا پاشان فرۆشتن و مامەڵە پێوەکردنی و زۆر کاری دی کە دەبنە سوکایەتی کردن بەئافرەت .

بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو کۆسپانەدا ئافرەتی کورد دەبینین لەهەموو بوارەکاندا چ سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و ئیداری و یاسایی و تەکنەلۆژی و جەماوەری و زانستی و پیشەی و پەروەردەی دا تارادەیك دیارن و بێ وچان کاردەکەن .

لێرەدا دەتوانم ئیشارەت بەوە بدەم کە ئافرەتی ئەمڕۆی کورد جیاوازە لە ئافرەتی سەردەمانی پێشوو مەبەست لەسەردەمانی پێشوو دەتوانم بیگەڕێنمەوە بۆ ١٠ تا ٢٠ ساڵی پێش ئێستا چونکە ئەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆمان ڕۆژگاری زانست و پێشکەوتن و تەکنەلۆژیاو داهێنان و خێراکاری و گۆڕان بەرەو ئاکامەکانی ژیان و دوورکەتنەوە لەدواکەوتن و نەخوێندەواری و نەزانی کە ئەم ڕێژەیەش بەو شێوە دڵخۆشکەریە نیە وەك ئافرەتانی کورد لە کوردستان لەگەڵ لاواز بوونی داب و نەریتە خێڵایەتیەکان کە بەڕێژەیەك کەم بوونەوەی زۆرداری باوك و پیاو لەگەڵ ئەوەی کە چەوساندنەوە و زۆرداری بەشێوەیەکی گشتی بوونی ماوە لەگەڵ دەست درێژی کردنە سەر ئافرەت .

کەواتە بەڕووبەڕووبونەوەی ئافرەتی کورد لەم دوونیایەی ئێستا پێویستە بوێرانە و بێ ترس بەرەنگاری ئەو گۆڕانکاریانە بێتەوە چونکە لەگەڵ ئەم هەموو گۆڕانکاریانەدا فکرو بیرو بۆچون و تێڕوانینەکان بۆ ژیانیش گۆڕاون جۆری پەروەردەکردن و تەشەنە سەندنی مێشك و بیری ئافرەتی کورد و تێڕوانین لە ئایندەو پاشەڕۆژ بەشێوازێکی نوێخوازانە هاتوەتە ئاراوە .

خۆ ئەگەر بەوردی لەژیان و گوزەرانی زۆربەی زۆری ئەو خێزانە کوردانەی هەندەران ورد بینەوە ئەوە کۆمەڵێك گرفت و کێشە دێنە پێش و هەریەك بەجۆرێك بەڵام هەموویان لەچەند خاڵێکی یەکساندا خۆیان دەگرنەوە.. لەوانە ناکۆکی نێوان ژن و پیاو ئەویش بۆ چەندین هۆکار دەگەڕێنەوە.. یان گرفتی منداڵ و گرفتی کەس و کار.. ئەم جۆرە کێشانەش هەر بەوو شێوە هەڵواسراویەوە دەمێنێتەوە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تەشەنەدەکات و چارەسەرناکرێن و کاتێك دێت کۆتایی بەئارامی دێت و ئەو خێزانە کۆتایی بەژیانی پێکەوە بوونیان دێت ئەگەر بەدوای هۆکارەکانی دا بگەڕێین بەشێوەیەکی گشتی چەند هۆکارێك هەن لەسەرجەم خاڵەکاندا خۆیان

دەگرنەوە ئـەویش ژیـانی پەنابـەری و دوور بـوون لـەووڵات و ئـاوارەبوون و غـەریبی خۆی بۆ خۆی گرفت و کێشەیەکەو چەند لایەنی تری لێدەبێتەوە .

لێرەدا لەو برِگەیەوە دەست پێدەکەین کە کێشەوگرفت لـەنێو ئـافرەتی کـورد و کۆمەڵگاکەیدا روو دەدەن لەهەنـدەران و هۆکـارو دەرەنجامـەکانی بـە هـەردوو لاوە دەست نیشانیان دەکەین..

لەزۆربەی کێشەو گرفتەکاندا دەتوانین بڵێین پیاو بەشێوەیەکی گشتی هۆکارێکە بـۆ دروست بوونی گرفت و هاندەرێکە لەتەشەنە سەندنی ، کەواتە مـەرج نیـە هەمیـشە ئـافرەت تاوانباربێـت چـونکە لادان و سەرلێـشێواویی لـەزۆر بـەی کاتەکانـدا دەگەرِێتەوە سەرشـانی پیـاو کـە نمونـەش بـۆ ئـەو جـۆرە پیاوانـە زۆرن و لـەژیانی ئاوارەبوون و دووری لە ووڵات و کەس و کارو ئەم جۆرە دیاردانە بـەدیار دەکـەون و ئەوکات دەزانرێت هەردوولا تاچەند دڵسۆزو خۆشەویستی یەکترن و تاچەند رادەیەك دەیانەوێ پێکەوە بەئاسوودەیی بژین و خێزانێکی بەختیار دروست بکەن..

لەچەند برِگەیەکەوە باس لەم خاڵە دەکەین.. سەرەتا دەمەوێ بـاس لەوەبکـەم کـە ئـافرەت و پیـاو لەهەنـدەران پێکـەوە دەتـوانن ژیـانی خۆیـان ئاسـودە بکـەن و ئایندەیەك بۆ منداڵەکانیان دروست بکەن و بەدەستی خۆشیان دەتـوانن ئـەو ژیانـە بکەنە دۆزەخ بۆ خۆیان و سـەرەتایەك بـۆ لادان و سـەرلێ شـێواویی منداڵـەکانیان دروسـت بکـەن ، بۆیـە لەلایـەنی پیـاوەوە سـەیری ئـەم گرفتانـە دەکـەین کەچـەند کاریگـەری لەسـەر ئـافرەت و منـداڵ هەیـە و دواتـریش لەروانگـەی ئافرەتـەوە لەمەسـەلەکە دەروانـین بـۆ هـەمان کاریگـەری و پاشـان منـداڵیش کـە کـچیش دەگرێتەوە..

- کاریگەری پیاوان لەهەندەران لەسەر دروست بوونی گرفت لە نێو خێزاندا و بوونە هۆی لادانی ئافرەت و تێکدانی ژیـان و ئـەو سـەرەتایەی کـە بەچـاوی ئێمـەی کوردەوە ئەو ئافرەتانە تاوانباردەکەین کـە لـە بنـەرِەت دا تاوانبـاریش نیـە، بـەڵکو

پاڵپێوەنەری یەکەم و ڕێگا خۆشکەر لێرەدا پیاوە.. ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوە :

١. ژن هێنانی پیاوان لە تەمەنێکی گەورەدا و ئەو جیاوازیە گەورەی لەنێوان ژن و پیاو دا کە زیاتر لە ١٥ بۆ ٢٠ ساڵ دەبێت. ئەو پیاوانەی لەتەمەنی ٢٥ بۆ سەروی ٤٠ساڵی و بەسەر بردنی تەمەنێکی زۆر لە هەندەران و بێ ژنی ئەمە وای کردووە ئەو پیاوە بەشێوەیەکی ترو جۆرێکی جیاواز لە کۆمەڵگای کوردەواری بیردەکاتەوە و ئەوەش گۆڕانێکە بەویستی مرۆڤ نیە و هەندێ جار بەبێ ئەوەی ئەو مرۆڤە هەست بەو گۆڕانکاریەبکات..

٢. هەندێ لەو پیاوانەی کە بەخۆیان لەهەندەران دەژین و پاش ماوەیەك بیر لەژن هێنان دەکەنەوە و هانا دەبەنەوە بۆ کوردستان بۆ ژنهێنان. زۆر بەڵێن و قسەی پێش داواکردن و مارە بڕین و چەندین بەڵێن و باس و خواستی پاش ژن هێنان و ژیانی هەندەران و خۆشگوزەرانی و سەفەرو گەڕان و پارەی زۆرو ئاڵتوون و بردن و ڕاکێشانی بۆ هەندەران بەزووترین کات کە ئەمە لای هەندێ لەو پیاوانە دەمان بینی زیاتر لە پێنج ساڵ و بگرە زۆر لەوە زیاتریش ئەوە ئەگەر ئەو پیاوە پێشتر خێزانی هەبوو بێت و لەوێ بەجێ هێشتبێ و ئەو سەردانانەی کە دەی کردنەوە چەند ساڵێك جارێك . ئەوەش لای هەندێ خێزان گەیشتە جیابوونەوە و گرفت لەدادگاو چەندین گرفتی خێزانی کە کەس و کاریشیان پێوە تووشی گرفت بوون . ئەو بەڵێنانەش بەو شێوەیە دەرناچن کە باسیان لێوە کراوە و ئەو بەهەشتەی لە بەرچاوی ئەو ئافرەتە دروست کرابوو بووە دۆزەخ و ژیانێکی تاڵ و ناخۆش.

٣. ئەو پەیوەندیانەی کە پیاوان پێش ئەوەی ژنەکانیان بگەنە لایان یان ئەوانەی کە ژنیان نەبووە و لەهەندەران پەیوەندیان بەئافرەتی تری بیانیەوە هەبووە و بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەگەڵیان ژیاون و هەندێ جاریش ئەو

پەیوەندیانە منداڵ بوونیشیان لێ کەوتۆتەوە و زۆربەی زۆری ئەو پەیوەندیانەش بەنهێنی دەمێننەوەو پاشان ئاشکرادەبن و گرفت دروست دەکەن .

٤. ئەو پیاوانەی کە هەمیشە بەدوای ئافرەت دا دەگەڕێن و کاری ناشیرین و نەگونجاو دەکەن و ئەوەش زیاتر ئەوانەی کە خاوەن ماڵ و منداڵ و زۆربەی کاتی خۆیان بەم کارانەوە بەسەردەبەن و هاتوو چۆی جێگای گومان لێ کراو دەکەن و تەنها مەبەستی یەکەمیان کاری جنسیی ناشەرعیانەیە .

٥. ئەو پیاوانەی بیر لەژنی دووەم و سێیەم دەکەنەوە ئەگەر لەهەندەرانیش بن . یان لەهەندەران دەگەڕێنەوە و ماڵ و منداڵ بەجێ دەهێڵن و دووبارە لەکوردستان ژنی دووەم دەهێنن یان بەپێچەوانەوە .

٦. ڕەزیلی و پارە سەرف نەکردن و تەنها بیرکردنەوە لە کۆکردنەوە و ناردنەوەی بۆ کوردستان بەبێ ئەوەی حساب بۆ ئافرەت و منداڵ و ژیانی هەندەرانی بکات و هیچ گۆڕانێك بەسەر ژیانی خۆیدا نەیەت .

٧. ئیش کردنی بەردەوامی پیاوان کە زیاتر لە ١٢ سەعات و مانەوەی بەردەوامی لەدەرەوەی ماڵ بەبێ ئەوەی ئاگای لەچۆنیەتی هەڵسوڕانی کاروباری ماڵ بێت.. ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارەگرنگانەی نەك تەنها لەکۆمەڵگای کوردەواری دەبێتە گرفتێکی گەورەی خێزان بەڵکو ئەو کۆمەڵگا بیانیانەش هەمان گرفت و کێشەیان هەیە و ئەمەش دەرگایەکە بۆ لادان و ڕووکردنە کاری خراپە و دەرەنجام جیابوونەوە کە ژیانی ئەم وڵاتانە بەرێژەیەکی زۆر بەدەست ئەم گرفتەوە دەناڵێت و وەك گرفتێکی دیارو بەرچاو هەموو کۆمەڵگامان بەدەستیەوە دەناڵن و کەسایەتی کورد لەهەندەران بەدەست هەمان گرفتەوە دەناڵێت .

٨. لەگەڵ گەڕان بەدوای ئافرەت دا هەمیشە دەرگای ئەو شوێنانە دەکەنەوە کە کاری لەش فرۆشی و ئەو ئافرەتانەی لەم کارانەوە نزیکن و پیاوان بەوە نامۆبوون و لادان دەبەن .

٩. گوێنەدانە منداڵ و ئافرەت و لێنەپرسینەوەیان و پشت گوێ خستنیان و نەچوون بەدەم داواو خواستەکانیانەوە .

١٠. ڕێگای قومارو خواردنەوەی مەشروب و وون بوونی و نەبوونی کارو و فێربوونی بەدەرمان .

- لێرەدا پێش ئەوەی بەشێوەیەکی وورتر بێینە نێو باسەکەوە ئەو خاڵە لاوازانەی ئافرەتیش نیشان دەدەین کە هۆکارن بۆ گرفت و لادان و چەواشەکاری .

١. گوێ نەدانە پیاو و منداڵ .

٢. بیرکردنەوە لەپارەو تەنها کارکردن .

٣. کارکردن لەهەندێ شوێن کە بۆ کۆمەڵگای کوردەواری گرانە و دەبێتە جێگای تانەو تەشەرەوە پاشانیش هۆکارێکە بۆ لادانی ئەو ئافرەتە واتە لەبارو دیسکۆ و هەندێ جێگای تری خراپ کە تا درەنگێانێکی شەو کاربکرێت .

٤. جگەرە کێشان و خواردنەوەی مەشروب بەشێوەیەکی ئاشکراو و ئەگەریش بەنهێنی بێت . ئەمە لە کۆمەڵگای ئێمەی کورد دوورە لەداب و نەریت و ڕەفتاری ڕەسەنایەتی و پاشانیش ئەم شێوە دیاردانە هەمیشە پاڵپێوەنەرن بۆ لادان و چوونە سەر ڕێگای کاری خراپە .

٥. دەرچوونی زۆرو هاوڕێیەتی هەموو کەسێك و پەیوەندیە زۆر و تێکەڵەکانی کە لەسنوری ئاسایی خۆیان دەردەچن و بەبێ جیاوازی لەگەڵ هەموو کەسێك یان پیاوێك بەبێ جیاوازی ، ئەمەش دووبارە کاریگەری سلبی تەواوی دەبێت لەژیان و گوزەرانی پەنابەرانی کورد لەهەندەران .

٦. لەبەر کردن و پۆشینی هەموو شێوە جل و بەرگێك کە هەندێ جار بەو بەرگ و پۆشاکانەی کە کوردەکان و ئافرەتی کورد لەهەندێ خێزاندا دەیپۆشن بیانیانەکان ئەو شێوە رەفتارانە ناکەن و مەبەستیش لەوەیە کە گوایە ئەم کەسایەتیە مۆدێرنە و رەنگ و رووی کەسایەتی ئەوروپی یان بیانی گرتووە وەك ئەوان رەفتاردەکات بەلآم ئەوە مانای ئەوە نیە کە ئەم کەسایەتیە لەرووی فکری و رۆشنبیریە کامڵ بوویێت بەلکو ئەوەی هەیە تەنها لەرووی جل وبەرك و لایەنی دەرەکیەوە و پاشانیش ئەوە دەبێتە کارێك کە ژیان و گوزەرانی خۆی بەرەو گۆڕانێك دەبات و رەنگە ئەو گۆڕانەش کاریگەری باشی بۆ ئایندەو داهاتووی نەبێت ، لەوانەشە لەناوەڕۆکەوە ئەو ئافرەتە خراپ نەبێت بەلآم ئەو شێوە جل وبەرگ و رەفتارانە بەچاوی دەورووبەری خراپ دەبێت ، ئەمەش بابەتێکە کە کراوەی ئافرەتی کورد و خێراتێکەڵ بوونی لەکۆمەڵگادا چەند کاریگەری خراپی دەبێتە سەر ئەو ئافرەتە و هۆکارەکانیشی چین ئەمە لەبڕەگانی دوای بەدوورو درێژی باسیان لێوەدەکەین ، ئەمەش ئەو ئافرەتانە دەگرێتەوە بەبێ جیاوازی ئەگەر خێزان داربن یان شوویان نەکردبێ. بۆیە لە هەمان روانگە بەدوو بەش لەم دیاردەیە باس دەکەین :

- ئەو کچانەی لەتەمەنێکی گەورەیدا هاتوونەتە هەندەران و هەست بەچاکی و خراپی دەکەن و رابردویەکیان لەژیانی کۆمەڵگای کوردەواری دا هەیە و شارەزان و بەخۆشی ناخۆشیەکانیەوە تێیدا ژیاون . ئەمانەش دەبنە دوو بڕەگە ئەوانەی ئەم ئازادی و ژیان و ئاسانکاریانە دەکەنە هەل بۆ فڕین و مەلەکردن لەم دونیایەدا و ئەوەی کە خواستی خۆیانە و ئەوەی چەند ساڵە لەو چوارچێوەیەدا لێی بێبەش بوون و نەیان توانیوە بەدەستی بێنن ئەوە ئەمڕۆ ئەنجامی دەدەن و ئەمەش دەکەنە هەلێك بۆ شکاندنی تینویەتی چەند ساڵەیان و بەچەندین هەڵەو هەڵدێریاندا دەبات و هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ نەشارەزای و چۆنیەتی رەفتارکردن و تێنەگەیشتن لە شێوەو ژیانی ئەم کۆمەڵگایانەوە و زوو تێکەوتن و پاشانیش

پەشـیمان بوونـەوەو هەنـدێ جـاریش بەتـەواوەتی دەبێتـە دەرگایـەك بـۆ لادان و ڕۆیشتن بەڕێگای چەوت دا . ئەوانەشی کـە دان بەخۆیانـدا دەگـرن و ئـەو ئـازادی و بەرفراوانیە كاریان تێناكات و بەوشێوەی كە پێشتر ژیاون دەمێننـەوەو كـاری ژیـان بەڕێوەدەبەن و لەو چوار چێوە خێزانیە ئاساییەدا دەمێننەوە وەك خۆیان .

- ئەوانەی كە هاتوونەتە ئەم وولاتانە لەتەمـەنێكی منـداڵی و هـێچ هەسـت و بیرەوەری یادگاریەكیان لەگەڵ خۆیاندا نەهێناوە و ئەوەی كە لەبیریان نەبێت ژیـان و گوزەرانی وولاتانی خۆمانە ، یان ئەوانەی كە لێرە لـەدایك بـوون و لەگـەڵ ژیـان و گـوزەران و پـەروەردەو فێركردنـی ئـەم وولاتانـە پـەروەردە دەبـن و ئەوەنـدی كـە سەیری دایك و باوك و خوشك و براكانیان دەكەن تاچـەند ژیـانی هەنـدەران گـۆڕانی بەسەر ئەواندا هێناوە و تاچەند ماوە دەدەن بۆ گۆڕانكاری و تاچەند ڕێگا بەهـەموو شتێك دەدەن كە ئاینده دەبێتە ئاكامێكی خراپ و ژیانی منداڵەكانیان ، زۆر خێـزان بـەناوی ئـازادی و گەنجیـەتی و و زۆری نـاو نـاتۆرەی تـرەوە بەدەسـتی خۆیـان منداڵەكانیان بەوە ڕێگای خراپەكاریی و لادان دەبەن و دواتریش هەست بەوە دەكەن كە كارلەكار ترازاوەو ڕاستكردنەوەی ئەو هەڵەیە مەحاڵە و دەرەنجامەكەی لەدەست دانی منداڵەكانیانە چونكە لەم وولاتانـەدا یاسـاو دەسـەڵات پێـشتگیری لـە منـداڵ و ئافرەت دەكات و ئەمەش هۆكارێكە هەمیشە پـاڵ بـەئافرەت و منداڵـەوە دەنـێ كـە خراپە بكات و ئەوەی بەویست و خواستی خۆیەتی ئەنجامی بدات چونكە مەرج نیـە هەموو خواستە كان خواستی باش و بەسوود بن. یا خواستی ئاییندەی بن .

# ئازادی و کراوەیی ئافرەت و دەرگایەك بۆلادان و شێوانی خووڕەوشت

گرفت و ترس لە داهێنانە ترسناك و خێراكانی سەردەمەوە یان لە گرژی و ئاڵۆزی بارودۆخ و نائارامیەوەیە . بەڵكو كەسایەتیەكان چ ئافرەت بن یان پیاو لە زۆری ئەو بیرو ڕاو لێكۆڵینەوە جیاوازو خێرایانەی كە دوابەدوای یەك یەكتر دەسڕنەوە بەبێ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ چاك لەخراپ جیابكاتەوە و باشەو چاكە لە خراپ و گەندەڵ لێك بكاتەوە . ئەمەش زیاتر لەو كۆمەڵگایانەدا كاریگەری دەبێ كە كۆمەڵگایەكی نەخوێندەوار یان ئەو كۆمەڵگایانەی كە پرەنسیپ و داب و نەریتە كۆنەكان تائێستا كاریگەری تەواویان هەیە.

كەواتە بنەما سەرەكیەكانی هەركۆمەڵگایەك كە دەتوانێ ئایندەیكی گەش و ڕوناكی بۆ دیاربكرێ لەو ڕووانگەیەوە ڕێچكە دەگرێ كە ئاستی پەروەردەو فێركردن لە بەرزترین ئاستەكانیدا بێت بەلام بەشێویەك كە بنەما مرۆڤایەتیەكان پابەند بكات و یەكسانی نێوان ئافرەت و پیاو پارێزراو بێت . پەیوەندیە ڕۆحیەكان و باوەڕ بەیەكتربوون فاكتەرێكی تری گرنگە بۆ پێكەوە ژیان . چونكە جیاوازی ئەو شێوە ئازادیە لە ژیانی ئێستاماندا زۆر لەو شێوە ژیانەی كە لە زەمەنی باوك سالاری یان پیاو سالاری دا ئافرەت ژیانی بەسەر بردووە ، ئەمەو چەندین نەوە لە ژێر باری ئەم شێوە سیستەم و زۆرداریەدا ژیاوە چ ئافرەت یان منداڵ لەو ئازادیە بێبەش بوون . لەهەمان كات لەگەڵ بوونی ئەو زۆرداریەی باوكان بە بیرو فكرو تێڕوانینانەی خۆیان لەو سەردەمانەدا بڕوایان ئاوا بووە كە پاراستنی نامووس و شەرەفیان لەم ڕێگایەوە بۆ مسۆگەربووە ، ئەو ئافرەتە لەو كۆمەڵگایەدا كە ئازادی و كراوەیی و زانستی بەلاوە لادانە لە خووڕەوشت و خراپی و جۆرەها ناو ناتۆرەی دی كە تا ئەمڕۆش ئەم گرفتە لامان ماوە زۆر لەپیاوان بەتەنها بینینی ئافرەتێك لەگەڵ

پیاوێکی دی تەنها بۆ گفتووگۆیەکی ئاسایی بەهەزارەها ناو ناتۆرە دەنرێتە پاڵ ئەو ئافرەتـە . ئـەوەش نیـشانەی نەخۆشـی ئـەو کەسـەیە ئەگـەر دەرونـی بێـت یـان دووربوونی لەئافرەت بەهۆی ئەو کۆت و بەندە کوردەواریانەی کـە هـەن بـۆ تێکـەڵ نەبوونی ئەو ڕەگەزە مەرج نیە ئەو تێکەڵ بوونە بەوە بـەراورد بکـرێ تـەنها لایـەنی جـنس بێـت ، چـونکە زۆر لـەو بـیرو فکرانـە لـەوە زیـاتر هـیچ لـە مانـای ئـافرەت نەگەیشتوون .

ئازادی چ لەفکرو بیرو بۆچوون و شێوازی ڕەفتـارو و بڕەنـسیپە بنەڕەتیـەکانی ئـەم ژیانە لە وولاتێك بـۆ وولاتێـك و کۆمەڵگایـەك بـۆ کۆمەڵگایـەکی تـر جیـاوازی هەیـە سەرەڕای ئەوەی یاساکانی ماڧی مرۆڤ و ئەو ڕێکخراو لایەنە بەرپرسـانەی کـە هـەوڵی بەرقەراربوونی ئازادی و یەکسانی نێوان مرۆڤـەکان بەهـەردوو ڕەگـەزەوە سـەرەڕای یاسـاکانی نەتەوەیـەکگرتووەکان و ئـەو ڕاسـپاردانەی لـەم بارەیـەوە هـەن و ئـەو داکۆکی کردننانەی دەکرێن لەپاراستنی مافەکانی ئافرەتـان . بەشـێوەیەکی گـشتی ئەو بەراوردەی کە ئەمڕۆ لەنێوان دوو کۆمەڵگادابکرێت ئـەویش کۆمـەڵگای ڕۆژئـاو و کۆمـەڵگای ڕۆژهـەڵات . ئـەو یاسـایانەی کـە لـەم دوو لایەنـەوە بـەدی دەکرێـت زۆر جیاوازی هەیە لەلایەك بوونی ئازادیەکی یەکجار زۆر کە لادان و شێواندنی شـیرازەی پێکەوەژیان و پەیوەندیە بنەڕەتیەکانی نێوان ئـەم دوو ڕەگـەزەی پـچڕاندووە واتـە لەگەڵ بوونی یەکسانی و هـەموو مافـەکانی ئـافرەت و بەوشـێوە بەرفراوانیـەی کـە هەمیشە یاسای ئەم دەوڵەتانـە پـشتی ئـافرەت دەگـرن و پلـەی ئـافرەت و منـداڵ لـەپێش پیـاوەوەن . لەگـەڵ ئـەوەش دا دەسـت درێـژی بـۆ سـەر ئافرەتـان هـەر بەردەوامەو بوونی هەیـە بـەڵام بەڕێژەیـەکی کـەم ، کەواتـە ئافرەتێـك لـە وولاتـانی ڕۆژئاوا هەموو دەرگایەکی خوێندن و فێرکـاری بـۆ کراوەیـە پەیوەندیـەکانی لەگـەڵ ڕەگەزی پیاو سنوردارنیە تەنها لەو کاتانەی کە بەویستی خۆی سنوریان بۆ دابنێـت ، واتە ئەو ئافرەتە دەتوانێ ڕێچکەی ژیانی خـۆی بـەو شـێوەی کـە خـۆی دەیـەوێ

دابینێ ، بوونی هەموو ئەو زانست و تەکنەلۆژیاو پێشکەتن و ئاسانکاریانەی لەم دوونیایەدا هەیە لەگەڵ ئەوەی کە هۆکارێکن بۆ ووشیاربوونی مرۆڤ و فێربوونی زانست و زانیاری و رۆشنبیربوونی لەهەمان کات دا ئەم زانست و پێشکەوتنە تەکنەلۆژیایە هۆکارێکە بۆ لادان وخراپەو دەست درێژی کردنە سەر یەکتر و ئەو ئازادیەی کە ئازادی بدات بەوەی کە پیاو لەگەڵ پیاو جووت بوونی رێگای پێبدرێت و لەهەندێ دەوولەت مارەبڕینی فەرمی لەنێوانیاندا هەبێت یان ئافرەت لەگەڵ ئافرەت کە ئەمڕۆ مەسەلەیەکی بەربڵاوەو لەپەرەسەندنداپە و لەهەمان کات لەش فرۆشی ئافرەت وەك پێشەیەك رەفتاری لەگەڵ دەکرێت واتە وەك هەموو ئەو کارەپێشەییانەی تر مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت دەناسرێت و بەئازادی کاری پێدەکرێت و راگەیاندنەکانیش دەوری هەرە گرنگ و بەرچاویان لەم مەسەلەیەدا هەیە و بەم هۆیەشەوە بە ملیۆنەها دۆلار لەم رێگایەدا سەرف دەکرێت و قازانجی لێدەکرێت و ئەوەی کە زەرەرمەندبێت و سووکایەتی پێبکرێت ئافرەتە . ئەمە وەك لایەنی فەرمی و یاسایی، کە کۆمەڵگاش خاوەن یاسا و رێسای خۆیەتی مەرج نیە ئەوەی یاسای دەوڵەت بێت کۆمەڵگا یەك بەیەك ووشەکانی پەیرەووی دەکات بەهەزارەها یاسا و رێسامان هەن نەك پەیرەویان ناکەین بەڵکو ئاگاشمان لێیان نیە. کۆمەڵگاکانی رۆژئاوا بەپشت ئەستووری ئەو یاسایانەوە رێچکەیەکی تایبەت بەخۆیان دروست کردووە بەجۆرێك لەگەل یاساکاندا ئاوێتە بوون و لێك جیابوونەوەیان ناکرێت ، ئەمەش بەدرێژای چەندین سەدە دوای گۆڕینی جۆرەها قۆناغ و تێپەربوون بەزۆر کۆسپ و تەگەرەو گرفت دا چونکە ئەمەش بەو ئاسانیە نەهاتووەتە دی ، واتە ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین لەشەو و رۆژێك دا دروست نەبووە. کۆمەڵگایەك ئازادی و کراوەی بەلایەوە سادەترین شێوازی پەیرەوکردنی ئەم ژیانەی بێت ، بەڵام کۆمەڵگای ئێمە بەپێچەوانەوە لەگەڵ هەموو ئەو مێژوو راستیە بەرچاوانەی کە نەك لەروانگەی کۆمەڵگاکەی خۆمانەوە دیومانە بەڵکو لە سەرجەم

کۆمەڵگاکانی تری ئەم دوونیایە لەپێش چاومانن و ئەوەی ئەوان بەچەندین ساڵ پێیگەیشتوون ئێمە دەتوانین بەسود وەرگرتن لە تاقیکردنەوەکانی ئەوان و وەرگرتنی لایەنی باش و بەسوود بۆ بەرەوپێشەوە بردنی کۆمەڵگاکەمان سوودی لێ وەرگرین..

وەك ووتم ئازادی لای ئێمە مانایەکی ترو چێژێکی تری هەیە لەڕوانگەیەکی ترەوە لە ووشەی ئازادی و یەکسانی دەڕوانین ، لەگەڵ ئەو یاسا و ڕێسایانەی کە لەگەڵ ئەم ڕۆژگارەی ژیاندا ناگونجێن و دەبنە ڕێگر لەبەردەم زۆر لەو پرەنسیپە ئازدیانەی کە داوایان دەکەین و هەمیشە پەردەیەك لەنێوان ئافرەت و پیاودا دروست دەکەن و هەرکات ئافرەت ویستی هەناسەیەکی ئازادی هەڵمژێ سەدان شمشێری جەرگ بڕ لەکیفەکانیانەوە دێنەدەروو ملی ئەو ئافرەتە دەپەڕێنن ، ئەو شمشێرانەش مەرج نیە سەر لەلاشە جیابکەنەوە بەڵام دڵ بریندار دەکەن و ناموس لەکەدار دەبی ، بەوشێوەی کە پەڵەیەك لەنێوچەوانی ئەو ئافرەتە دەدرێ تەنها بەوەی کەسێکە کراوەیە و دەیەوێ ئازاد بێت و دەیەوێ بیرو ڕاو بۆچوونەکانی وەرگیرێ ، دەیەوێ یەکسانی هەبێت و تەبایی بەرقەراربێت ڕێزوو ئیحترام و بەچاوی گەورەییەوە سەیربکرێت ، غەدرو دەست درێژی نەکرێتە سەری و بەئازادی هاوسەرو ئەوەی کە خۆی خۆشی دەوێ هەڵی بژاردووە پێی بگات بەڵام سزای کوشتن و خۆسووتاندن لای ئافرەتی ئێمە باوێکە بەمەبەستی خۆدەربازکردن لەم ژیانە ئەوەش تەنها ڕێگا چارە نیە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان و پێویستە بەشێوەیەکی سەردەمیانە لەو مەسەلانە بڕوانرێت و هۆکارەکانیان بزانرێت و لێکۆڵینەوەی زانستی و پزیشکیان لەسەربکرێت و ڕێگا چارەی پێویست بۆ بن بڕکردنی ئەم شێوە دیاردانە دابنرێت و ووشیارکردنەوە وبەئاگاهێنانەوەی ئافرەتان لەوەی کە ڕێگا چارەی دی هەن و کەسانێك هەن ئەو گرفتانەیان بێ ترس بۆ چارەسەر دەکەن تا ئەو کۆمەڵگا بەوشێوەیە پەروەردەبکرێت دیاردەی لەم چەشنە دووبارە نەبێتەوە چونکە

کۆمەڵگا خۆی بەرپرەسە لەدروست کردنیان و خولقاندنی ئەو شێوە گرفتانەوەو دەبێ ئەمەش بەشۆڕشێکی رۆشنبیری چارەسەربکرێت .

کەواتە زانیمان لادان لەو وولاتانەی جیاوازن لە شێوە ژیانی ئێمە زانست و پێشکەوتن و تەکنەلۆژیاکەیانە دەرگایەکی بۆ کردوونەتەوە کە بەرەو لادانیان بەرێت و هەندێ جاریش ئەوە بەبڕوای ئەوان لادان نیە. چونکە داب و نەریتی ئەوان لەسەر ئەو شێوازە پێکەوە ژیانە دروست بووە ، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار رووداوی دڵتەزێن دروست دەبن و هەمیشە هەواڵی ئەوە دەبستین ئەو کچە فرێنراو دەست درێژی سێکسی کراوەتە سەرو دواتریش کوژاوە ، یان دوای ماوەیەك دەدۆزرێتەوە ، ئەم شێوە سیناریۆیانە هەمیشە دووبارە دەبنەوە .

لە کۆمەڵگای ئێمەدا کێ بەرپرسە لەلادان ئەگەر ئافرەت بێت یان پیاو چونکە ئەنجام دانی کارێك بەپێچەوانەی یاسا و داب و نەریت ئەوە بۆخۆی لادانە و هەر لادانێکیش لەهەر لایەکەوە بێت ئەوە کاریگەری بۆ سەرلاکەی دی دەبێت . ئەگەر پیاو لادەربێت بێگومان سەرئەنجامی لادانەکەی ئافرەت زەرەرمەند دەبێت یان بەپێچەوانەوە . چین ئەوانەی دەبنە هۆکارێك بۆ لادان.. خوێندنگا یان ماڵ و دەوروبەر یان شوێنی کار و یان لەدەرگای راگەیاندن و پێشکەوتنە تەکنەلۆژیەکان و ئەو زانست و یاسایانەی کە پشت گیری لەئافرەت دەکەن..؟

زۆر کات ئەو لادانە بوونی نیە واتە ئەو ئافرەتە تەنها بەقسەو قسەلۆکی کەسانی نەفام و نەخۆش و دڵرەق دەبنە هۆیەك کە گرفتی کۆمەڵایەتی بۆ ئەو ئافرەتە دروست دەکات . سادەیی ئافرەت و باوەڕکردن بەپیاو لە زۆر کاتدا بەبێ ئەوەی لەنیەت و خواستی پاکی ئەو پیاوە بەتەواوی شارەزابێت ، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ دڵ پاکی و خۆشەویستی و باوەڕپێکردن لای ئافرەتان زۆر بەرێژەیەکی زیاترو بەرچاوتر بەدیار دەکەوێ لەوەی لای پیاوە . گرفت و کێشەکانی نێو ماڵ واتە زوڵم زۆری خێزان بەهەموو لایەکەوە کاریگەری راستەوخۆی دەبێ لەوەی کە لادان

دروست بکات ئەگەر بەنەشارەزای بێت یان بەویستی ئەو کەسەبێت . واتە ڕەفتارو چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ کچان و جیاوازی نەکردن لەنێوان کوڕەکاندا و بەیەك چاو سەیرکردن و باوەڕوو متمانە پێیان و ڕێگادان بەوەی کە بەرپرسیاریەت وەرگرتن لەزۆر کاردا وەك کوڕێك تا بتوانێ لە ئاستەنگ و گرفت دا پشت بەخۆی ببەستێ و بتوانێ لایەنی باشە و خراپە لێك جوودا بکاتەوە و دۆست و دوژمنی خۆی بناسێ . هاوڕێیەتی لەنێوان کوڕان و کچان پێویستە پەرەی پێبدرێت و بنەمایەکی پاك و ڕاست و دروستی بۆ دابنرێت و پەیوەندیەکی پراکتیکیانە دروست بکرێت لەسەر بنەمای ڕێزگرتن و پێکەوە کارکردن .

بڕوا بەخۆبوونی ئافرەتی کورد و نەترسان لە دەمی کۆمەڵگا واتە ئەوانەی پێچەوانەی ئازادین ئەوانەی دژ بە پێشکەوتن و گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگان ئەوانەی هەمیشە سیستەم و یاساکانی هەزارەها ساڵ لەمەو پێش پەیڕەو دەکەن و بڕوایان بەگۆڕانکاری نیە. هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان و تواندنەوەی هەموو ئەو بەربەست و کۆسپانەی دێنە ڕێگا بەهاوکاری پیاو تا دەرگای ڕۆشنبیری و کراوەیی ئافرەت لە فکرو بیری لادان و بەدڕەوشتی و خراپەکاری و ناو ناتۆرەلێنان دابخرێت و دەرگای پێکەوە ژیان بێ جیاوازی و ئاوێتەبوون لە کۆمەڵگایەکدا کەگرفتەکان لەم شێوازەی ئێستاماندا بێنەدەرو ئافرەتیش لەو کۆت زنجیرو زیندانە دەربێت و شان بەشانی ئەوانەی ئەمڕۆ لەمەیدان دا خەبات دەکەن و بێ وچان لەهەوڵی ئازادی و دەرکەوتنی ئافرەتاندا خزمەت دەکەن و پێویستە دەست خۆشیان لێبکرێت و هانبدرێن تا ئەوانە ببنە بنەمایەك بۆ نەوەکانی داهاتوو تا کۆمەڵگا یەکی یەکسان و ئاوێتە بووە دروست ببێ . لەم گرفتەشدا بەشێوەیەکی گشتی هەردوو ئافرەتی کە ژیانی ئاوارەی و هەندەرانیان هەڵبژاردووە یان ئەوانەی کە لەکوردستان دا دەژین چونکە پەیوەندیەکان هەمیشە لەنێوانیان دا بەبەردەوامی بوونی هەیە و دواتریش کاریگەریەکانی بەشێوەیەکی هاوبەش کاردەکاتە سەریان .

# ئافرەتی ئەمڕۆ و گرفتەکانی کۆمەڵگاو بەرەنگاربوونەوەی

ئێمەی کورد هەمیشە لە دێرزەمانەوە و بەپێ ی ئەو ڕاستیە مێژوویانەی کە هەن ، ئافرەتی کورد لە نێوان دوو تەوەری جیاوازوو لەیەك نەچوودا پێوانە کراوە لەنێوان ئازایەتی و خانەدانی و ژیری و قارەمانی و و خۆنەویستی و شان بەشانی پیاو لەهەموو گرفت و مەینەتی و دەردەسەریەکانی کە بەدرێژای ئەم مێژووە کورد لێیان بێ بەش نەبووە ، ئەوی دی ئافرەتێکی نەخوێندەوارو چەوساوەو هەمیشە ژێردەست و لاوازو ترسانی لەوەی کە داوای مافەکانی خۆی بکات ، کەواتە ئافرەتی کورد سەرەڕای هەموو ئەو مەینەتی و بارەدەروونیە سەختەی کە لەلایەك کۆمەڵگا و لەلایەکی دی ئەو خێزان و کەسایەتیانەی کە لەگەڵیان ژیاوە ئەگەر ماڵی باوك بێت یان ماڵی مێرد و ژیانی هاوسەری ، کە دووبارە گرفتەکان لێرەدا بۆخۆیان جیاوازو و هەریەکەیان بەپێ ئەو دۆخوو شێوە ژیانەی کە تێیدابووە و کاریگەری دەوروبەر لەسەرە.. کەواتە جیاوازیەك لە نێوان ئافرەتی دوێنێ و ئافرەتی ئەمڕۆ هەیە. ئافرەتی دوێنێ لە زەمەنێکی دواکەوتوو و نەخوێندەوارو و کوێر لە هەموو بیرو فکرێکی کراوە . ژیانێك کە ئافرەت وەك کۆیلەیەك ڕەفتارو کاری لەگەڵ کراوە و ئەوەندی لەسەری بووە منداڵ و ماڵ و خزمەتکاری پیاو دابین کردنی هەموو حەزو ئارەزووەکانی ولەگەڵ ئەوانەی بەدەورو بەری پیاوە وە بوون بۆیە دەڵێم سەیرە لەگەڵ ئەو هەموو هۆنراوە و گۆرانی و پیاهەڵدان بەشانوو باڵ وبەرزی بالاو ئەگریچەو خاڵ و جۆرەها ووشەی تری جوانی کە سیمایەك بۆ ئافرەت لەخەیاڵی پیاودا دروست کراوە بەبێ ئەوەی لە سەرمەیدانی پیادەکردن پەیڕەوی لەسەر ووشە و خەونوو خەیاڵەکانی خۆی بکات .

کەواتــە لــەکۆت بــوونی ئــافرەتی کــورد بەدەســتی پیــاوەوە زەبرێکــی گــورزینی بەهێزبووە لە توخمی مێینەی کورد دراوە.. لەولاشەوە پیاویش لە کەم فکری و ئەو کۆتە داسەپاوانەی بەدرێـژایی مێـژوو لـەژێر زۆر نـاو نـاتۆرەو بیـانودا وایـان لـەپیاو کردوە بەم شێوەیە سـەیری ئـافرەت بکـات و ڕەفتـاری لەگـەڵ بکـات.. ئەمـە ئـەو سەردەمانەی کە زانیمان زانست و زانیاری و ڕۆشنبیری و فکربڵاوی وەك سـەردەمی ئەمرۆ نەبوو بەڵام وەختێك بەوردی لە جیاوازی ئەم دوو ئافرەتـەی دوێنـێ و ئـەمرۆ دەدەین دەبینین تەنها گۆڕانێك بەسـەری دا هـاتبێ و بەشـێوەیەکی گـشتی هەنـدێ لایەنی دەرەکی و جوانکاری و جل و بـەرگ و میکیـاج و هەنـدێ شـتی دی و پاشـان لەلایەن پیاویشە پرەنسیپە بنەڕەتیەکان لەهەندێ لاوە وەك خۆیان وان و گۆڕانیـان بەسـەردا نــەهاتووە لــەلای هەنــدێك وەك چــەرخەکانی بــەردین ڕەفتــاو بــیرو بۆچــونەکانیان بەدیاردەخــەن و لای هەنــدێکی تــری پیــاوان ئــافرەت وەك بوکــە شوشەیەك بۆ بەسەربردنی کاتە بەتاڵە کاتی ژیانی خۆیان و سوکایەتی پێ کردنی و ڕابواردن لەگەڵی و هیچی تر ، ئـەوەی کـە مـابێ و بـەفکری سـەردەمیانەو بەچـاوی یەکسانی و تەبایی لە ڕەگەزی ئافرەت دەڕوانـێ و هەمیـشە لەبەرەنگاربوونەوەدایـە بەرامبەر یاساو فاکتەرە داسەپاوە کۆمەڵایەتیە کۆنەکان و زۆر جار کۆسپ تەگەرەو گرفـت لـەپێش ئــەم هەنگاوانـەدا دروسـت دەبـن ، بەشـێکی تـری ئەوپیاوانانــەن کەبڕوایان بەیەکسانی تـەواوی ئـافرەت هەیـە لەگـەڵ پیـاو بـەبێ هـیچ جیاوازیـەکی دیاری کراو .

لەلایەکی دی خـودی ئـافرەتی ئـەمرۆ کـە گومـان لەوەدانیـە لـە ئـەمرۆی زانـست و خوێندەواری و پێشکەوتن و ڕۆشنبیریەت و فکـرواڵا بـوون و کراوەیـی و بـڕینی ئـەو ڕۆژگارە دوورو درێژانەی کە پڕبوون لەمەینەتی و کارەسات و دژایەتی و هەموو ئـەو بەربەرەکانی و مل ملانێە مانای ئەوە نیە ئـافرەتیش گەیـشتۆتە ئـەو ڕادەیـەی کـە پێویستە ، چونکە سەرەڕای گشت ئـەو گۆڕانکاریانـە هێـشتا دواکـەوتن و لاوازی و

سستی هەنگاو نان لەبەرەوپێشەوە چوونی پرۆسەکەیان ئافرەتیش بەشدارە ، واتە ئەویش زۆر جار هۆکارێکە بەرامبەر بەوەستان و شکست هێنانی هەوڵەکان ، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ترس و شەرم کردن و خۆبەکەم زانین و هەمیشە پاشەکشێ کردن لەوەی بەر تانەو تەشەری بەرامبەرەکەی نەکەوێ کەپیاوە یان هاو توخموکەی خۆی کە ئافرەتە زۆر ئەوانەی لەم بوارانە کاران و چالاکانە کاردەکەن بۆ خزمەتکردنی سەرجەم ئافرەتان بەڵام لەلایەن ئافرەتانەوە تووشی جۆرەها تانەو تەشەرو و ناونـاتۆرەو بێ ئابڕوویی و لەکەدارکردنی شەرەفیان و ناوزڕاندن دەبنەوە..

بەشێوەیەکی گشتی ئەو هەنگاوە سەرەکیانەی کە گرنگن بۆ زیاتر بەرەو پێش چوونی ئەم پرۆسەیە دەبێ سەرەتا لە خێزان و ئەو چوارچێوەی کە ئافرەت لەنێوان ئەو خێزانەیدا دەژی و چۆنیەتی پەروەردەکردنی و ڕەفتاربەوشێوازە زانستیانەی کەدەبنە مایەی دارشتنی بنەمایەکی پۆلاین بۆ داهاتووی ئەو ئافرەتە، کە بتوانێ لە کۆمەڵگاکەیدا هەنگاویان لەسەربنێ و کاریان پێبکات و ببێتە پێشرەوێك بۆ نەوەکانی داهاتوو تا کۆمەڵگایەکی مەدنی پێشکەوتنخوازو مۆدێرین لەسەر بنەمای خۆشەویستی و ڕێزگرتن و تەبایی دروست بکرێت و بەیەك چاو سەیری هەردوو ڕەگەز بکرێت و یاساکانی دەوڵەت هەموو مافێك بدات بە ئافرەت بەو شێوەی کە بەپیاو دراوە بێ جیاوازی ، بەبێ ئەوەی بەناوی یەکسانی ئافرەت و ڕێزگرتن لەبیرو ڕاکانی ڕێژەی دیاری کراو هەبن بۆ بەشداری کردنی ئافرەت لە پرۆسەی سیاسی بەم شێوەی کە ئێستا هەیە ئەمەش بۆ خۆی پێشێل کردنێکی ترە لە مافەکانی ئافرەت و ڕێگە گرتنە لەدەرکەوتن و هاتنە پێشەوەی ئافرەت . ئەم ڕێژە دیاری کردنە کەمکردنەوەی تواناو لێهاتووی ئافرەتانە چونکە بەشداربووان و ئەوانەی دەتوانن کارابن بەهۆی ئەو ڕێژانەوە کۆسپ دێتە ڕێگایان و ماوەی کارکردنیان نابێ چونکە ئەوانەی بەهۆکاری زۆر بەهێزو ناسیاوی و پەیوەندیان

بەپارتــە سیاسـیەکانەوە مـاوە لەوانـەی کـە بێلایـەنن وەردەگرێـت ئەگـەر کـاراو شارەزاتریش بن .

گرفتە هەنوکەیەکانی ئافرەتی کورد ترسە ، ترسێك کە کەس و کارەکـەی لەسـەری هەیانە و ترسی دووەم خۆیەتی بەرامبەر بە درنـدەیی پیـاو و ئـەو کۆمەڵگایـەی کـە ڕەحم وبەزەیی نیە و هەمیشە ئافرەت نێچیرێکی بێ دەسەڵاتی پیاو بـووە.. ڕەنگـە ترسی کەس و کارو دەورووبەری ئافرەت کارێك ئاسـای و لـەجێ ی خۆیـەتی چـونکە هەمیشە ئەم شێوە ترسانە نەك تەنها بەرامبەر ڕەگەزی مێینە هەیـە بـەڵکو لای زۆر خێزان بەرامبەر بـە نێریش هەیـە وەکـو ئـەوە وایـە لـەو دارسـتانە جەنگەڵـەی کـە درەندەی چاوبرسی زۆری تێدابێت ئەوە بێ گومان تـرس شـتێکی ڕەوایـە و هـەموو یەکێك لەئێمە ئەو ترسەی دەبێ.. هاوکـات بـەم ترسـە و ترسـی ئـافرەت خـۆی لـە ڕووبەڕووبوونەوە و بەرەنگاربوونەوەی لەگەڵ ئـەو هـەموو یاسـایانەی کـە بەدرێـژای مێژوو بوونە بابـەتێکی ڕۆحـی و لـەناخی ئـەم کەسـایەتیەدا تێکـەڵ بـوون زۆر جـار ئەگەر لەخۆشیان بپرسین هۆکارەکان چین و بۆ وارەفتاردەکەن..؟ لەوەڵامدا نـازانم یان باوباپیرانمان وایان فێرکردووین و ئـەوە داب و نـەریتی کوردەواریـە.. دواتـریش بەرەنگار بوونەوەی ئافرەت بە دونیایەکی بەرفراوان و مل ملانێیەکی توندو بەهێز و ڕووبەڕووبوونەوەی هەورازو نشێوەکانی ئەم ژیانە و هەنگاونان بـەرەو پاشـەڕۆژێکی گەش و ڕوناك .

کەواتە ئەوەی ئافرەتی ئەمڕۆ بەدەستی هێناوە لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی کە بەسەر کۆمەڵگادا هاتووە و ئەو فکرو بۆچوونە تەسك و بچوکانە گـۆڕاون و لەکرانـەوەدان و پێویستە ئافرەتیش لەگەڵ خێرایی ئەم گۆڕانکاریانە هەنگاوبنێ و سووربێت لەسـەر ماف و داواکاریەکانی و هەمیشە چالاکانە شان بەشانی پیـاو کارەکـانی ڕاپـەڕێنێ و نەوەیـەکی پـەروەردەی خـاوەن فکـرو کـراوە بـۆ ئاینـدە بخـەملێنێ و ئـەو کۆتـو زنجیرانەی پیاو لە کۆمەڵگادا بپـسێنرێ و ژیـانێکی نـوێ و ئازادیـەکی سـەردەمیانە

بێنێتە ئاراوە و ئەو سوکایەتی و بەکەم سەیرکردن و بوکەشووشەییەی ئافرەت بگۆڕدرێت بەبێ جیاوازی .

ئەمەش گومانی تێدا نیە ئەگەر پیاو هاوکارنەبێت و ئەم ژیانەی پێ قبوڵ نەبێت ئەوە ئاستەنگە ئەو پرۆسەیە بەرەو پێشەوە بچێت و بگرە شکستیش دەخوات وەك زۆر لەو پرۆژانەی کە بوونە قوربانی کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو و فکرێکی چەرخی بەردین کە هێشتا زۆر لەوانە هەن و کاریش دەکەن و بەداخەوە زۆریش هەن بڕوایان پێدەکەن و بەدواشیاندا بەووشەی لەزاردەرچوویان دووبارە دەکەنەوە..

لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بەوە بکەم کە ئافرەت لەکوردستان دا ئەمرۆ لە هەموو ڕۆژێك زیاتر تووشی پلان و کۆسپ و تەگەرەدەبێت و ترسی زیاتر لەوەدایە کە زۆر شێوازی تازە و مۆدێرن لەئارادان بۆ سوکایەتی کردن بەئافرەت و ناوزڕاندنی و گۆڕینی ئەو پاکی و بێگەردیەی .

کەواتە لەگەڵ گۆڕینی ئەم شێوازە بەربەرەکانیانە کە جیاوازە لەولنەی کە بەفکری کۆن دژایەتی ئافرەت دەکەن و بڕوایان بەیەکسانی و پێکەوە ژیانیان نیە و ئەوانەشی لەژێر پەردەی سەردەمیانە و مۆدێرنیەت دا سوکایەتی بەئافرەت دەکەن و بازرگانی پێوەدەکەن و بۆ خۆشبەختی و کات بەسەربردن و تێرکردنی حەزو ئارەزووەکانی خۆی بەکاری دێنن .

بۆیە گرنگە یاسا و کۆمەڵگا و کەسایەتی پێکەوە هاوکاری یەك بن تا دووبارە دارشتنەوەی یەکە یەکەی ئەو پێگە گرنگانەی کە پەیوەندیان بەژیان و گوزەرانی ئێمەوە هەیە بەبێ هیچ جیاوازیەك تا ژیانێکی ئاسوودەو کامەران و خۆشبەختانە بێتە ئاراوە ، ئەو کات هۆنراوە و گۆرانی و ئەدەبیاتمان لەو هەستە ڕاست و دروستەوە بێتە دەرێ کە بڕوامان پێی هەبێت..

# ئافرەت و خوێندن

ئەگەر ئێمە سەیرێکی ووردی ناوەڕۆکی بنەماکانی پەروەردە و خوێندن بکەین هیچی کەم نیە لەخەم ساردی و کەم و کوڕیەکانی کە لە چوارچێوەی خێزان بەرامبەر بەئافرەت ئەنجامی دەدات و ئەودەورووبەرەی کە هەمیشە گرفتێکی گەورەیە لەپێشکەوتن و بەرەو پێشەوە چونی ئافرەت لەکۆمەڵگای کوردەواری دا. ئەم شێوە بۆچوون و بیرکردنەوانەش لەهەندەران زۆربەی کات کاریگەری یان هەیە و تەنانەت لێرەش پەیڕەویان لەسەر دەکرێت . لابردنی ترس و بەخشینی بڕوا بەخۆبوون و ئازاد کردنی ئافرەت لەم ڕوانگەیەوە تا خۆی بتوانێت بەبڕواوە ڕووبەڕووی گرفتەکانی کۆمەڵگا بێتەوە . ئەگەر خوێندن و خوێندنگا هۆکارێکە بۆ پەروەردەکردن و بنیادنانی بنەمای کەسایەتی و چۆنیەتی ڕەفتارکردن لەگەڵ دەوروبەرو چۆنیەتی ناسین ، پەروەردەو خۆێندن بەدووشێوە دەتوانین ببینین ئەو پەروەردەو فێرکردنەی کوردستان کە تابەئەمرۆش لەو چوار چێوە دووبارە بووەوەی کە ڕژێمەکانی پێش پیادەیان دەکرد یان دراوسێکانمان و هەمان بەرنامەو سیستەمی ئەوانە بەهەندێ گۆڕانکاری بچوکەوە دەخرێتە بەردەستی خوێنەری کورد کە ئەو سیستەمە پەروەردەییە زانستیە پێشکەوتووە نیە کە لەبنەماوە بە چەند پێوەرو لایەنێکی پەروەردەیی پێش زانستی داڕێژرابێت ئەگەر ئێمە کەسایەتیەکی زانستی بەبێ پەروەردەی دروست بکەین ئەوە کامڵ نابێت و کاریگەری خراپی بۆ نەوەکانی ئاینده دەبێت ئەمە بەشێوەیەکی گشتی ، ئەگەر باس لە ڕۆڵی ئافرەت و کچی کورد لەبواری پەروەردەو فێرکردن بکەین ئەو ڕۆڵە دڵخۆشکەرە نیە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئافرەتی کورد بەتوانا نیە بەڵکو ڕێگای پێنادرێ و کۆسپ دەخرێتە ڕێگای و ئەو کچانەی کە دەیانەوێ بخوێنن ئەو

ماوەیەیان پێنادرێ و گرفتی جۆراو جۆری کۆمەڵایەتی دەهێنرێتە ڕێگایان و دەرگای زانست و پەروەردە یان لەسەر دادەخرێت . بەڵام ئافرەتی کورد و کچی کورد لە هەندەران لەگەڵ بوونی لایەنی پەروەردەیی و زانستی پێش کەوتوو دیسان جۆرەها گرفتی جیاواز لەگرفتەکانی کوردستان دێنە ڕێگا ئەو گرفتانەی کە خودی پەروەردەو خوێندنگا بۆ کچان و خوێندکارانی کورد دێنێتە ڕێگا و ئەو شێوە پەروەردە و شێوازی هەڵسوکەوت و چۆنیەتی ڕاهێنان و ئەو ئازادی و تێکەڵ بوونەی کە منداڵی کورد بە کچ و کوڕەوە لە خوێندنگاکان تووشی دەبن بەشێوەیەکی کاریگەری لەدروست کردنی ئەو کەسایەتیە دەبێت و بەشێوەیەکی گشتی منداڵی کورد و کچانیش لەو بەشەن بەرێژەیەکی باش و تەواو سەرکەوتوو نین و ئەوەندەی منداڵی کورد لە بواری خوێندن و پەروەردەییدا لاواز و سەرکەوتوونین و زۆر بەکەمی دەتوانن بگەنە قۆناغەکانی زانکۆ ، ئەمەش هەندێ جار دەگەڕێتەوە سەر شێوەی سیستەمی پەروەردەی ئەو وولاتە چونکە ئەم وولاتانەش سیستەم و شێوازو بۆچوونی خۆیان هەیە کە کاری لەسەر دەکەن و بەتایبەت لە وولاتێکی وەك ئەڵمانیا ئەم گرفتە بەرچاو دەکەوێت کە نەك تەنها کورد بەڵکو عەرەب و بیانیەکانی تر کە لەم وولاتەدا دەژین چونکە وولاتەکە ئەوەی بەلایەوە گرنگە کارو دەستی کارە بۆیە ڕێژەیەکی زۆری خوێندکاران لە قۆناغێکی دیاری کراودا کارێك فێردەبن و دەکەونە بازاری کارکردنەوەوە بەهەمان شێوەش کچانی کورد ، بەڵام ڕەنگە ئەم ڕێژەیە لەوولاتی سوید یان بەریتانیا یان هۆڵەندا و وولاتانی دی بەچاك یان بەخراپ جیاوازی هەیە.

جوانی و بوونی پارە و لەخۆ بای بوون و خێرا ڕووکردنە گۆڕانکاریەکان کە هەندێ لەو خێزانانەی کە لە کوردستان ژیانیان لەو ئاستەدا نەبووە و دوای ئەوەی هاتوونەتە هەندەران و بەشێوەیەك یان بەپێی ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتیەی ئەم وولاتانە ئەو خێزانانە بوونەتە خاوەن پارەو لەپڕ ئەو گۆڕان و شێوە ژیانەیان لەو

ئاستەوە بۆ ئەم ئاستەی ئێستەیان و دواتر ئەو گوێ نەدانەی دایک و باوک بە منداڵەکانیان و هاندانیان بۆ هەندێ کار و پشتگیریان و گوێنەدانە لایەنی پەروەردەیی ئەوە دەخولقێنێ کە منداڵ و بەتایبەت ئافرەت بەرەو لادان و بەرەو ڕێگایەک دەبات و گەڕانەوەی بەو ئاساییەنابێت چونکە ژیان و گوزەران و بیرکردنەوە لەم وولاتانە بەو شێوەی وولاتی خۆمان نیە منداڵێك لە دوای تەمەنی ١٨ ساڵیەوە دەتوانێ ماڵی دایک و باوك بەجێ بهێڵێ و بۆخۆی بژی و کەسیش ناتوانێ هیچی لەگەڵ بڵێ ئەمە هاندەرێکە کە پێویستی بەوە هەیە دایک و باوك و خێزان بەوورییایەوە هەڵسوکەت لەگەڵ منداڵ و کچەکانیان بکەن و خۆیان لە گرفت و کێشەی سەیرو سەمەرە لابدەن ، بێگومان لێرەو لەوێ کەسایەتی کورد یان خێزانی کوردیش بێ بەش نیە لەو گرفتانە لەوانە زۆر کچی کورد ئەو ڕەفتارو هەڵسوکەوتەی کە دەیکات و ئەگەر بەکوردی قسەنەکات یان نەناسرێت ڕەنگە کەس نەزانێت ئەوە کوردە و لەخێزانێکی کوردیشە ، یان بەو قسەو باسانەی کە دەبسترێن ئەگەر هەموو شیان ڕاست نەبن بەلاّم شتێك هەیە ئەگەر نەبێت باس و خواسی لەسەر نابێت ، کەواتە ئاسکی و جوانی ئافرەت هەمیشە ڕێگا خۆشکەرە بۆ زوو تێوەگلان و لەکەداری و ناو زڕانی ئافرەت ئەوەش هەندێ جار لەنەفامی و ئەقڵ کورتی و ساویلکەی کەسایەتی کوردە کە ئەوەی تەنها بەتەماشایەکی کورت و بینینێکی نائاشکرا ئەو داستان و چیرۆکەی لەگیرفان و پاڵتۆکەیەوە دەردەهێنێت و کەسایەتی ئەو کچەی پێ لەکەداردەکات و ئەمەش هەمیشە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو کەسە نەخۆشەو زۆر لەو کەسایەتیانەش دەناسم تەنها کاریان لەکەدار کردنی خێزان و کچانی کوردە لەهەندەران وەك هیوایەتێك .

## هۆكارەكانی پەنابەرەی و رووكردنە تاراوگە..

لە پرنسیپە سەرەكیەكانی جارنامەی ماف مرۆڤ دا هاتووە كە ئازادی نیشتەجێ بوون و هاتووچۆ و سەفەركردن بۆ مرۆڤ و هەڵبژاردن و دەست نیشان كردنی ئەو شوێنەی دەیەوێ بەئازادی بژی.... لە كاتێكدا ژیان و گوزەرانی پەنابەری لەوولاتانی ئەوروپی و دواتر ئەگەر یەك بەیەك دەست نیشانی ئەو ولاتانە بكرێت و لەو جۆرە دەوروبەرو ژیانە دا سەپاوە دیاری بكەیت بێ گومان زۆر باروولایەنی جیاوازو هەندێ خاسیەت و سیستەمی نەگۆر بەدیاردەكەون ئەمەش لە ئەوروپا بۆ ئەمریكا و ئوستراليا و هەندێ لە ولاتانی شەرقی جیاوازی هەیە..... كەواتە بەكورتی دەگەینە ئەو ئەنجامانە كە ژیانی كەسایەتی كورد رەفتارو جۆری كاری بیركردنەوەو هەنگاونان بەرەو بنیادنانی پاشە رۆژی لە ولاتێكەوە بۆ ولاتێك دەگۆرێت . ژیانی ئەمرۆ لە تاراوگە یان هەندەران لەسەرەتای كەوتنە نێویەوە تائەو رۆژەی كۆتایی دێت هەمیشە لە گۆراندا دەبێت و بەجۆرەها شێوەو شێواز.. بەشێوەیەكی گشتی لەم برگەیە دا دەتوانم لەچەند خاڵێكی جیاواز و تایبەت دا كۆبكەمەوە و هەریەكەیان بەپێی پێویست باسیان لێوەبكەین بە پەیوەست كردنەوەی بە قۆناغەكانی دەست پێ كردنی پەنابەری ، بەڵام لەچوارچێوە و گرفت و ئاڵۆزی ژیان و كاردانەوە و رِنگدانەوەی لەژیانی ئەمرۆماندا چ كوردستان یان هەندەران . كەواتە راكردن و خۆدورخستنەوە لەو ژیانە هەنوكەییەی كورد تێیدا دەژی یەكێكە لەئامانجە سەرەكیەكانی كەسایەتی ئاوارەبوو بەڵام كۆمەڵە پەردەیەكی سپی و چەواشەكار بەسەر راستیەكاندا دەدرێت و لەژێرناوی چارەسەرو و پارەو كاركردن و خوێندن و گەران و خۆشی و دونیا بینین و چەندین ناوی دی لەو كاروانە تازەی ژیان دەنرێت.. دەتوانین ناوی گۆران لەژیانێكی داسەپاو لەكێشەو گرفت و شەرو دەربەدەری كە هیواو ئاواتەكانی كەسایەتی كوردی

زیندەبەچاڵ کردووە و بەتایبەت لاو یان گەنجی کورد.. چونکە کاتێك مرۆڤ ڕوو بەڕووی دووبەرەکی و براکوژی و کێشە بێ کۆتاکانی ناوخۆیی و فەرق و جیاوازی و گرفتە دەرەکیەکان دەبنەو هۆکارێك کە هەمیشە هەوڵ بدات بەهیواوە خۆی لەو چەوساندەوەیە ڕزگاربکات و ئەو ڕزگاری و سەربەستی یە دەکاتە هیواو ئامانجی ئایندەی خۆی . لەپێناو ئەو هیواو ئاوات و ئاکامانەدا قوربانی دەدات وبەرگەی هەموو دژواریەکانی ژیان دەگرێت . بەلاّم کاتێك کورد ببێتە دوژمنی کورد دەبێ چۆن بەرەنگار بوونەوە و کاردانەوەی دەرونی و سلبی بۆ سەر کەسایەتی کورد هەبێت و کام هیواو ئاوات و ئامانج لە دەرونیدا بێت.. ڕنگە هەبن بڵێن بۆ ئاشتی و یەك بوون و تەبایی چارەسەرە.. بەلاّم ئەم جۆرە تەبایی و تێگەیشتنەی ئەمڕۆ لە ئارادایە، یان ئەوەی لە دێرزەمانەوە و لە دووتوّی کتێبە مێژوویەکانماندا بیانخوێنینەوە ، ئەوەمان بۆ دەسەلمێنن کە ئەم تەبایی و یەك بوون و پێکەوە ژیانەی نێوان لایەن و حزبە کوردیەکان دا هەیە ڕەنگە کەمێك خۆی لە کۆڵەکەی مەحاڵی بدات و زۆرگران بێت کە کەسایەتی کورد بە بڕواوە لەم هەنگاوە بڕوانێ ، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ سەر تاك واتە هەرکەس بەشێوازێك و بەو شێوەی خۆی لە ڕاستیەکان دەگات لێکیان دەداتەوە کەواتە ئەم خاڵە بۆ ئێوەی خوێنەر بەجێ دەهێڵم... هەرچەندە ڕاکردن و دورکەوتنەوە چارەسەرنین بەلاّم دانیشتن و سەیرکردن و کارکردن بە ڕەوت و سیستەمەش ڕاست نیە ، کەواتە چارەسەر دەبێ چیبێت کام ڕێگا ئاسان و یاریدەدەربێت تابتوانین دەردەسەری و مەینەتیەکان و برینە کولاوەکانی سارێژ بکەین و دونیایەکی ئاسوودە و کامەران و یەکسان و بێ جیاوازی لە نێوان چین و توێژەکانی کۆمەڵگا لە هەژارو دەوڵەمەند ، خاوەن دەسەلاّت و بێ دەسەلاّت.. بێ گومان زۆر هەن باس لە ئاوەدانی و کاری خزمەت گوزاری و پەروەردەی وگۆڕانی ژیانی خەڵکی کوردستان بەرەو باش و دڵخۆشکەر ، دەڵێم ڕاستە زۆرکاری گەورەو باش کراوە و بەڕاستی لەخزمەتی جەماوەردان

بەڵام خۆ دەبێ باس ئەوەش بکرێت لە پاڵ ئەم کارە باشانەشداجۆرەها کاری لابەلاو گەندەڵی و کاری نابەجێ دەکرێن و زۆربەشیان لە ژێر پەردەی جۆراو جۆردا ئەنجام دەدرێن و کەسیش ناتوانێ لێیان بپێچێتەوە، کەواتە ئەگەر من لەسەر حسابی هاورێکانم یان ئەوانەی کاریان لەگەڵ دەکەم خۆم پێگەیاند و بوومە خاوەن پارەو سەروەت و سامان و ئەوانەشی کە خاوەن قوربانی و چەندین ساڵە ئاوارەو دەربەدەری و چەندین ناخۆشی و گرفت و جۆرەها کار لە پێناوی میللەت و ئەوجا ئەو لایەنانەی کە کاریان تێدا کردووە بەڵام ئەمڕۆ لە دەرەوەی گۆرەپانەکەدان و ئەو گۆرەپانەی چەند ساڵێك لەمەو بەر کاریان تێدا کردووە ئەمڕۆ بەدەست هەندێك کەسانی ترەوەن و لەوانەیە لەو ئاستەدا نەبن کە پێویست بێت لێرەدا مەبەستم زۆر لەو دەزگاو شێوانەیە کەخزمەت گوزارین پێویستیان بە کەسانی بەتوانا و خاوەن شارەزایی تەواو مۆدێرن هەیە.. ئەوانەش کە لەوڕاستیانە هەڵدێن وەنەبێ بیریان لەوەنەکردبێتەوە چارەسەر بۆکێشەکان بدۆزنەوە و هەوڵبدەن ڕۆڵێکی باش و خزمەت گوزار بگێڕن و کێشەکان بنەبڕکرێن بەڵام سوودی نەبووە و بگرە ژیانی خۆشیان خستۆتە خەتەرەوە لەو پێناوەدا.. ئەمە لەلایەك ئەوانەی کە ڕۆشنبیرو کەسانی شۆڕشگێڕ و دڵسۆز بە کورد و کوردستان بەڵام ئەوەناگەیەنێ کە هەموو ئەوانەی ڕویان لە هەندەران کردووە لەم چین و توێژانەن .

سەرجەم ئەو هۆکارانە لەم چەند فاکتەرانەی خوارەوەدا یەك دەگرنەوە ئەوانیش :

- هۆکارە سروشتیەکان و گرفت و گێژاوە مێژوویەکان
- فاکتەرە رامیارەکان
- فاکتەرە ئابووریەکان
- فاکتەرە کۆمەڵایەتیەکان
- باری ڕاگەیاندن

# هۆکارە سروشتیەکان و گرفت و گێژاوە مێژوویەکان

دروست بوونی ژیان و نیشتەجێ بوون و دەست کردن بە کشتوکاڵ و پاشان پیشەسازی و بەرهەم هێنان هاتە ئاراوە . ڕەنگە مێژووی مرۆڤایەتی و گەشەسەندن و پێشکەوتن قۆناغ لە دوای قۆناغ چەند لایەنی باشەو چاکەیان بۆ مرۆڤ هەبووە لە هەمان کاتیشدا بوونەتە مایەی چەوساندنەوەو پێشێل کردنی مافەکانی لەلایەن کەسانی خاوەن دەسەڵات و سەرمایەوە ، ژیانی کۆیلایەتی یەکێکە لەو قۆناغانەی کە مرۆڤ کۆچەری بەسەردا سەپێنێراو بوو واتە بەخۆاستی خۆی نەبوو کۆچی پێدەکرا و ئەوەی دەی کڕی یان دەستگیری دەکرد بەخواستی خۆی دەیگواستەوە، دوابەدوای دۆزینەوەی میتال (مادە) و بەتایبەت ئاسن و جیابوونەوەی پێشەکان لە پێشەی کشتوکاڵ و زیادبوونی ئاڵوگۆڕ لە نێو بازاردا بەدیارکەوتنی کەلوپەل و بەرهەمهێنانیان بۆ بازارەکان و دروست بوونی پارەو پاشان دروست بوونی پێشبڕکێ بۆ زیاتر بەدەست هێنانی پارەو بوون بەخاوەن سەرمایە لەگەڵ بڵاوبونەوەی قەرزو قەرزکاری و داماڵینی جوتیاران لە زەوی و زاری خۆیان و دەست بەسەرا گرتنی لەلایەن خاوەن دەسەڵات و سەرمایەکانەوە لەگەڵ دەرکەوتنی چینی بازرگان و دیاربوونی شار وەك مەڵبەندێکی بازرگانی گەورە و باش . مێژوی میسری کۆن کە ڕژێمێکی ئابوری ئەو دەوڵەتانەی لەسەربنەڕەتی ڕژێمی کۆیلایەتی دروست بوو بوون ، هەروەها مێژوی یۆنان و ڕۆمانەکان لە ٢٤ ی پێش زایندا ژمارەی کۆیلەکان لە ڕۆما گەیشتە پتر لە ٢٠ ملیۆن بەرامبەر ٢١٤ هەزار هاونیشتمانی سەربەست ، هەروەها لە ئەسینا ساڵی ٣٠٩ ی پ. ز کۆیلەکان گەیشتنە ٤٠٠ هەزار کۆیلە لەکاتێکدا ژمارەی دانیشتوانە سەربەستەکان لە ٢١ هەزار تێ پەڕنەدەبوو ، پورتوغالیەکان یەکەم وڵات بوون کە دەستیان بەڕاو کردنی ڕەش

پێستەکان کرد لە ناوەڕاستی کیشوەری ئەفریقاوە دەیان گواستنەوە بۆ ئەمریکا لە ساڵی ١٥٠٣ دا بەرەو (سان دۆمینجۆ). ئینگلیزەکانیش لەساڵی ١٥٦٢ دا بەشداریان لە بازرگانی کردن بە کۆیلەکانەوە بەشداریان کرد .

گۆڕانکاری پێشکەوتنەکان بەهۆکارەکانیانەوە تا گەیشتە هۆکاری بڵابوونەوەی بیری رامیاری و ئاینی نوێ.. دۆزینەوەی جوگرافیەکان و داگیرکردنە ئەوروپیەکان و بڵاوبوونەوەی جوڵانەوەی رۆشنبیری و دۆزینەوەی داهێنان و چەندەها دۆزراوەی زانیاری پڕ بەهاو بایەخ . لەسەدەی ١٦ وە ئەوروپا بەرەو زیادبوونی دانیشتوان دەڕۆیشت و زیاتر ئەم دیاردەیە لەشارەکاندا بەرچاوتربوو هەندێکیش لەو بیرە رامیاریانەی لەو سەردەمەدا بڵاوبوونەوە لەگەڵ چەند پەیڕەوێکی ئاینی کە ئەم رامیاری چەوساندنەوەی ئاینی لە هەندێك وڵاتدا بووە هۆی کۆچ کردنی ئەو کۆمەڵە چەوسێنراوانە بۆ ولاتانی تر... ساڵانی ١٢٩٢ موسوڵمانەکان لە ئیسپانیا دەرپەڕێنران هەروەها هیگۆنوتەکان لە فەرەنسا رایان کرد بەرەو هۆڵەندا و ئینگلستان و کاسۆلیکەکان رێبازگە ئاینی یەکانی تریان دەچەوساندەوە ، لەرووی دۆزراوە جوگرافیەکان و داگیرکردنە ئەوروپایەکان لە ساڵانی ١٤٩٢ بە پاپۆرە ئیسپانیەکان توانیان چەند دورگە و ناوچەی گرنك لە ئەمریکای خواروی ئەمریکا بدۆزنەوە.. لەگەڵ پورتوغالیەکان توانیان کە دەرگای ئەمریکای خوارو ناوەڕاست بکەنەوە ئەمریکای سەروو لەلایەن ئینگلیزەکان و هۆڵەندە و فەرەنسی یەکانەوە بدۆزرێتەوە و پاشان تەشەنەی کرد بۆ کیشوەری ئەفریقا ، ئەمەش بووە هۆی کۆچ کردن بۆ ئەو شوێنە دۆزراوانەوو یان لەو شوێنە دۆزراوانەوە بۆ وڵاتانی ئەوروپی.. سەیری کۆچی حەزرەتی ئیبراهیم بکەین و دواتر کۆچ کردنی موسڵمانان بۆ حەبەش لە دەست قورەیشەکان و پاشان فەرمانی پێغەمبەر ( د . خ ) بۆ موسوڵمانان بۆ کۆچ کردن بۆ مەدینە بەهۆی ئەو زوڵم زۆرەی کە دەکرایە سەریان لەلایەن قورەیشەکانەوە ، ئەویش بەمەبەستی مانەوەی ژیان و پاراستنی گیانیان دواتریش

کـۆچ کردنــی پێغەمبــەر ( د . خ ) و هــاوەڵانی بــۆ مەدینــە ، کەواتــە لێــرەدا بەشێوەیەکی گشتی زۆر بەکورتی باسی چەند لەو جۆرو شێوە کۆچ کردنانەمان کرد و سەرجەمی ئەو دەرهاویشتنانەی لە کۆچ کردن بـۆ مـان دیـاربوون دەتـوانین بڵـێین ئەم کۆچ کردنانە لەلایەن خەڵکانێکی دیاری کـراو یـان ناوچـەیەکی دیـاری کـراو بـۆ مەبەسـتێك و ئاکامێـك کـەبێگومان ئـەویش دیـاری کـراو دەبـێ... کـەم بوونـەوەی ژمارەی کۆمەڵە کۆچەرەکان بەهۆی سەختی بارودۆخ و ڕوودانی شـەڕو شـۆڕ.. کـەم بوونەوەی ژمارەی دانیشتوان و ڕەچەڵەکی بەهۆی داگیرکەرانەوە ، هاتنی نەخۆشیە کوشندەکان ، گۆڕینی ڕەوشـە فیزیایـەکانی کۆمەڵـە ڕەگەزپەرسـتەکان بـەهۆی ژن هێنـان و ژن خوازیـەوە ، گـۆڕینی کولتـورو کەلـەپوورە ڕەسـەنایەتیەکان ، تێکـەڵ بـوونی کولتـوری و ڕەوشـی نـوێ ژیـان.. گـۆڕینی زمـان و تێکـەڵ بـوونی لەگـەڵ زمانەکانی تر لە کۆچەران و دانیشتوانی ئەسڵی . کە واتە باسمـان لـە کـۆچ کردنـی سـەرەتایی و کـۆچ کردنـی سـەپێنراو کـرد ، پاشـان ئـەو کۆچـانەی پـێش جـەنگی جیهانی یەکەم و دووەم و دوایی ، چەند مـاوەی نێـوان سـەدەی نـۆزدەو بیـستەمدا ملیۆنەها ئەورووپی ڕۆژئـاوا و دواتـریش ڕۆژهـەڵات بـەهۆی گـەڕان بـەدوای پەنابـەری سیاسی و سەربەستی ئاینی و ڕەخسانی ئـەو هەلـە ئابووریـە لـە ئـەمریکای بـاکورو باشور ، پاشان ئەفریقا و ئوسترالیا و نیوزلانداو چەندین شـوێنی تـری ئـەم دونیایـە نیشتەجێ بوون ، هەندێك لەوانەش بە ڕێگای دەریاوە بۆ مەبەستی کارکردن ڕوویان لە فلیپین و هاوای و ئەمریکا کردووە ، یان لێشاوی کۆچ کردنی موسوڵمانانی بە هێز بۆ پاکستان بەڕێژەی ٦،٦ ملیۆن سیخ و هینـدۆس بـۆ هینديـستان کۆچـیان کـرد.. هەروەها لەدوای سـاڵی ١٩٤٨ و دامەزرانـدنی دەوڵـەتی ئیـسرائیل بـووە هـۆی کـۆچ کردنـی سـەدان هـەزار جوولەکـە بـۆ ئـەو وولاتـە لەگـەڵ کـۆچ کردنـی هـەرەفراوانی جووەکان لە ساڵی ١٩٨٩ ڕویدا دوای ئەوەی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو یاسـاو ڕێـسا ئاڵۆزەکانی کۆچ کردنی ئاسانتر کرد و دوای هـەرەس هێنـانی یـەکێتی سـۆڤیەت لـە

ساڵی ۱۹۹۰ ژمارەی جووە کۆچ کەرەکانی نیمچە دوورگەی هێندی ئەو توندو تیژیەی لەگەڵ پارچە پارچە بوونی یوگسلافیا وە هاتە ئاراوە و بووە هۆی پەیدابوونی چەن وڵاتێکی رەگەزپەرست کە ئەوانیش لە ساڵانی ۱۹۹۰کان بوونە هۆی ئەوەی کە ملیونە ها هاووڵاتی یوگسلاڤ ووڵات بەجێ بهێڵن.. یان بەهۆی داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن سۆڤیەتەوە ساڵی ۱۹۸۰ زیاتر لە ٥ ملیۆن ئەفغانی ئاوارەبوون و وڵاتیان بەجێ هێشت وە لەساڵی ۱۹۹۱ بەهۆی شەڕی ناوخۆی ئەفغانستانەوە ژمارەی پەناهەندەکانی ئەفغان ڕێژەی هەرەزۆری پەنابەربوون لە وڵاتاندا و بەتایبەت ئێران ، هەروەها شەڕی عێراق _ ئێران و ئاوارەبوونی سەدان هەزار هاووڵاتی عێراقی لە عەرەب و کورد و کەمەنەتەوایەتی کانی ترو دەرکردنی کوردە فەیلیەکان و پەنابەریان لەئێران ، پاشان ڕاگوێزانی زۆرەملێ و دەرپەڕاندنی خەڵکانی نێو دێهاتەکان و ئاوارەبوونیان لە ئۆردوگا زۆرەملێیەکان و پاشان کۆڕەوەکەی ساڵی ۱۹۹۱ کە زیاتر لە چوار ملیۆن کورد ئاوارەی سەر سنوورەکانی ئێران و تورکیا بوون . لێرەدا دەتوانم کۆتایی بەم پێشەکیە بۆ هۆکارو دەرهاویشتە تایبەتیەکانی کۆچ بەشێوەیەکی گشتی و بۆ کورد بەتایبەتی و مەبەستی سەرەکی من لێرەدا ئەوەیە کە باس لەسەر هۆکارەکانی کۆچ و پەنابەری کورد بکەم بەلآم واشم بەباش زانی بەکورتەیەکی کورت بەم شێوەیە بدوێم و پاشان بێمە نێو ناوەڕۆکی بابەتەکەوە ، بۆیە بابەتی دواتر لە فاکتەرە ڕامیاریەکانەوە دەست پێ دەکەم بەلآم لە بەشی دووەمی ئەم باسەماندا....

### فاکتەرە ڕامیاریەکان

هەموو یەکێك لەئێمە بەچاوی خۆی سەرجەم ڕووداو گۆڕانکاریەکانی ناوچەیی و دەوروبەروو ناوخۆی وڵاتی دیووە و دەتوانرێ لە ڕوانگەی ئەم ڕووداوانەوە

پێوانەیەکی ڕاستەقینە بۆ سەرجەم هۆکارو فاکتەرەکانی ئەم کۆڕەوو کۆچ ڕەوانە بەدیاربخەین . کەواتە بارە سیاسی و ئاڵۆزیەکانی تێکڕای ناوچە ، هۆکاری سەرکی بوون لە نائارامی و سەرگەردانی و ئاوارەبوون لەنێو خودی ولاتەکەی خۆشماندا.. لەم برگەیەدا زۆر دوور ناکەوینەوە و کورتەیەك لە شەڕو شەڕەنگێزی ڕژێمەکان کە فەرمانڕەوایەتی عێراقیان کردووە دەکەم لە فەرمانڕەوایەتی مەلەکی و پاشان کۆماری لە شێوەی عەبدولکەریم قاسم و عبدالسلام و عبدالرحمان و بەعسیەکان و سەدامی دوایەمینیان ، کەجۆرەها نەهامەتی و مەینەتی یان بەسەر کورد و کەسایەتی کورد دا هێناوە.. لەماڵ سوتاندن و کاول کردن و کوشتن و تۆقاندن و کیمیاباران و ئەنفال و زیندان و زیندەبەچاڵ کردن و چەندین و چەندین کاری تری نابەجێ و نامرۆڤانە کە پێنووس لە ئاستیاندا ووشك دەبێ و لە نووسین دەکەوێ . گەنجی کورد هەمیشە لەبیروفکری ئەوەدابووە چۆن بژی و چۆن ژیانی خۆی لە ئاسودەیی و ئازادی دا ببینێ و ئایندەیەکی هەبێت ، بەڵام سادەترین ماف ژیانیان پێ ڕەوانەبینی و لێشیان قەدەغەکردبی و لەلایەکی ترەوە گەنجی کورد منداڵی کورد پاشەڕۆژو ئایندەی ڕوون و دیاری نەبووە ، گەنجێك لە ڕۆژگارێك دا ڕەوانەی سەربازی دەکرا و ڕۆژی گەڕانەوەی دیار نەبوو ، بەڵام لەولاتانی تری دوونیا دوای چەند ساڵێك یان چەند مانگێك دەگەڕانەوەو لە هەندێ وولات بە کارکردن دەتوانی نەچی بۆسەربازی و ژیانی ئاسای خۆی بەئەنجام بگەێنی.. بەڵام گەنجی کورد ڕۆژی گەڕانەوەی نادیارو زۆر لەوانە بێ سەرو شوێن لە سەربازگاو شەڕە دۆڕاوەکانی ڕژێم دا وون بوون.. کەواتە لەو کاتەدا ئەمانە هۆکارێکی گرنگ و پاڵپێوەنەربوون بۆ ئەوەی لاوان ڕوو لەئاوارەبوون بکەن . کەواتە نائارامی ژیان گەورەترین هۆکاربووە لە سەقامگیربوونی ڕەوتی کۆمەڵگای کوردەواری.. دوابەدوای کاول بوون و ڕاگوێزانی چەندین گوند و شەریکی گەورەی چەندین ساڵەی شۆڕشی ئەیلول و پاشان شەڕی ئێران _عێراق کەماوەی هەشت ساڵی خایاند و تێکڕای گەلی عێراقی

زەرەروو زیــانی پـــێ گەیــشت و کــوردیش بەشــێوەیەکی تایبــەتی ، چــونکە ڕووبەڕووبوونەوەی کورد لە یەکەمیان ئەو شەڕەی کورد و ڕژێمی بەعسی بوو پاشان شەڕی گەورەیی هەردوو دەوڵەت ئێران _ عێراق و تێوەگلانی کورد لەم گێژاوەدا کە دووجار زەرەرمەند بوو بەهۆی ئەم شەڕانەشەوە زۆر گرفت بۆ کـورد و شۆڕشـەکەی دروست بوو ، دوای تەواو بوونی ئەم شەڕە و هێنـدە گـەلی عێـراق نەحەوایـەوە کـە گەلی کورد هەرگیز حەوانەوەی پێ ڕەوانەبینراوە بۆیە شەڕی کوێت و داگیرکردنی و پاشان شەڕی زیاتر لە ٣٠ دەولەتی گەورەی جیهانی بەرامبەر عێراق و تێك شـکانی هێـزە سـەربازیە عێراقیـەکان و دەرکردنـی لـە کوێـت ، ئـەوەبوو دوابـەدوای ئـەو گۆڕانکاریانە و لەبەهاری ساڵی ١٩٩١دا ڕاپەڕین سەرانسەری کوردستانی گرتەوەو لە ژێردەستی ڕژێمی بەعسی پاك کرایەوە ، ئەم گۆڕانکاریانە ڕوخساری‌کی تریـان دایـە کورد و تێڕوانین و سەیرکردنی گۆڕا ڕەنگە لەهەندێ لاوە باشـتربوو بـەڵام لەلایـەکی تـرەوە بەدروسـت بـوونی ئـەم دەرگـای ئـازادی یـە ، دەرگـای پەنابـەری و کـۆچ و دوورکەوتنەوە دەستی پێ کرد بەڵام ئـەوەشمان لـەیاد نەچـێ دوای یـەك مـانگ لـە ئازادی دیسان تێکڕای کورد بە هەڵوێستێکی مەردانەوە سـەرجەم کوردسـتان چـۆڵ کرا چونکە ئەو ڕژێمە بۆگەنەی عێراق دیسان کارتی سەوزی لە وڵاتـانی زل هێـزەوە وەرگرت و هێرشی کردەوە سەرکورد و ئەم جارە کورد یەك هەڵوێست دەستی دایـە کۆڕەوێکی گەورەی چوار ملیۆنی و بەرەو سنورەکانی ئێران و تورکیـا بەڕێکـەوتن ، دوای گەڕانەوەی دۆخەکان بۆ شێوازی خۆی و دیسان دروست بوونـەوەی ڕاپـەڕینی دووەم لە کوردستان لەدەستی چەپەڵی ڕژێم ئازادبوو.. پاشان هەڵبژاردن و دروست بوونی پەرلەمان و حکومەتی هەرێم ئـەویش ڕۆشـنایيەکی تربـوو کـە کـورد هەسـتی دەکـرد لەسـایەی دا دەژی و ئەمـەش دیـسان ئەوەنـدەی نەخایانـد شـەڕی نـاوخۆ هەڵگیرسا و براکوژی لە لایەن ئەو لایەن بۆ ئەو لایەن سەری هەڵدا ئەم پـارت و ئـەو پـارت هێـزی خـۆی تاقیـدەکردەوە ، ئەمـەش هۆکـارێکی گـەورەو گـرنگ بـوو بـۆ

ئاوارەبوون چونكە دەرگای ژیان و ئاسودەیی و پێكەوە ژیان و هەڵسان و گەڕان و دەربڕینی بیروڕای داخست و وڵاتی كردە دووبەشەوە و دوودەسەڵات و دوو یاساو خەڵكی كورد لە وڵاتەكەی خۆیدا ئاوارەبوو كەواتە ئەگەر من لەوڵاتی خۆمدا ئاوارەبم چ جیاوازی هەیە ئەگەر لەوڵاتێكی تر ئاوارەبم ئەگەر نەتوانم بچمەوە شارەكەی خۆم كەواتەوە لێرە هیچ جیاوازیەك لەو ئاوارەبوونانەدا نابینم ڕاستە وڵات لە شارێكەوە بۆشارێكی تر وەك یەك وایە بەڵام ئەگەر بتوانم هاتوو چۆبكەم ئەگەر نا ئەوە ئاوارەبوونە چونكە كارێكە داسەپاوە...لەڕوی سیاسیەوە لەو ماوەی ئاڵۆزیە دا باری دەروونی لاوان و ڕاوەستانی هیواو ئاواتەكان نامۆبوون و وون بوونێكی یەكجار شێولو بەرۆكی گەنجی كوردی گرتبوو كاتێك شەڕبوو یان كاتێك نەشەڕ نەئاشتی بوو ڕەنگە مرۆڤ نەتوانێ هەست بەو ئێشوو ئازارانە بكات ئەگەر خۆی لەو دۆخانەدا نەژیابێت و زۆربەشمان تێیدا ژیاوین و لەوانەش زیاتر ناخۆشیمان دیووە و ئێستا برینەكانمان دەكولێنەوە كاتێ یادی ئەو ڕۆژگارە سەخت و تاڵ و ناخۆشانەمان دێنەوە یاد كە ڕەنگە ئێستا كەسێك بۆی باسكردینایە بڕوامان پێنەدەبوو ، بەڵام ئەو گەنجانەی لەو زەمەنەدا لاوبوون بەهیوا بوون ڕۆژگارێك بێت وەك هەرلاوێك ژیانی لاوی خۆیان بەسەربەرن بەڵام بەداخەوە لاویەتی ئەوان بووە قوربانی شەڕو بازرگانانی شەڕو ئەوانەی كە بوونە هۆی ئەو دۆخە ناهەموارە بۆ گەلی كورد . دوای كۆتای هاتنی شەڕی ناوخۆو بەسەر چوونی زەمەنی شەری سارد كە زۆر لەسەر كورد و كەسایەتی كورد كەوت ، كەڕەنگە بڵێین ئەوانەی ئاوارەبوون و تاراوگەیان بە دوونیای ئارام و ئاسوودەی ژیانیان هەڵبژارد و هیواو ئاواتەكانیان لەسەر بنیاد نا ئەوانەڕاكردوون و خۆیان لە مەینەتی و ناخۆشیەكانی وڵات و كەس و كارو هاوەڵانیان دورخستۆتەوە ، لێرەدا دەڵێم هەموو كەسێك مافی خۆیەتی ژیانی خۆی بەویستو خواستی خۆی دیاری بكات و ئەگەر ئەوشوێنەی من تێدا دەژیم ڕۆژگارێك ژیان تێدا مەحاڵەو بەپێچەوانەی خواستەكانی

منەوە دەسورێ ئەوە بەمافێکی ڕەوای دەزانم کە ئەو شوێنە هەڵبژێرم کە بتوانم تێدا بژیم ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەوانەی لە دەرەوەی ولات دەژین ولاتی خۆیان ناوێ یان دڵیان پێی ناسووتێ بەڵکو دەتوانم بڵێم لە زۆر کات دا هەن ئەوانەی کە چەندین ساڵە لەولاتەوە دوورن بەلام لە زۆر لەوانەی کە لە ولات دا دەژین دڵسۆز ترە و زیاتر دڵی بەکورد کوردستان دەسوتێ کەواتە ناتوانی دووری ولات بکەینە پێوەرێك بۆ دڵسۆزی و خۆشەویستی چوونکە تا چەند دووربی خۆشەویستی زیاترە.. کەواتە بەشێوەیەکی گشتی لەسەر ئەوە کۆکین کە باری سیاسی کوردستان بەشێوەیەکی گشتی هۆکارێك بوو لەو هۆکارانەی کە کاری کردە سەر لاوان و تەنانەت ئەوانەی کە لاو نەبوون خاوەن ماڵ و منداڵیش بوون و ڕوویان لە هەندەران کرد و ئەم ژیانەیان بۆ خۆیان و ماڵ و منداڵیان هەڵبژارد بەلام ئەمە ئەوەش ناگەیێنێ کە هەندەران و تاراوگە بەهەشتەوە هەموو هیواو ئاوات و خواستەکانی مرۆڤی تێدایە ئەم بەشە لە بابەتەکانی داهاتوو لێوەیان دەدوێن....

### فاکتەرە ئابووریەکان

ئەم هۆکارەش ئەوەندەی لە هۆکارە سیاسیەکان کەم ترنیە چونکە ئەوەندەی کۆچ و ڕەو لەپێناوی ئابووری کرابێ دەتوانم بڵێم زۆر کەم بەهۆی ڕامیاری یەوە بووە . چونکە گەلی کورد بەهۆی هەموو ئەو شەڕو شۆڕو نەهامەتیانەو کە پێشتر باسمان کردن باری ئابووری و ژیان و دەرامەتی خەڵکی بەرەوکزبوون دەچوو تاوای لێ هات سەردەمانێك بازاڕو کاسپی و ژیان لە ڕووی ئابووریەوە کۆتایی پێ هاتبوو چونکە بە هۆی ئابلۆقەی ئابووری و ئیداری کە ڕژێمی بەعسی پێشوو لە سەر هەرێمی کوردستانی دانابوو کەواتە کوردستان لە نێوان دوو ئابلۆقە دابوو ئابلۆقەی نێودەوڵەتی و ئابلۆقەی عێراقی . نەبوونی کارو بێ کاری هۆکارێکی گرنگ بوو چونکە گەنجی ئەو ولاتە دوای تەواوبوونی خوێندن.. ڕوو لەژیان و مەینەتیەکانی و

کاسپی کردن بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانی خۆی و خاو خێزانی. بەهەرحاڵ لەم بوارەدا نەبوونی پلان و کاری دارێژراو بۆ هاندانی خاوەن سەرمایە و دەوڵەمەند و کارامەکانی کە دەتوانن لەم بوارانەدا کاربکەن هەرچەندە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ نەگونجان و نائارامی دۆخەکان لەڕووی ڕامیاری یەوە کە کۆسپی گەورەبوون لەم ڕێگایەدا.... پاشانیش نەبوونی شارەزایی بۆ ئەنجام دانی لەم شێوە کارانە ، چونکە کورد ئەوە یەکەم تەجروبەبوو کە بۆ خۆی هەموو کاروو بارەکانی وولات بگرێتەدەست و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دا بکات و پاشان فکرو شێوازی کارکردنی بەعسی هێشتا لەو ئاستەدابوو کە زۆر بەی ئیدارەو بەڕێووەبەرایەتیەکان کاریان لەسەردەکرد و یاساکانی ڕژێم پەیرەوی دەکران لە بەڕێوەبەرایەتیەکاندا ، ئەمانەو زۆر باری دی کاریگەری تەواویان هەبوو لەسەر ئالۆزی ڕەوتەکە... ئەو کارو کاسپیەیی کە دەکرا زۆربەی زۆری بەقاچاغ بوو لە ڕێگای سنوورەکانی ئێران و تورکیاوە دەکران و لەم ڕێگایانەشدا چەندین کەس بۆ پەیداکردنی خۆراك بۆ ماڵ و منداڵەکانیان بوونە قوربانی و زۆر لەوانەش دەست و قاچیان لەدەست دا بەهۆی ئەو مین و لوغمانەی لەسەرسنوورەکان دانراون و ئەوکات هێشتا پاك نەکرابوونەوە ، کەواتە بارودۆخەکان لەوەدانەبوون ئەگەر کارت بکردایە ئەوە تووشی بەڵادەبوویت و ڕەنگە گیانیشت لەدەست بدایە خۆئەگەر بەپێچەوانەوە ئەوە نان نەبوو بخۆیت و تەنها ڕێگاچارەیەك چەك هەڵگرتن بوو ئەم دیاردەیەش بەشێوەیەك زیادی کرد کە ئەویش مەترسی بۆ سەرگیانی هاووڵاتیان هەبوو..پاشان کاول کردن و دارمانی ژێرخانی ئابووری ، بەشێوەیەك کە هەرچی کارگەو ئەو شوێنانەی کە گرنگ بوون وەك ماڵی باوکی سەدام بوو بێ هەموو تالان و ئاودیوو کرا شۆفڵ و گرێدەرو سەیارەی گەورە نەما ڕەوانەی ئێران نەکرێ مەکینەو کارگەی بەرهەمهێنان تالان کران و پارچە پارچە کران و ئاودیو کران بە بێ ئەوەی کەسێك لێ بپێچینەوە لەم دزیانە بکات ، ئەمانەوو زۆر کاری دی کە هۆکارێك بوون بۆ دارمانی ژێرخانی

ئابووری و هەڵنەسانەوەی بۆ نەوەكانی داهاتوومان ، پێم وایە هەن ئەوانەی ئێستا باس لە باری ئابووری دەكەن و بەباش باسی دەكرێ بەلام ئەو خراپی و بێ سەروبەریەی كە ئێستا باری ئابووری تێیدایە جاران لە كاتی ئابلۆقەكاندا لەوانەیە باشتر بووبێ لە ئێستا.. بۆ هەمیشە مرۆڤ گەڕاوە بۆ شوێنێك كە بتوانێ بەئاسوودەیی بژی و بتوانێ كاربكات بەبێ ترس و زۆركاری ، كاركردنیش پێویستی بە یاساو ڕێسای تایبەتی خۆی هەیە سیستەمی سیاسی ئەمڕۆی دونیا بەباری ئابوری دەسوڕێ كەوایە لەڕوانگەی ڕێككەوتنە ئابووریە گەورە نێودەوڵەتیەكانەوە هەڵسوكەوتی سیاسی دەكرێت بۆیە گرنگە كورد لە بیرو هۆشیدا بێ كە چاك كردنی باری ئابوری و پتەو كردنی ژێرخانی ئابووری ولات ، بەهێز كردنی دەسەلات و ولاتە.. ئەم بەهێزیەش چەندین مانای هەیە لەوانە بەرامبەر دوژمنەكانمان بەهێز دەبین و دۆستەكانمان حسابمان بۆدەكەن و لەناوچەكەدا قورسایی خۆمان دەبێ پاشان بوژانەوەی ولات و بەرەو پێشبردنی و بوونی ماوەی كاركردن بۆ لاوان و نەهێشتنی بەتاڵی.. كەواتە دەبێ حكومەتە هەڵبژێردراوە كوردیەكان گرنگ ترین بەرنامەی كاركردنیان لەم بۆارەدا بێت بەلام بەشێوەیەكی ڕاست و دروست نەك بەپێچەوانەوە چوونكە ئەمڕۆ جەماوەروریاسا و دەستوور و پەرلەمان چاودێری هەنگاوەكانی حكومەت دەكەن و پێویستە حكومەتیش لەو ئاستەدابێت..

## فاكتەرە كۆمەلایەتیەكان

تێك چوون و شێوانی باری كۆمەلایەتی هەركۆمەڵگایەك كە كاریگەری ڕاستەوخۆی نائالۆزی بارە سیاسی و ئابووریەكانی لەسەر دەبێ ، چونكە كۆمەڵگا هەمیشە لەگەڵ دۆخەكاندا دەگۆڕێ و بەهۆی هەرشێوان و نائارامی و لادان لەڕووی سیاسی و ئابووریدا ، لادانی كۆمەڵگا لەڕەوتە كۆمەلایەتیەكانی و شێواندنی بەشێوەیەك

لەگەڵ ئەو دۆخەتایبەتیانەدا بگونجێ و بەدرێژە کێشانی ئەو بارە نائاساییەش دەبێتە هۆیەك کە ئەو گۆڕانکاریانە لە کۆمەڵەگادا بچەسپێن و ببنە بنەما.. بەپێچەوانەشەوە گۆڕان لە باری ڕامیاری و ئابوری بەناوی پێشکەوتن و تازەگەری یەوە زۆر داب و نەریت کە لەگەڵ ئاین و ڕەوشتە هەمیشەییەکانماندا ناگونجێن و بگرە زۆر لەو ڕەفتاروکردەوانەی لەم وولاتانەی دەرەوە دەبینرێن لای کۆمەڵگای ئێمە بەشێوەیەکی هەڵەو پێچەوانە لاسای دەکرێتەوە و شیرازەی کۆمەڵگا دەشێوێنێ.. زۆر گۆڕان و تێکەڵاو بوون لەهەموو لایەکەوە بەدی دەکرێ کە دەبنە پاڵ پێوەنەرێك بۆ دروست بوونی لەو جۆرە هۆکارانە ، کەباری کۆمەڵایەتی لایەنێکی هەرەسەرەکی و پاڵپێوەنەرێکی گەلێك گرنگە کە هەردەم مرۆڤ لەم بارو ڕوانگەیەوە دەتوانێ ژیانی خۆی دیاری بکات و ئێمە و مانانیش خالێك لەسەر ژیان و گوزەرانی ئەو مرۆڤە دەتوانین دابنێین ، واتە وەك پێوەرێکە بۆ بوونی مرۆڤ....

ئەم لایەنەی ئێستا باسی لێوەدەکەین لەڕووی ووردەکاریەوە زۆر خۆی دەهاوێتە ناخی مرۆڤەوە چونکە کۆمەڵگا لەهەر قۆناغێکی ژیاندا بێت بەبێ باری کۆمەڵایەتی بەرێوە ناچێت و هەرگرفت و ناتالۆزێەك لەم بوارەدا هەبێ ئەو ژیان و گوزەرانەی کۆمەڵگا مەحاڵەو پێویستە گۆڕانی بەسەردا بێت.. کەواتەئێمەی کورد خۆمان لەم جۆرە گۆڕانکاریە نزیك کردۆتەوە (درێژەدانی ئەم باسە بۆ برگەکانی داهاتوو) بەلام لێرەدا دەتوانم چەند خاڵێك دیاری بکەم کەبوونە هۆکار بۆ ئەوەی تاکی کورد بڕیاری پەنابەری و ئاوارەبوون لەو سەردەمانەی خۆیدا بدات و ئەو چەرمەسەری و ناخۆشی و دەردەسەریانە قبول بکات بەهیوایەك لە خراپەوە بۆ باش هەنگاوبنێ و ژیانی بگۆڕێ ئەم مافی سروشتی ژیانەبۆ هەر مرۆڤێك...

١. شێوانی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لە نێوکۆمەڵگای کوردەواری بەپێ ی داب و نەریت... لێرە گۆڕانێك بەدی دەکەیت پەیوەندیەکان بەوشێوازەی جاری جاران نەماوە دراوسێ لەگەڵ دراوسێ پەیوەندی توندو تۆڵی نیە و هەندێ کات

ناشی ناسێت ، بەڵام ڕۆژگارێك بەپێچەوانەوە نەك تەنها دراوسێ بەڵکو ناوچەکە یان شارەکە هەموو یەکتریان دەناسی و بەدەم یەکەوەبوون و بەتایبەت دراوسێ و دانیشتوانی گەڕەکەکان پەیوەندیەکی توندو تۆڵیان پێکەوە هەبوو بە ڕادەیەك وەك یەك ماڵ حساب دەکران ، خزمایەتی و دۆستایەتی و هاوڕێیەتی و برایەتی هەموو خۆیان خستۆتە یەك چوار چێوەوە ئەویش چوارچێوەی بەرژەوەندی تایبەتی و بەس..کەواتە ئەم دیاردەیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ قوڵ تر دەبێ و لەم ڕۆژگارەدا بەوشێوەیە هەستی پێناکرێت بەڵام ڕۆژێك دێت بەئاسانی هەست بەوزامانە دەکەین و دەزانین چەند قووڵن و ئەوکات چارەسەریان ناکرێت ، چونکە دەبینە خاوەن کۆمەڵگایەك زۆر بە پێچەوانەی کۆمەڵگای کوردەواری دەبێت ، ئەمەش هۆکارێکە بۆ گوێنەدانە دابڕان و دوور کەوتنەوە چەند ماوەی درێژ خایەن بێت..

٢. زیاد بوونی ڕێژەی دزی و جەردەیی و خراپەکاری و بەکارهێنانی مادە بێ هۆشکەرەکان ( بازرگانی پێوەکردنی و بەکارهێنانی) و جۆرەها ڕەفتاری تر کە بەکەسایەتی کورد نامۆبوون (ئەوەی من لێرەدا مەبەستی باسەکەمە ئەو دۆخە ناهەموارەیە کە لەسەردەمی خۆیدا هەبوون واتە ئەوکاتانەی کە کۆچ و ڕەو بەلێشاو بەرەو وڵاتانی ئەورووپی هەبوو). ئەم جۆرە ڕەفتارانەش لەبنەڕەتدا دەگەڕێنەوە بۆ ڕژێمی لەناوچووی بەعسی کە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە گەلی کورد بەم دەردەبەرێ و سستەمە بەرێت و کۆمەڵایەتیەکانی کورد لەسەر شێوازی راستەقینەی خۆی لابدات و ئەم کۆمەڵگایە بەرەو نەمان و فەوتان و لادانی یەکجارەکی بەرێ .

٣. زیاد بوونی رادەی چەکداری و دروست بوونی شەڕو دوژمنایەتی بەهەموو شێوەکانیەوە ، ئەم دیاردەیەش هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ هەمان ڕێژەی زیادبوون لە برگەی (١) ی سەرەوە ، چونکە کورد بۆ خۆی خۆشەویستیەکی ئەو تۆی لەگەڵ چەك و چەکداری دا هەبوو بۆیە بەئاسان تر و بێ ماندوبوون دوژمنانی کورد زاڵ

دەبوون و مەرامەکانیان دەهاتە دی چونکە کورد هەمیشە ئازایەتی تەواو دەنوێنی لەوەی چەك بەرامبەر کورد هەڵبگرێ و بجەنگێ بەفیتی دوژمنانی کورد .

٤. نەمانی ڕەحم و پەیوەندیە ڕۆحیەکان و خۆشەویستی تاك و گیانی خۆپەرستی وبیرنەکردنەوە لەکەس و وەلانانی هەموو خۆشەویستیەك .

٥. نەبوونی خزمەتگوزاریەکان لە چارەسەری نەخۆشی و پێداویستی ژیان.. ئەمەش هۆکارێکە کە خەڵکی ئێمە دەتوانم بڵێم وولاتانی جیهانی سێهەم لەم گێژاو کێشەدان و هەمیشە جۆرەها نەخۆشی کوشندە ڕوویان تێدەکات و توانای خۆپاراستن و چارەسەریان نیە .

٦. نەبینینی ئایندە و پاشەڕۆژێکی گەش و ڕوناك بۆ نەوەکانی داهاتوو لەمنداڵ و گەنج.. چونکە ئەوەی لەئایندەی عێراق بڕوانێ نەك ئەو سەردەمانەی پێشوو بەڵکو لەم سەردەمی پێشکەوتنەشدا هیچ ڕوناکیەك نیە و لەشەڕو کوشتارو سەربڕین و ئاوارەبوون و دەربەدەری و مەینەتی و نەهامەتی بەولاوەهیچی دی نیەو ناش بینرێ .

### باری ڕاگەیاندن

ئەم فاکتەرە دوولایەنەبولەلایەك ڕاگەیاندنی کوردی ناوخۆ و ئەوەی دیش ڕاگەیاندنی دەرەکی یان بڵێن ڕاگەیاندنی دەرەوە ، ئەم شێوە ڕاگەیاندنانەش دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ دەستی پێکرد بەشێوەیەکی زۆر دیارو بەرچاو ئەویش بەهۆی ئەو ئازادیەی کە کورد بەدەستی هێنا . چونکە ئەوسەردەمانەی پێش ڕاپەڕین ڕژێم ئەو ماوەی نەدا کورد و سەرجەم جەماوەری عێراقی گوێ بیستی ڕاگەیاندنە جیهانیەکان بن و تەنها ڕاگەیاندنی بەعسی شۆڤێنی نەبێ.. بەم شێوەیە ئاشنابوونی تاکی کورد بەدونیا و گۆڕانکاریەکان نەبوو ، بەڵام دوای ڕاپەڕین ئەم شێوازە گۆڕاو بەهۆی

ئازادبوونی کوردستان و سەربەست بوونی ڕاگەیاندن لە ناوخۆی هەرێم جۆرەها کەناڵی ناوخۆیی کرانەوە و پاشان سەتەلایت بۆ ڕوانینی هەموو کەناڵە جیهانیەکان ، بەم شێوەیە کەسایەتی کورد ئاشنابوو بەهەموو گۆڕانکاریەکانی دوونیا ، ئەمەش پاڵپێوەنەرێکی گرنگ و هاندەرێك بوو بۆ گۆڕینی فکرو کەسایەتی کورد.. پاشان نەبوونی ئەو ئازادیەی سەفەرکردن و دوونیا بینین چونکە تاکی کورد هەستی بەوە دەکرد کە عێراق وەك زیندانێکی گەورە وایە و ئاواتی دەخواست ڕۆژگارێك لەم زندانە بچێتە دەرەوە و دوونیا بەچاوی خۆی ببینیّ و کەمێك هەوای ئازادی هەڵمژیّ.. کاتێك سەیری کەسایەتی ئەم وڵاتانە دەکەین ئەوەی بەلایانەوە کێشە نەبێت سەفەرکردن و گەڕان و وڵات بینینە ، بەڵام ئەم گرفتە لای ئێمە هەمان گرفتی جارانە ئەگەر کەمێك گۆڕابێت بەڵام هەر لەو ئاستەدانیە ، ئەم گرفتەش تەنها لای ئێمە نیە چونکە زۆربەی زۆری ناوچەکانی دەروبەری خۆمان ، لەڕوی باری دەرونیەوە کاریگەریەکی گەورەی هەیە بۆسەر هەستی مرۆڤایەتی.. لەم وڵاتانەدا کرێکارێك یان کارمەندێك تەواوی ساڵ کاردەکات و بەپیّ ی یاسایەك لەماوەی کاری لەو ساڵەدا بۆی هەیە پێنج هەفتەی کار یان شەش هەفتە مۆڵەتی هەیە کارنەکات و ئەو ماوەیە بەئارەزووی خۆی لەگەڵ ماڵ و منداڵیدا بەسەربەرێت و لە شوێنی کارەوە پارەی مانگانەی خۆی بیّ کێشەوەردەگرێت و هەندێکیش هەن پارەی زیاتر وەردەگرن بۆ سەرفکردنیان.. بەڵام لە وڵاتانی ئێمەدا بەپێچەوانەوەیە..

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەوانەی لەسەرەوە باسمان کرد خۆی لە چەند خاڵێك دا کۆدەبنەوە و لێرەدا بەکورتی دەست نیشانیان دەکەم...

١. نەبوونی ئازادی بیروڕای کوردی و دواکەوتنی ڕادەی ڕۆشنبیری خەڵکی کورد بەتایبەتی پێش دەست پێکردنی شۆڕشی ئەیلولی مەزن لە ١٩٦١ و پاشان دەست پێکردنی شۆڕش ، ئەم هەلە بۆ ڕژێمە یەك لەدوایەکەکانی عێراق باشتر ڕەخسا کە ڕق و کینەی خۆیان بەرامبەر ڕۆشنبیرو لاو و خەڵکی جوتیارو کرێکاری

کوردستان زیاتر بکەن و هیچ ڕووناکیەك نەهێڵن لە پێش خەڵکیدا یان دەبوو چی ئارەزووی ئەو ڕژێمانە بوایە جێ بەجێ بکەن یان ڕوو لە شاخ بکەن و چەك بکەنەشان و ببنە پێشمەرگە یان ڕوو لەهەندەوران بکەن .

٢. زۆرداری و هێرشی سەربازی ڕژێمەکان بۆ سەر کوردستان و سوتاندن کوشتن و گرتنی خەڵکی کوردستان وای کرد کە هەمیشە خەڵکی کورد نەك تەنها تاکە کەس بەڵکو بە خێزانەوە ڕوو لە هەندەران بکەن .

٣. ڕاگواستن و نەهێشتنی سیمای کوردەواری لە هەندێ شوێن وەك سنجارو کەرکوك و خانەقین و برافەیلیەکان ئەمانەش هۆیەکی تری ئاشکرا بوون بۆ کۆچ کردنی خەڵکی کورد لەو جێگایانە .

٤. ڕێکەوتنی شومی جەزائیر لە ٦ی ئازاری ١٩٧٥ هۆیەکی تر بوو کە خەڵکی کوردستان بەشێوەیەکی فراوان کۆچ بکات .

٥. ڕاگواستنی (ترحیل) گوند و شارۆچکەکانی سنوور بە پێی ڕێککەوتنی جەزائیر خەڵکی کورد هەندێکی خۆی نەدایە دەست ڕاگواستن و کۆچی کرد بۆ هەندەران .

٦. شەڕی عێراق _ ئێران لەماوەی هەشت ساڵدا ، ئەو شەڕە بەبەردەوامی لە سنوورەکانی کوردستان دا هەبوو بۆیە ئەمەش کارگەری گەورەی هەبوو بۆ سەفەرکردن .

٧. کیمیابارانی کوردستان لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە لە هەڵەبجەو بالیسان و زۆر شوێنی تری کوردستان ، ئەمەش بووە هۆی کۆچی یەکجارەکی خەڵکی هەڵەبجە و ناوچەکانی بالیسان .

٨. ئەنفالە بەدناوەکەی پاش شەڕوەستانی نێوان عێراق _ ئێران لە ساڵی ١٩٨٨ ئەوەی بۆی کرا ڕزگاری بوو لەو شەڕە بەکۆمەڵ کوژیە ئەوا کۆچی کرد یان کۆچی پێکرا .

٩. شەڕی لابەلای نێوان لایەنە سیاسیەکانی سەر گۆڕەپانی کوردستان کە هەرجارەو شەڕ لەناوچەیەك دروست دەبوو کە بەهۆیەوە یان بەناچاری یان لەبێزاری واز لە شۆڕش دەهێنرا و کۆچ دەکرا .

١٠. لەساڵانی (١٩٨٨ و ١٩٨٩) بەهۆی ڕێککەوتنی عێراق ئێران و ڕێگا تەسك بوونەوە لە شۆڕش چەندین خەڵکی شۆڕشگێڕ کۆچیان کرد .

١١. پاش ڕاپەڕین و بەبۆنەی کۆڕەوە جەماوەریەکەی کوردستان لە ١٩٩١ کە کۆچی ٤ ملیۆنی کرا زۆر لەوانە نەگەڕانەوە کوردستان .

١٢. نەتوانینی بەرەی کوردستانی لە بەڕێوەبردنی کاروباری کوردستان و هەندێ کەموکوڕی بەڕێوەبردن و زیادەڕەوی هەندێ لایەن لەسەر خەڵکی ئەوەش هۆیەك بوو بۆ کۆچ کردنی خەڵکی ڕۆشنبیر.

١٣. بوونی دوو ئابلۆقەی ئابووری لەسەر کوردستان و نەبوونی ئیش و کارو وەستانی پڕۆژەکانی پیشەسازی و کوشتوکاڵی و بیناسازی .

١٤. پاش هەڵبژاردن و دروست بوونی حکومەتی هاوبەش لە نێوان دوولایەنی سەرەکی و هەوڵدان بۆ دامەزراندنی یان خستنەسەرکاری هەردوو لایەنگرانی ئەو دوولایەنە لە فەرمانگە کارگوزاریەکان (ئەمەش تەنها بەتەسکیەی حزبی دەبوو) کە بووە هۆی دروست کردنی نائومێدی بۆ خەڵی بێ لایەن .

١٥. هەڵگیرسانی شەری نەگریسی نێوان لایەنەکانی کوردستان (یەکێتی و بزوتنەوە.. یەکێتی و کۆمەنیست... یەکێتی و پارتی پێکەوە دژی یەکەکە... حسك و پارتی... پارتی و یەکیەتی).

جگە لەو خاڵانەو چەند هۆکارێکی دەرەکیش هەبوون بۆ کۆچ کردن ئەوانەی کە زۆردیارن ئەمانەن :

- ئەوانەی ماوەی ساڵانی پێشوو لەهەندەران بوون و بونەتە پەناهەندە ئەوا هەوڵیانداوە کەژن و منداڵ و کەس و کاریان بۆلای خۆیان ڕابکێشن .
- ئەوانەی هەندەران هەندێکیان هەوڵیانداوە کە لەکوردستان سوود لەو پارەیە وەربگرن و پرۆژە و خانوو سەیارەیان کڕیووە خەڵکی تریش چاوی لێ کردوون و هەوڵی کۆچ کردنی داوە .
- بوونی هەلی چوون بەناوی چارەسەری نەخۆشی بۆ دەرەوەی وڵات و نەگەڕانەوەیان .
- بەهۆی ڕێگا پێدانی بازرگانی و مانەوەی هەندێك بۆ پەناهەندەی .
- بەهۆی خوێندن

بەهۆی چوونی نوێنەرایەتی لایەنە سیاسیەکان و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی و هونەری و مەدەنیەکان بۆ کۆڕو کۆبوونەوە و مانەوەیان .

# خەونەکانی پەنابەری کورد

خەونی کۆچ بەری کورد بۆ هەندەران ، تەنها هێمایەکی بنەڕەتی و پرەنسیپی نیە کەرێچکەی گرتبێ ، چونکە کۆچبەری کورد بەتەنها دوای خەون و خەیاڵ نەکەتووە.. بەشێوەیەکی ڕونتر دەتوانین ئەو مەبەستانە دیاربکەین و هەرلایەك لەچوار چێوەیەکی تایبەت بەخۆی لێوەی بدوێن ، بەڵام ئەوەش مانای ئەوە نادات بڵێین ڕێژەکان ئەوەندە لەیەکەوە نزیك بن ، بێ گومان ڕێژەی هۆکارو ئامانجەکانی پەنابەری کورد زۆر جیاوازیان هەیە و بگرە لەزۆر کاتیش دا پەیوەندیان پێکەوە هەیە.. ڕەنگە نمونەی ئەو جۆرە کۆچ کردنانە زۆربن بەڵام مەبەست و ناوەڕۆك و دۆزەجیاوازەکانی ئەو سەردەمانەی کە کۆچەکەیان تێیداڕووی داوە جیاوازی هەیە لەوانە.. کۆچی پێغەمبەری موسڵمانان (محمد) د.خ ، یان کۆچی چینەکان یان شۆڕشگێڕانی کوبا ، کۆچی ئیمام خومەینی لەئێران و کۆچی بارزانی نەمر لەکوردستانەوە بۆ یەکیەتی سۆڤیەتی جاران و زۆر کۆچی دی کە لەسەردەمە جۆراو جۆرەکاندا هەریەك بەهۆی ڕووداو و کارەساتە سرۆشتی یان شەڕو پێکدادان ڕوویان داوە ، بەڵام ئەمڕۆی کورد لەسەردەمێکی جیاوازو لەباروەدۆخێکی جیاوازدایە.. ڕەنگە هەر مرۆڤێك لەو کاتەوەی هەستی بەبوونی ئەم دونیایە کردبێ و تاڵی و شیرینی ئەم ژیانەی چەشتبێ و لەسەرماو گەرمادا ژیابێ وبرسیەتی و تینویەتی چەشتبێ زۆر لێکدانەوەو توێژینەوە لەڕووی ئەو ڕووداوانەی لەژیانیدا دەیان بینی و ئەوانەشی کەدوێنێ یان ئەوانەی لەباوباپیرانیەوە بیستوویانە یان لەکتێب و قوتابخانە دا خوێندوونیەتیەوە و بیستوویەتی کارێکی وادەکەن کەمرۆڤ وەك کەسایەتێك چەند بەرژەوەندیەکی تایبەتی هەیە.. بەبێ ئەو بەرژەوەندیانە جوڵانی ژیان و گۆڕانکاری و پێشکەوتن دروست نابێت.. ڕەنگە لەبەرچاوگرتنی

بەرژەوەندی تایبەتی کارێکی خراپ و ناشارستانی و دژی مرۆڤایەتی بێت بەڵام بەرژەوەندی گشتی کارێکی پیرۆزە ، لێرەدا دەبێ بپرسین خەونەکانی تاکی کورد بۆ بەرژەوەندی تاکە کەسیەتی یە یان گشتی..؟ ڕەنگە خەونەکانی خەونی زاتی بن و پەیوەندیان بەو کەسایەتی یەوە بێت بەڵام بەرژەوەندیەکان دەبێ گشتی بن و ئەوجا تایبەتی ، بەم شێوەیە دەتوانین کەمێك لەکەم و کوڕی ئەو کارانەی دژی بەهاو پێوەرو پرەنسیپەکان ، خۆمانی لێ بپارێزین... لێرەدا دەکەوینە ناوەڕۆکی باسەکەمانەوە و لە مرۆڤێکی کورد یان لاوێکی کورد ، ئەم لاوە لەیەکێك لەدێهاتەکانی کوردستان چاوی بەدونیا هەڵهێناوە ولەخێزانێکی هەژار کە بەهۆی کشتوکاڵ و مەڕوماڵات بەخێوکردن گوزەرانی خۆیان بەوشێوەیە دەبەن بە ڕێوە ، ئەمەش دەتوانین بۆ زۆربەی لاوان بەراوردبکەین چونکە ئەم ڕێژەیە لەهەموو ئەو بارانەی ژیانی کورد زۆرترن.. یان لەناو شاردا دەژین و کوڕی کارمەندێك یان کرێکارێك کە مووچەیەکی مانگانەی زۆر کەمی هەیە و کرێچیەو بەشی تەنها کرێکەی ناکات و خێزانێکی چەند نەفەریشە.. لاوی شار قوتابخانە تەواو دەکات بێ کار و کاسپی دەسورێتەوە دەبێ داوا لە باوکی یان دایکی بکات بۆ دینارێك ، ئەوەی لادێش بارودۆخی سیاسی و ئاڵۆزی ناوچە و شەڕی ئێران – عێراق و شەڕی ڕژێم بەرامبەر بەکورد و شەڕی جینۆساید و کیمیاباران و ئەنفال و کاول کردنی دێهاتەکان و سوتاندیان و ڕاگوێزانیان و پەرتەوازەیی دەستی پێکرد و ئاوارە بوون بەرەو دونیایەکی پڕمەینەتی و نەهامەتی و نادیار.. ڕەنگە بەشێوەیەکی گشتی ژیان لەو وولاتانەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەڕووی ناوەڕۆکەوە لەیەك بچن و لەزۆر لایەنەوە یەك دەگرنەوە.. بۆ نمونە مرۆڤێك خاوەنی هیچ ناسنامەیەك نیە و ناتوانێ بەئازادی و بەبێ کێشە سەفەری دەرەوە بکات و ڕوو لەووڵاتانی دراوسێ بکات. ئەمەش وای کرد کە گەنجی کورد بۆ پەیداکردنی نان بەهۆی هێنانی شت و مەك و بردنی کەلوپەل کەچەندین کەس لەورێگایەدا گیانیان لەدەست داو سەدانیش دەست و

قاچیان پەڕی تەنها بۆ پەیداکردنی پارویێك نان بۆ خۆیان و کەس و کاریان و منداڵەکانیان.. کەواتە ئەو گەنجەی لادێ و ئەوەی شاریش هاوتەریب بوون و پێکەوە چارەیان نەما ئەوەی بەدەستەوە ماوە ، دەست دانە چەك و لەم ڕێگایەوە هیواو ئاواتەکانیان بەدیبێنن ، ئەم دیاردەیە ڕۆژگارێك وای لێ هاتبوو کە گەنجی کورد شانازی بەوەوە دەکرد کە چ جۆرە چەکێکی جوانی پێیەو تاقمێکی ئەمریکی و شەیالەی ئەمریکی کە خۆیان بەرامبۆ نەدەگۆڕیەوە ، ئەم دیاردەیە وا خرابووە مێشکی گەنجی کوردەوە کە هیچی تری لەبیرنەمابوو.. دواتر ڕووکردنە مەیدانەکانی شەڕ هەر بەشەڕی ئێران _ عێراق تا دەگاتە شەڕی براکوژی ، کاتێك کەسایەتی کورد لە وولاتەکەی خۆیدا هەستی بەئاوارەیی دەکرد و نەی دەتوانی بەئازادی لەچەند شارێکدا بژی وەك مرۆڤێك دەبوو ترسی لە گیانی خۆی هەبێت ، کەواتە هەست کردن بەوەی کە ئەمە وولاتی خۆت نیەو ئەوانەی کە شەڕیان لەگەڵ دەکەیت لەوولاتێکی ترەوە هاتوون و ئەمەش سیاسەتێکی داڕێژراو بوو ئەو گەنجانەی پێ گۆش دەکراو و ئەو کاریگەریەش تا بەئەمڕۆ بوونی هەیە و دەبێ دان بەو ڕاستیەشدا بنێین ، لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر هێندەی دەرچوون بۆ وولاتێکی ئەورووپی گران و سەخت بوو.. کاتێك گوێت لەراگەیاندن و موهاتەراتی ئێزگەو تەلەفزیۆنەکان دەگرت سام دەی گرت خۆ ئەگەر گوێت لەچاوپێکەوتنی بەرپرسێك دەگرت چۆن جنێوو قسەی سەیرو دژایەتی کردن لەناخیانەوە هەڵدەقولا و هیچ ڕۆشنایەك لەنێوچەوانیانەوە بەدی نەدەکرا و ئەو کات بیرت دەکردەوەو لەدڵی خۆت دا دەت ووت ئەبێ ئەمانە بۆ وابکەن.. ؟ بۆ نایەڵن بەئارامی و بێ گرفت دانیشین.. ؟ یان بۆ وادەکەن..؟ کەواتە پرسیاری ئەی باشە من چی بکەم کە کەسایەتی کورد لەخۆی دەکات..؟ کەواتە دەبێ لێرەدا خۆمان گێل نەکەین چونکە ڕاستی و ڕێگا دۆزینەوە لەلایەن هەر کەسێکەوە بێت تەنها ماوەیەك چەواشە دەبێت یان ماوەیەك بەرژەوەندی خۆی هەست پێ ناکات دواتر ڕێگای خۆی دەدۆزێتەوە.. لەلایەکی دی

ڕاگەیاندنە بیانیەکان کاریگەری خۆیان هەبوو.. بەراوردکردنی پێشکەوتنی زانستی وولاتانی ئەورووپی و ئەمریکی و پێشکەوتنە کۆمەلایەتیەکان و ئابوریەکان.. چونکە ڕۆژگارێك بوو کرێکارێکی ئەلمانی یان بەریتانی یا سینی و ڕوسی و ئەو وولاتانەی تری جیهانی سێهەم و وولاتە عەرەبیەکان و وولاتانی تری ئەورووپی لەعێراق کاریان دەکرد و ئەو پارەی عێراق بەرامبەر دۆلار و پارەی وولاتانی دی زۆر بەرزوو بەنرخ تربوو. بەلام ئەمڕۆ پێچەوانەیە.. لەڕووی بێکاری و نەبوونی هێمنی و ئارامی و دیارنەبوونی پاشەڕۆژ و ئاینـدە ، کەواتە خەونەکانی کەسایەتی کورد لەم ڕوانگەیەوە سەرچاوە دەگرن و دروست دەبن.. هەولدان بۆ بەدیهێنانی ئەو خەونانە گەرانە لەشوێنێنکەوە بۆ شوێنێکی دی.. لەوانەشە بەدواکەوتنی ئەو خەونانە هەمیشە ئاکامی باشی نەبێت و بە دەرەنجام نەگات..

گەڕان و تاقی کردنەوە ئەو ڕێبوارە ماندوو نەناسەن تا بەدوا ئاکام و هیوای ژیانی دەگات.. من لێرەدا دەمەوێ ئەوە بلێم.. کە ڕەخنە گرتن لەلایەن هەندێ کەسەوە بە شێوەیەك دەگیرێ کە کاریگەری سلبی دەبێ و ئەو کەسانە لەڕوانگەیەکەوە بیروڕای خۆیان نیشان دەدەن بەلام دەرەنجام ئەگەر بۆیان بلوێ بەخۆشیان ئەو ڕێگایە تاقی دەکەنەوەو دەگرنە بەر و نمونەشمان زۆرن لەو کەسانەی کە لەوپەری دژایەتی و دژە پەنابەری بوون و لەناکاو ئەو سەنگەرەیان چۆل کردو ئەوانیش بوونە پەنابەر لە وولاتێك و ئەوەیان لەبیر چوو کە ڕۆژگارێك خەلکی تر خۆفرۆش و ڕاکردووبوون و ئەوانیش نیشتمانپەروەرو دلسۆزبوون..

خەونەکانی پەنابەری کورد دەتوانم بەهەموو لایەنەکانیەوە.. وەك لایەنی چاك و خراپ دەست نیشان بکەم چونکە ناتوانین لەم حالەتەدا جیاوازی بکەین چونکە ئەو پەنابەرانە بریتین لەهەموو چین و توێژەکانی کورد..

١.  گۆڕینی ژیان لەجۆرە شارستانیەت و مەدەنیەتەوە بۆ هەنگاوێکی باشترو چاك تر کە بڕوای ئەو ئەوشارستانیەت و مەدەنیەتە پێشکەوتووە لەوولاتی خۆی نابینیٚ.

٢.  بەدەست هێنانی ناسنامەیەك کە بەهۆیەوە دەتوانیٚ هەموو دونیا بگەڕیٚ بەسەر بەستی و چاوی بەدوونیا بکەوێت کە ئەو ڕۆژێك تەنها لەرێگای شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە بینی بوونی . بەلام ئەو ناسنامەیە لەوولاتەکەی خۆی بەدەست ناکەویٚ و بۆی نیە بچێتە دەرەوە و ئازادی گەڕانی نیە..

٣.  ئازادی بیرو ڕا لیبرالیەت کە ئەمەیان لەوولاتانی ڕۆژهەلات دەتوانین بلێین مەحالەو بوونی نیەو ئەوەی کەهەیە تەنها دروشم و قسەو ڕاگەیاندنە و بەپێچەوانەوە لەوولاتانی تری دوونیای پێشکەتوو دەتوانی بەوشێوەی کەخۆت دەتەویٚ بژیت و ئەو ئازادیە فەراهەمە و سەربەستی لە هەلبژاردنی ژیان گوزەرانی خۆت.. هەرچەندە یاسایی ژیان لەهەموو وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی دی جیاوازی هەیە.. بۆ نمونە لەئەلمانیا بەرێژەیەکی زۆرکەم تەنها ئەوانەی بەدەگمەن کە لەم وولاتە فەرمی نین دەزگاکانی پۆلیس و دەزگا ئەمنیەکانی دەولەت ئاگاداریان نین بەلام ئەوانی دی دەبیٚ هەموو زانیاریەکانیان تۆماربکرێن و تەنانەت چون بۆ شارێك و مالٚ گواستنەوە بۆ شارێکی دی یان لەشارەکەی خۆت بگوازیتەوە بۆ مالێکی دی دەبیٚ ئاگاداریان بکەیتەوە و زانیاری خۆت بدەیت و تۆماربکرێت.. خۆئەگەر ئەم کارە لای ئێمە بکرێت نارەزای لێ بەرزدەبێتەوە بەلام لێرەکارێکی ئاسای و ڕۆتینیە و زۆر بەسادەی سەیردەکرێت و بەخزمەتێکی گەورە دەزانرێت بۆ ئاسان کاری کاری هاولاتیان و خێرابەرێوەچونی کارەکانیان و پاشان سەلامەتی و ڕێکخستنی ژیان بەرێوەچوونی بەو شێوەی کە پلانی بۆدانراوە..

٤. دروست كردنی ئایندەیەكی ڕوناك بۆ خۆی كە لێرەدا دەتوانین ئەوانە بەنمونە بێنینەوە كە دەستیان داوەتە خوێندن و ماندوو دەبن كە باشترین پلەی زانستی بەدەست دێنن ئەمەش بەڕێژەیەك لەووڵاتانی سوید یا هۆڵەندا و نەرویج و بەریتانیا و فەرەنساو ئەڵمانیاو نەمساو سویسراو ووڵاتانی دی لەوانەش هەبوون لەڕوسیا خوێندنیان تەواو كرد و ئەمەش جیاوازیان لەڕێژەدا هەیە و دەگەڕێتەوە سەرباروبۆخی گوزەران و یاسا و كۆمەلایەتی ئەو ووڵاتەو شێوەی یاسا پەنابەریەكان و ئەو ئاوێتەبونەی كە دەكرێ لەگەڵ پەنابەراندا ئاوێتەبن.. ولاتێكی وەك ئەڵمانیا بەهۆی بوونی كاری زۆر و خەڵكی زیاتر بیر لەوە دەكاتەوە چۆن پارە پەیدابكات كە سەرچاوەكەی خراپی باری ئابووری كوردستان و كەس و كاری پەنابەران و دواتریش نەخوێندەواری و بیرنەكردنەوە لەم كارە لەلایەن گەنجەكانمانەوە كاتێك ئەو لە ووڵاتەكەی خۆی نەخوێندەواربێت یا خوێندنی تەواو نەكردبێ دەبێ چۆن لێرە بتوانێت بەردەوام بێت و بخوێنێت.. بۆیە ناچار دەست دەداتە كاركردن و پارە كۆكردنەوەو ئەوەش بووە باوێك و پێشبڕكێ لەسەر ئەوەی كام زیاتر كۆبكاتەوە.. بەلام لەووڵاتێكی وەك سوید كە وولاتەكە مامەڵەكردنی جیاوازترە و ئەو كەسایەتیە دەبێ پێش وەخت فێری زمان بێت و ڕوو لەخوێندن بكات و دەبینین زیاتر لەو ڕێژانە لەوێ بەدیاردەكەون و لەهەمو بوارەكاندا بوونیان هەیە و ئەم زانست و زانیاریە لە كوردستانیش سوودی لێوەرگیراوە .

٥. دروست كردن یان دۆزینەوەی ئایندەی منداڵەكانی و فێركردنیان بەزانستی ئەورویی كە پاشەڕۆژ لەخزمەتی ووڵاتەكەی خۆیاندابن و لەڕێگای ئەو تەكنەلۆژیاو نوێكاریەوە سوود بگەیەنێن .

٦. پاراستنی هێمنی ژیان و دووركەوتنەوە لەو كارەسات و مەرگەساتانەی كوردستان.. لێرەدا ئەگەر بەرژەوەندی تایبەتی لێك بدرێتەوە ئەوە دەبێتە

خۆپەرستی و بیرنەکردنەوە لەبەرژەوەندیە گشتی یەکان و ئەمەش هەندێك کەس وای بۆ دەچن و بڕوایان وایە..

٧. تێکەڵ بوون لەگەڵ کۆمەڵگای ئەوروپی و وولاتانی تری دونیا و تێگەیشتن لەژیان و جۆری گوزەران و وەرگرتنی لایەنی باشە و سود وەرگرتن لەڕەفتارو هەڵسوکەوتیان تابتوانریٚ کۆمەڵگایەکی شارستانی مۆدێرنی کوردی دروست بێت بەو شێوەی کە بەهاو نەریتی ڕەسەنایەتی کوردی لەدەست نەدرێت و بپارێزرێت ئەویش بە هێشتنەوەی ڕەگەزی نەتەوایەتی و کوردبوون لە ناخی کەسایەتی کورد لەهەندەران.

٨. گەیشتن بەمەرامە جنسیەکان کە لەوولاتی خۆی دا بیٚ بەشە لێیان و ڕێگای پیٚ نادریٚ ئەو ئازادیەی وەك خۆی دەیەوێت بۆی هەبێت . بەڵام لە هەندەران ئەم دەرگایەی لێکراوەتەوەو بەئارەزووی خۆی حەزو ئارەزووەکانی تێردەکات و ئەمەش ڕاستیەکە و نکولی لێناکرێت و زۆر لەو گەنجانە لە وولاتە ئەوروپیەکان بەهۆی ئەم کارو ڕەفتارانەیانەوە تووشی چەندین گرفت بوون و هەموو بەهاو ئینسایەتی خۆیان لەدەست داوە و بوونی خۆیان بەرەو نامۆبوون و هەڵدێربردووە و کەسانێك هەن بەخۆشیان نازانن بۆ ڕوویان لەم وولاتانەکردووە و تەنها مەبەستیان ئەوەبووە بە مەرامە جنسیەکانی خۆیان بگەن و پاشان هیچی دی بەلایانەوە گرنگ نیە و ئەم جۆرە کەسانە بوونیان هەیەو زۆریشیان لیٚ دەناسین.. ئەمە نەك تەنها ئەوانەی کە بیٚ کەس بوون وەك گەنجێك ڕوویان لەم وولاتانە کردووە بەڵکو زۆر لەوانەی کە بەمنداڵی ڕوویان لەم وولاتانەکردوە و لەگەڵ خێزان و دایك و باوکیان هاتوون بەڵام بەهیچ شێوەیەك لەڕێگای زانست و خوێندنەوە سەرکەوتوونەبوون و ئەم هۆیەش وای لێکردوون ژیانیان بەرەوهەڵدێربەرن و زۆربەی ژیانیان لەزیندان و دادگا و پارەدان و کێشەو گرفت و سەرێشەدا بەسەر بەرن.. لێرەدا چەند لایەنێکی جیاواز دێنە ئاراوە کە دەمەویٚ باسیان لێوە بکەم.. هەموو گەنجێکی کورد کە

لــەوولاتی خــۆی چـــەند دیمـــەنێکی ڕووت و بـــەرەلای و ئـــازادی و کــراوەی لـــەم ڕووەوەلەسەر شاشەی کەناڵەکانەوە دەبینیٚ یا لەگۆڤارو ڕۆژنامەکانـدا دەیـان بـینیٚ بـەرێگای چـەند وێنەیەکـەوە کـە هــاورێکی لــەوولاتێك لەوهەندەرانەیــە لــەرێگای سوتفەوە وێنەیەکی بەخێر و بەیارمەتی و پاڕانەوە لەگەڵ کچێکی بیانی گرتـووە وا لەو گەنجانـەدەکات کـە هەسـت بکـەن کـە ئـەو خەڵکـە شـەوانە یـەکی دە ئـافرەت لەباوەشیاندا دەنوون.. ئەمەش دەبێتـە خـەونی هەنـدێك لـەو گەنجانـەی کـە ئـەوە دەکەنە هیواو ئاوات و مەبەستی ڕوو کردنە هانـدەران . بـەلام کاتێـك دەگەنـە ئـەم وولاتانە و دەبینن کە دەنگی دەهۆڵ لەدوورەوە خۆشەو و ئەوان دەبیٚ لـە دوورەوە سەیر بکەن و بۆیان نیە دەستی لیٚ دەن و ئەو حەزو ئارەزووانەیان بەو شێوەی کـە خەویان پیٚ وە دەدی و لەنێو خەیاڵ و دنیای جوانی خۆیاندا وێنەیان کێـشابوو بـەو شێوەیە دەرنەچوو و ئەو وێنەیە بـەجۆرێك دێتـە بەردەسـتیان بەکۆمـەڵێك گرفـت و کێشەی نامۆ بە کەسایەتی ئەوان کە بەهیچ شێویەك حـسابی بـۆ نـەکرابوو. لەگـەڵ هەندیٚ لەوانەی کە هەوڵدەدەن لەگەڵ بوونی هــەموو ئـەو کۆسـپ و تەگەرانـەی کـە دێنـــە ڕێگایـــان ئـــەوان بەپێـــچەوانەوە کـــار بۆنەوەدەکـــەن هەرنـــەبێت کـــەمێك لەئارەزوەکانیان بەدیبێنن و کەمێك بەو خۆشی و ئارامیەی کە ئەوان دەیبینن و لەو وولاتی خۆماندا لێیان بێبەش بووە پیٚ ی بگات بۆیە ڕەفتارو مامەڵەکردن بەخێرایی گۆڕانی بەسـەر دادێـت و لەماوەیـەکی کـورت دا ئـەو کەسـایەتیە دەبێتـە کەسێکی ئەوروپی ئەگەر بەشێوەیەکی هەڵەو بیٚ بنەما بەلام جل و بەرگ و ڕوخسارو ئاخافتن و بیرکردنـەوەیان گـۆڕانی بەسـەر دا دێـت و وەك گـەنجێکی ئـەوروپی ، ئەگـەر ئـەو کەسە لە وولات خاوەن منداڵ و خێزان بێت ئەوەی بەلای ئەوەو گرنگـە ئـەو بـژی و ئەوەی دەیەویٚ یا ئـەو خەونـەی کـە هەیـەتی بـەدی بـێنیٚ و پێویـستی بـەم شـێوە ڕەفتارانە هەیە... کەسایەتی واهەبوون خێزان و چەند منداڵی هەبووە بەلام ڕەفتارو هەڵسوکەتی لـە منـداڵێکی ١٤ سـاڵ خـراپ تربـووە.. شـەوڕۆژ لـە دیـسۆکۆ و بـارو

کناپیەکاندا و هەمیشە سەرخۆش و هەر سەعاتەو بەدەست ئافرەتێکەوە بەبێ گوێ دانە هیچ یاسایەك و دواتر ڕاهاتن لەگەڵ مادە بێ هۆشکەرەکان و بەکارهێنانیان.. ئەگەر بەشێوەیەکی ڕاست و دروست لەم وڵاتانە تێبگەین تەنها بۆ خۆیان خۆشە و لەخۆیان دێت لەم شێوە ژیانەدا بژین نەك ئێمەی کەسایەتیەکی نامۆ و هەندێ جاریش وێڵ بمانەوێت لەو دەریایەدا وەك ئەوان بژین ، بێگومان گەلێك گرانەو بەو شێوەیە ئاسانیە نیە کەبیری لێدەکرێتەوە..

٩. چاولێگەری.. یەکێکە لەو خەونانەی کە گەنجی کورد نەك بەتێکڕا بەڵکو چەند بەشێکی بێ مەبەست و هیواو هیچ پێش بینیەکی ئایندەی ڕووی لەم نەهامەتی غوربەتە کردووە و وك کابرایەکی کوێر کەوتۆتە کاروانێك و نازانێت ڕووی لەکوێ ناوە ، ئەوانەش هەندێك هەن کە گەیشتونەتە ئەوروپا و بێ بەرهەم دانیشتون و لە خواردن و خوادنەوەو هەڵسوکەوتی ناشیرین و باسکردنی یەکترو نانەوەی گرفت و سوکایەتی کردن بەکەسایەتی کورد و لەهەمان کاتیش دا لەبواری پەروەردەکردنی منداڵەکانی دا ئەو سەرکەوتنەی بەدەست نەهێناوەو ئەوەی خۆی بۆی نەکراوە و منداڵەکانیشی بەهەمان گرفت دەتلێنەوە .

١٠. خۆدروست کردن و پتەو کردنی باری ئابوری کە دەتوانرێ بەخاڵی سەرەکی بژمێردرێت بۆ هۆکاری هاتنەدەرەوەی کەسایەتی کورد کە ئەم خاڵەم لەبەشی هۆکارەکاندا بەدرێژی باس کردووە.. کارکردن و کۆکردنەوەی پارەو خۆپێکەوەنان و ئەوەی کە لەکوردستان و عێراق بەدەست نایەت لێرە ئەگەر ویست هەبێت و وەك هیوایەك لەبەرنامەدا بێت دەکرێ بەدەست بێت تەنها کەمێك ماندوو بوون و کارکردنە.. بەومەبەستەی کە گوزەران و ژیان بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی بگۆڕێت و ئایندەیەکی باش وڕوناك بەرقەرار بکات... لێرەدا کۆمەڵێك لایەنی جیاواز دێنە ئاراوە ئەویش لەچۆنیەتی پەیداکردنی پارە و یەکێکە لەو خاڵە گرنگانەی کە

پێویستە بزانرێ چەند رێگای جۆراو جۆر هەیە بۆ پەیداکردنی پارەو هەموو کەسێك ئەو رێگایانە ناتوانێ تاقی بکاتەوە..

بەلام ئەوەش دەکرێ لەبڕگەی تایبەت بەخۆی لێوەی بدوێن ئەمانە بەشێوەیەکی گشتی هەندێك لەو خەون و ئارەزوانەی کەسایەتی کورد بن کە دەکرێ زیاتر و بەشێوەیەکی ووردەکارییانە زیاتر لەناوەڕۆکی خاڵەکاندا بدوێن بەلام ئەوەی گرنگ بێت ئەو خاڵە سەرەکیانەمان دەست نیشان کردوون کە ئێستا جێ ی سەرنجن و پێویستن لێوەیان بدوێن و پاشان هەندێکیان پێش تر باسیان لێوەکراون و لەبڕەگەکانی پێشتردا لێکۆڵینەوەمان لەسەر کردون و هەندێکیان لەمەو دوا لێوەیان دەکۆلینەوە..

ئەوەشمان لەیاد نەچێ بەهەر شێوەو جۆرێك بێت ئێمەی پەنابەر کوردین و هەمیشە کوردایەتی لەناخماندا برەو دەسێنێت و هەستی نەتەوایەتی و قوڵبوونەوە لەم لایەنەوە بەرەو زیادبون دەچێت و هەمیشە لەناخماندا دەبزوێ و ئەگەر نەتوانرێ جێ دەستمان بەشێوەیەکی گشتی و بەربلاو دیار بخەینە ڕوو بەلام لەئاستی بوونی خۆمان و خێزان و کەس و کارماندا هەرنەبێ توانراوە کارێك بکرێت و چەند بەشێکی ئەو خەونانەمان بەدی هێنابن کە سوودمەندبوون و لەخزمەت کەسایەتی خۆماندا بون.

بێ گومان هەن ڕۆژگارێك خەویان بەوە دیووە کە ببن بەخاوەن خانووی سەربەخۆ یا خاوەن خێزان و منداڵ و پارەو سەیارەو پێکەوەنانی ژیانێك تارادەیەك ئاسوودەو کامەران.. کەواتە بەدیهێنانی ئامانج و هیواکان لەهەر ووڵاتێك بێت کارێکی باشە.. بۆ نمونەش لەم ووڵاتانەدا ئەگەر لەشارێك دا بکەویتە پرسیارکردن بۆ دۆزینەوەی ئەدرەسێك ڕەنگە زۆر ماندووبیت و بەزەحمەت کەسێکت دەست بکەوێت ڕێنمایت بکات.. ئەگەر بپرسیت بۆ..؟

ئەوەی تۆ دەیبینیت لە قەڵەبالغی و سەرقاڵی لەو شارانەدا لە ١٠٪ ی بۆ لە ٢٠٪ ی ئەو خەڵکە هی ئەو شارەیە و ئەوی تری یا بیانیە و یا خەڵکی شارێکی ترە هاتووە بۆ کارکردن لەو شارە یان بەسەر دان لەشارێکی ترەوە بۆ گەڕان و شتو مەك کڕین هاتووە.. نمونەی ئەڵمانیا بەلایانەوە گرنگ نیە لەم سەری وولات بۆ ئەو سەری وولات هەمووی ئەڵمانیا یەو ئەوان کاردەکەن و خزمەت بەوولاتی خۆیان دەکەن و هەموو لایەك بەشاری خۆیانی دەزانن و فکری ناوچەگەری بەلایانەوە نیە. ئەم بیروڕایە لەولاتی ئێمەدا کەمێك گرانە شارێك بۆ شارێك هەست بەوەدەکەین بێگانەین و هەست بەغەریبی دەکەین و بەقورسی کارەکان دەکەین.. لەوانە لەنەویستی خۆمانەوە ئەم هەستە دەکەین چونکە لای خۆمان قبوڵی ئەوە ناکەین لەشاری خۆمان دەردەچین و لەشارێکی تر کاربکەین کەواتە گەڕان بەدوای خەون و هیواو ئارەزووەکاندا کارێکی خراپ نیە و هەنگاوێکە دەبێ گەنجانی پێ هانبدەین.. بەلاّم جۆری ئەو ڕێگا و هەنگاوانە چۆن دەبێ و چۆن بن.. ئەوە بابەتێکی ترەو دەبێ لەلایەکی ترەوە توێژینەوەی و لێکۆڵینەوەی لەسەربکرێت..

### چیرۆکی سەفەرێك بۆ هەندەران

چیرۆکی سەفەرێك بۆ هەندەران بەدەیان هەزار شێوەو بەجۆرەها ئێش وئازارو چەرمەسەری و جۆرەها مەینەتی و لێقەومان و ڕسوابوون و بێ پارەیی و برسیەتی و سەرماو سوکایەتی پێکردن وگرتن و لێدان و زۆرجار مەترسی لەسەر ژیان و سەدان کەسیش لەو ڕێگایانەدا گیانیان لەدەستدا و لە نێو ئاوی ئیجەوە دەریای ناوەڕاست تەنانەت لاشەکانیشیان نەدۆزرانە وە ، کاتێك ئەم شێوە بەرسەرهاتانە دەبیستین و دەیان گێڕینەوە بۆخۆیان داستانێکی تەواون کە دەتوانرێ جۆرەها شێوە فلمی سینەماییان لەسەر دروست بکرێت و بخرێنە کەلتوری ئەو یادگاریانەوە

کە نەوەکانی داهاتوو ئەوانەی کە ئەم شێوە ژیانە و ئەو جۆرە هەوڵدانە بۆ کەمێك ئارامی و ئاسوودەی نابینەوە ، تابزانن ئەوانەی پێش ئەوان چۆن ژیاون..؟ چۆن سەردەمانی گەنجیەتیان بەسەربردووە..؟ چۆن رووبەرووی گرفتەکان بوونەتەوە... ؟ چۆن توانیویانە بەسەروی ئەو هەموو کۆسپانەوە ژیان بۆ خۆیان ئارام راگرن و لەپەناشیا وولاتیان بیرنەچێتەوە . زمان و کەلتورو داب و نەریت وەك خۆی بمێنێتەوە تا ئەوانەی دوای ئێمەیان لەسەر دروستبن . لێرەدا یەکێك لەو چیرۆکە مەینەتیرووییەی کە چەندین کەس نمایش و نواندنی سەرەکیان تێیدا هەیە لەگەڵ ئەوەی شێوە ژیان بەتێکڕا لەو شێوێنانەی کە کورد وەك رێبوارێك پێیدا تێپەریوە باسیان لێوە دەکات ، ئەمە یەکێکە لەوانەی کە بەهەزارەها شێوازی لەم داستانە و خراپترو تراژیدیاتر هەن و ئەوانیش رۆژگارێك دێت خاوەنەکانیان لە دەفتەری یادگاریەکان دەیان هێننە دەرێ و پێش کەش بە خوێنەرانیان دەکەن . وەك ووتم ئەمە چیرۆکی کەسێکە و بەڕاستی رووی داوە و ئەو ناوانەش کە دەنووسرێن لەگەڵ ئەوەی بەتەواوی ئاماژەیان پێنادرێت بەڵام ئەوانیش ڕاستن....

دوای راپەڕین و ئازادبوونی کوردستان و ئەو سەربەخۆییەی کورد بەشێوەیەك ئارامی بەخشیە هەموو کە سێك کە بەو ئومێدەی کورد لەسایەی ئازادی و دەربازبوون لە رژێمی سەدام دەتوانرێ ئەوەی پێشتر لێیان بێ بەری بووین ئەمڕۆ خۆمان بەدەستی خۆمان بەدەستیان بێنین و وولات سەرلەنوێ ئاوەدان بکەینەوە هێندەی نەبرد لەژیانی فرە چەکیەوە بۆ ژیانی یاسا و هەڵبژاردن و پەیرەوکردنی پرۆسەی دیموکراتیانە بەجۆرێك ئەم پرۆژەیە لەلایەك خەڵکی دڵخۆش دەکرد و لەلایەکی ترەوە خەڵکانێك هەبوون بروایان نەبوو و نائومێدی و رەشبینی لەو دۆخەیان بەدیدەکر و لەگەڵ ئەوەش دا هەوای چوونە دەرەوە لێیدابوون و ئەوەی هەبوو ئەوەی دەکراو دەنگ و باسی هەبوو بەلایانەوە گرنگ نەبوو. گرنگ ترین هۆکاریش ئەوە بوو ئەوانەی کە پێش راپەڕین و ساڵانی ٧٠ و ٨٠ تاکان لەدەرەوەی

وولات دەژیان دوای ئازادی کوردستان گەڕانەوە بۆ دیتنی کەس و کاریان ، بەتایبەت دوای ئەو کۆرە چوار ملیۆنیەی کورد . لەگەڵ بڵاوبوونەوەی پارەی ئەورووپا و هەڵسوکەوتی ئەورووپی و باس کردنی ژیانی ئەورووپا و وولاتانی دی فکرو بیرو بەرنامە گۆڕا ، ئەمەش لەو ڕوانگەیەوە بوو کە پلانی سیاسی و ئەوانەی دەسەلاتی ئەو وولاتەیان لەدەست بوو هیچ کات ئەمەیان بەگرفت و کێشە نەدەبینی و بەلاشیانەوە گرنگ نەبوو ، بۆیە هیچ زەمینەیەکی ئەوتۆی لەبار نەبوو کە هیوایەك ببەخشێ تا گەنجی کورد بیر لەدەرەوەی وولات نەکاتەوە ، ڕەنگە ئەم شێوە بیرکردنەوانە لەهەموو دونیادا هەن بەلام نەك بەشێوەی کۆچ . تەنانەت لەم وولاتانەش دا خەڵکانێك هەن بیر لەوە دەکەنەوە بۆ وولاتانی تر بڕۆن بە کۆمەڵێك مەبەست لەوانە کارکردن یان خوێندن و زۆر شتی دی واتە مەبەستێك هەیە . بەلام ئێمەی کورد کە بڕیاری هەندەرانمان دا نەمان دەزانی بۆ کوێ و ئەو قەدەرە چی بۆ ئامادەی کردووین و چیش دێتە ڕێگامان ، بۆیە پشت بەخوا پاسۆرتێکی تەزویر و گۆڕین وێنەو هەندێ جاریش ناو گرنگ نەبوو ئەگەر ئەو ناوە پیاو بێت یان ئافرەت ئەوەی گرنگە تەزکیەیەك و وەرگرتنی سەرەیەك بەواستە یان بەپارە یان وەستان تاسەرەیان بێت.. کات و شێوە و شێوین هەمیشە لەگۆڕاندابوون واتە بەپێی دۆخەکان زیادو کەمی لە کۆچبەران دەگۆڕا ئەوەندی بەرچاو بێت و زیاتر ئەو ڕێژەیە لەبەرزبوونەوەدا بووبێت ئەو کاتانەبوو کە شەڕی برا کوژی دەستی پێ کرد و پێوەرەکانی کەسایەتی کورد و ئەو پلان و بەرنامە ئایندەییانەی ڕویان لە نائومێدی و شکست هێنان و تیاچوون نزیك دەبوونەوە بەجۆرێك ئەوەی ئایندەبوو بەدی نەدەکرا ئەوەی هەبوو تەنها شەڕ و کوشتن و چەك هەڵگرتن بوو دژی یەکتری ، خۆشاردنەوە و لەڕێگای قاچاخەوە لەم شار بۆ ئەو شار سەیارەکانی بزوتنەوە و لایەنەکانی تر بۆ ئەم مەبەستە بەکاربهێنرێن وەك لە وولاتێکی دووژمن دابیت و ئەوانەی خۆتیان لێدەشاریتەوە کورد نەبن یان ئێمە کورد نەبین ، بەهەرحاڵ ئەگەر

باس لەسەر ئەو گرفت و هۆکارانەبکەین زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێ کە ئێمە لێرەدا باسیان لەسەریکەین و لەچەند ووتارێکی پێشتردا بەدوورو درێژی لەم بارەیە بەچەند زنجیرەیەك ووتارم بڵاوکردوونەتەوە ، بۆیە لێرەدا دێمەوە سەر مەبەستی سەرەکی باسەکەمان و لەوێوە دەست پێدەکەم کە لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٤ وە بۆ ١٩٩٥ و دواتر ئەم شێوە لێشاوە کۆچە دەستی پێکرد و پاڵەوانی داستانەکەمان لێرەوە بەم شێوەیەدەست پێدەکات و دەڵێت :

کاتێك بڕیارم دا کوردستان بەجێ بێڵم و ڕوو لەهەندەران بکەم لەگەڵ ئەوەی بڕیارێکی ئاسان نەبوو و لە دوای زیاتر لەچەند مانگێك ئەوسا بڕیاری کۆتایم وەرگرت و پاشگەزبوونەوەی بۆ نەبوو هەرچەندە لە نێو خێزانەکەماندا دەنگی نارەزایی و ڕازی نەبوون بەزبوە وە بەڵام وەك ووتم پاشگەزبوونەوە لەو بڕیارە نەبوو بەو هۆیەشەوە چەند مانگێکی تر دواکەوتم کە دەبوو دەرچم منیش وەك هەموو کەسێك بەدوای ژیانی خۆیدا بگەڕێ و ئەو جێگایەی کە پێی خۆشە تێدا نیشتەجێ بێت و ئارام بژی هەر نەبێت خۆی وەك کەسایەتیەك بدۆزێتەوە ، بێگومان ئەو کاتانە هەندەران دنیایەکی جوان و خەوناوی بوو خەیاڵی پێوە لێ ئەدرا  کە بێ ماندووبوون وکارکردن  و هیلاکی ئەوەی دەتەوێ بۆت دێتە بەردەست و ئەو خەونەبووکە زۆر لاوانی کورد خەویان پێوە دەبینی . تا ئەو شەوەی دەبووە دواشەو کەس و کارو هاوڕێیان هاتبوونە لامان بۆ خواحافیزی کردن لێم هەستم بەهیچ نەدەکرد و کارەکەم بەلاوە ئاسان بوو، کاتێك بەرەبەیان هەموو هەستان ئەوەی شەو باسی لەسەر کراو ئەوەی چەند ڕۆژە پلانی بۆ دارێژم وادەبێتە ڕاستی و ئێستا  دوا کاتە بۆخواحافیزی  ڕاستەقینە و گەڕانەوەی بۆ نیە ئەو کات کۆمەڵێك هەستی سەیر بەمێشکمدا داهات و کاتێك سەیری باوك و دایك و خوشك و برا لەبەرامبەر ئەمری واقع داین و گریان و ترس و غەم و دووری و سەفەرێکی بێ ئاکام و نادیار لەنێو چەوانیان دەم خوێندەوە داوایان دەکرد سەفەرنەکەم و بگەڕێمەوە ،

بەڵام ئەوە بڕیارێکی کۆتایی بوو تەنانەك هەندێ جار دژایەتی فکری خۆشمی دەکرد ، ئەمە ئەوە ناگەیێنی کە بێ ئاگابم لەوەی کە ئەم شێوە سەفەرانە ئاسان نین و پڕن لە ناخۆشی و سەختی و دواترین ئەنجام و دواناکامیان دیار نیە، ڕاستە بەهیوایەك هەنگاو دەنرێ بەڵام مەرج نیە بپێکرێ و ئەنجامی هەبێت . دوای ئەوەی کە لەڕێگای ئێرانەوە لەگەڵ (ئەمینی) برادەرم و خزمێکی ئێرانیمان چووینە کانی دینارو شەوێك لەوێ ماینەوە و لەوێوە بۆ پەیوەندیەکانی مەریوان و ئەوەی پێویست بوو لەبەڵگەی پەڕینەوەلەگەڵ ئەوەشدا لەوێش شەوێك ماینەوە تا کارەکان تەواو بوون و پاشان بۆ نەغەدە بەمەبەستی پەڕینەوە لە مەرزی حاجی ئۆمەرانەوە و شەوێکیش لەنەغەدە ماینەوە و بۆ ڕۆژی دوای بەبێ کێشە پەڕینەوە ، ئەمە تەنها لەبەر ئەوەی نەمان دەتوانی لەسلێمانیەوە بڕۆین و بەم هۆیەوە چوار ڕۆژی خایاند کە ئەگەر وانەبوایە هەمووی چەند سەعاتێك ڕێگابوو دەگەیشتینە هەولێرو لەوێشەوە بۆ دهۆك بەڵام قاجاغ بوونمان وەك تلیاك ئەو ڕێگایەی پێنەداین و ئەو چەند ڕۆژەشمان چوونە سەر ئەو ڕۆژانەی کە بەڕێگاوە لە تورکیاوە بۆ یۆنان دەمان بڕین . لەمانگی ٧ی ١٩٩٥ وە ئەم کاروانە دەستی پێکرد و لە ٣٠ی ٨ ی ١٩٩٥ لەمەرزی ئیبراهیم خەلیل پەڕینەوە کە خزمێکی خۆمم بەناوی (س..) م لەگەڵ بوو، دوای ئەوەی لەسلۆپی بلیتی پاسێکمان بڕی و چەند خێزانێکی کوردمان لەگەڵ بوون لەوانە خێزانێکی بچوك کە پیاوەکە دکتۆر بوو لە گەڵ خێزانەکەی و منداڵێکی بچوك ئەو ماوەی ٢٤ سەعاتەی تا ئەستەمبوڵ بوونە هاوڕێمان و دواتر هەریەك بەڕێگای خۆی چوونکە ئەوان دەیان ویست لەڕێگای لوبنان یان لیبیاوە سەفەربکەن ئێمەش بەرەو ماڵی جەنابی شێخ عوسمانی بیارە دەچووین کە خانەقایەکی گەورەی هەبوو ئەو کوردانەی بێ جێگاو ڕێگا بوون یان ئەو خێزانانەی لە تورکیا دەمانەوە دەچوونە ئەوێ و لەوێش ڕێزوو ئیحترام و پێشوازیان لێدەکرا و خەوتن و نووستن هەبوو تا کاتی دەرچوون دەهات . ئەو کاتەی ئێمە گەیشتین سەرەتای

مانگی ٩ بوو سنوورەکانی نێوان تورکیاو یۆنان چاودێری زۆریـان لەسـەر بـوو زیـاتر لەمانگێك بوو هـیچ وەجبەیـەك دەرنەدەچـوو ئـەوەی دەچـوو پـێش ئـەوەی بگەنـە سەرسنوورەکان دەگیران یان لەسەر سنوورو لەکاتی پەڕینەوە لەئاو دەگیران . بەم شێوەیە ئێمە لەگەڵ هیچ قاچاخ چیەك ڕێك نەکەوتین و تەنها بیرمان دەکردەوە چی بکەین و چۆن کارەکانمان ڕێك بخەین و لەگەڵ کێ بچین... ؟

خزمێکی (س...) کە ماڵیان لە ئەستەمبول بوو لە (بیـوك چەکمەچـە) هەنـدێك جـار سەردانمان دەکردن ، ئەوانیش خێزانێکی گەورەبوون کە چەند کچ و کوڕیـان هـەبوو و سەفەری ئەوڕوپایان کردبوو دایکیان و زاوایەکیان و دوو کچیان و کوڕێکیان لـەوێ مابوون و ئەوانیش چـاوەڕوانی کاروبـاری موعامـەلاتیان دەکـرد و لەلایـەکی تـرەوە هەوڵی ئەوەشیان دەدا بەشێوەی تریش دەرچن و شارەزای تەواویان هەبوو چـونکە ماوەیەکی زۆربوو لـەوێ بـوون منداڵـەکانیان کاریـان دەکـرد و تارادەیـەکیش فێـری تورکیش بووبوون . پاش ماوەیەك زاوایەکیان لە ئەسینا گەڕایـەوە و تـەنها یـەکجار لەو ڕێگایەی دابوو و بۆخۆشی لەنیوەی ڕێگادا بـەهیلاك کـەوتبوو و لـەوێوە سـواری سەیارەبوو بوو گەیشتوبووە ئەسینا ، لەوێدا ئێمە ئەو ماوەی کـە سـەیرمان دەکـرد هەموو ئەو قاچاخچیانەی کە هەبوون جێگای سیقەنەبوون و زۆریان تەنها قۆڵ بـڕین بوو بۆیە ئەو بەقسەی خۆی گەڕابوەوە بـۆ ئـەوەی دوو هـاوڕێ خـۆی کـە ئـەوانیش دەربازبکـات و پاشـان بـرای خێزانەکـەی (ئـا...) و ئـەو دووبـرادەرەی خـۆی کـە هەردووکیان لەتەمەندابوون و پاشانیش (ل...) قاچاخچیەکەمان بوو نەفەری هەزار دۆلاری دەبرد ، بەڵام بۆ ئێمە ٥٠٠ دۆلار و ئەو نەفەرانەش کەلەگـەڵی بـوو بـەخۆیوو یاریدەرەکـەی ٩ نەفـەربووین لەگـەڵ ئـەوەی ئـەو وەجبانـەی تـر بیـست بـۆ سـی نەفەردەبوون و هەمووکێشەی ئەوەیان هەبوو کە ناتوانن بپەڕنەوە ئەو بەری ئاو .

دوو ڕۆژ پێش دەرچوون کەوتینە شت و مەك کڕین وەك خواردن بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ و لەگەڵ ئەوەی کە کڕیبوومان لەماڵی شێخیش ئەوەندەی تریان داینێ و پاشـان جـل

وبەرگ و پێڵاو ئامادەکرا بۆ دابەزین ، چونکە بەهۆی ئەو ڕێگاو بانەوە کە ماوەیەکی زۆر بەپێ دەبڕیت و جل و بەرگ پیس دەبێت بۆیە دەبێ هەریەك جل و بەرگی تازەی پێ بێت .

سەرەتای مانگی ١٠ی ساڵی ١٩٩٥ بوو سەعات ٢ی پاش نیوەڕۆ لەماڵی شێخ سواری سەیارەیەکی سپی بووین کە لەڕێگای ئەدرنەوە چووین بۆ ماوەی چوار سەعات ئەوسا گەیشتینە جێگایەك کە نزیك بوو لەسنوورەوە و هەموو ئەو نەفەرانەش ٧ کەسین و دوو قاچاخچی، ئەو ڕێگایە زۆر باش بوو ئاوی دروست کراوی نەبوو وەك شوێنەکانی تر کە هەموو وەجبەکانی تر گیریان بەدەست ئەو ئاوە دروستکراوانەوە خواردبوو ، بەڵام ئێمە شتی وامان نەدی و نزیك شەشی ئێوارە بوو لەسەر ئاوی گەورەبووین ، ئەم ڕێگایە زۆر بەدەگمەن کوردەکان دەیان زانی و زیاتر ڕێگای ئێرانیەکان بوو ، بەهۆی هەندێ گرفتی بەلەم و ئالۆسکانی حەبل و چەند وردە کێشەیەکی تر کە لەو شێوە شەوانەدا هەمیشە دروست دەبن لەوانە ترس و پەلەکردن و شێوان و پەلەپڕوزێ لەکارەکاندا هەمیشە دواکەوتن دروست دەبێت . مانەوە لەوێ بەهەموو حاڵێك ترسناکەو دەبێ ئەو پەڕینەوەیە ئەنجام بدرێت و پاشانیش لەو بەر کەدەبێتە بەری یۆنان بە هەمان شێوە دەبێ ماوەیەکی باش بەپێ ڕێگا ببڕێت و پاشان لەجێگایەکی باشدا بڕیاری مانەوە بدرێت . بۆ سەعات دوانزەی شەو هەموومان پەڕینەوە و بەبێ وەستان دەست کرا بەڕۆشتن و سەرەڕای ئەوەی کە درەنگ پەڕینەوە بەڵام ماوەیەکی باش ڕێگامان کرد و خۆمان گەیاندە جێگای حەوانەوە و ئەو ڕۆژە لەو دارستانە و لەبن درکو دەوەندا خۆمان شاردەوە بەبێ جووڵان و دەنگ بەرزکردنەوە و هەموو کارێك دەبێ بەوریایی و ترسەوە ئەنجام بدرێت و پاشان دەمەو ئێوارەو لەگەڵ ووردە تاریکی دەستمان کرد بەڕۆیشتن ئەمە یەکەم شەوی ڕاستە ڕۆشتن بوو کە زۆر گرفت هاتە ڕێمان لەوانە سەگێکی زۆرمان لێپەیدابوون و هەندێ گرفتیان بۆ دروست کردین و

زۆر بەگران خۆمان لێیان ڕزگارکرد و ئەم شەوەش بەسەلامەتی خۆمان گەیاندە جێگای حەوانەوەی دووەم ، کەچیاکانی نێوان (ڤێرێ) و (ئەلکسەندەرپولی) بوو، ئەو ڕۆژە دووجار شوانی ئەو ناوچەیە هاتە سەرمان و جاری یەکەم تەنها قاچاخچیەکەیان دی و بەلاّم جاری دووەم هەموومانی دی و دوای قسەکردن لەگەڵی کەسێکی باش بوو و دەستی کرد بەڕێگا نیشان دانمان ، بەشێوەیەکی گشتی خەڵکی ئەو ناوچانە ئەگەر شوان بن یان خەڵکی ئاسایی چاویان بەشتێکی وابکەوتایە یەکسەر ئاگاداری پۆلیسیان دەکرد ئەمە دیاردەیەکی زۆر بەربلاّوی خەڵکانی ئەو ناوچەیەبوو ، دوای ئەو هەموو گێرمەوکێشەیە و بەهاتنی ئێوارە دەستمان کردەوە بە ڕۆشتن و ئەوەی لەوێدا بڕیاربوو دەبوو ئەوشەوە بگەینە شوێنێك پێیان دەووت نەفەقی دوو و لەگەڵ ئەوەش دا ڕێگای ئەم شەوە کەمێك گرانە و ترسی تێدایە چونکە زۆربەی کات بەناو شارو و دێهات و ئەو شوێنانەن کە خەڵکیان لەسەرە و پێویستیشە کەمێك خێرای هەبێت تابگەینە ئەو شوێنە دیاری کراوە و ماوەیەکی زۆر ڕێگامان بری و گەیشتینە دەوروبەری ئەلکسەندەرپولی بەلاّم ئەو دوو نەفەرەی کە ناسیاوی (ل... زەڕەنگەڕ) بووکە دەکاتە قاچاخچیەکەمان ، بەتەمەن بوون بەناوی (ج..) و (خ..) زۆر هیلاك کەوتن و (ج..) بووڕایەوە و توانای ڕێگای بەهیچ شێوەیەك نەما و ئەوی تریان بەتەواوی هێزی لێبڕابوو و لەپشتی شاری ئەلکسەندەرپولی یەوە دانیشتن و کەوتنە موناقەشەی ئەوەی چی بکەین ڕاوەستین یان بڕۆین..؟ دوای ماوەیەك بڕیاری ئەوەدرا کە ئەوشەوە لێرە بمێنین و بەیانی (ل..) ئەو دووپیاوە هەرچۆن بێت ڕەوانەیان بکات بەپاس لەشارەوە و دوای ئێوارە ئێمە دەست بەڕۆشتن بکەینەوە ، چونکە ئەو شارە زۆر خەتەربوو کە دەرچوونی تێیدا نەبوو لەبەر ئەوەی چەند سالآنی پێشوو لەوێوە زۆر خەڵك دەرچوون ئەو ڕێگایە ئاشکرابوو و پاشانیش جێگای حەوانەوەکەی ئەویش ترسناك بوو کەس تێیدا نەدەحەوایەوە بەلاّم ئێمە چارمان نەبوو دەبوو ئەو کارەبکەین

لەبەر ئەو دوو پیاوە ، نەدەکرا بەجێیان بهێڵین ، هەرچۆن بوو لەو شوێنەی لێی دانیشتبووین خۆمان گەیاندە جێگای حەوانەوە بەڵام ئەو شوێنە وادیاربوو کە خەڵکی زۆر لێی مابوونەوەو دواتریش ئەوەمان زانی کە ئەو شوێنە زۆر کەشف بووە. بەیانی (ل.. زەرەنگەر) ئەو دوو نەفەرەی برد بەمەبەستی دەرکردنیان و دوای چەند سەعاتێك بە گۆرانی ووتنەوە گەڕایەوە لامان و دڵی زۆرخۆش بوو ووتی : یەڵا (س..) و (ئا..) خۆتان بگۆڕن و دوای ئەوانیش من و (ع..) ئەوانیش بەڕێ دەکەم و شار هێمنەو مەحەتە زۆر ئارامە و هیچ لەئارادا نیە ، ئەوانی برد . ئەو جێگایەی ئێمەی لێبووین بریتی بوو لەدۆڵێك و هەمووی درەختی دڕکاوی کە چاو چاوی نەدەبنی بەشێوەیەکی وا چڕبوو، ئاوی لێنەبوو و ئێمەش ئاومان لێبڕا و لەو کاتەدا بوو کە دوو نەفەری دووەم خۆیان دەگۆڕی یاریدەدەری قاچاخچیەکەمان چوو ئاومان بۆبێنێ تا ئێمەش خۆمان ئامادەبکەین ، بەڵام سێ چارەکی نەبرد دوای گەڕانەوەی جێگر کە ئاوەکەی بۆ هێناین ، ئەوەنەمان زانی پۆلیس لەهەر چوار لاوە هەڵیان کوتایەسەرمان و هەموو مانیان گرت کە چوار کەس بووین دوای پشکنین و ئەم سەرو ئەوسەر سواری سەیارەیان کردین و بردیانین بۆ سجن لەناو شاری ئەلکسەندەرپولی ، پێش ئەوەی بمان بەن بیرمان لەوە کردەوە کەلەوانەیە ئەو دوانەی پێش ئێمە دەرچوون لەوانەیە بگیرێن بۆیە جل و بەرگە کۆنەکانیان و پێڵاوەکانیانمان لەگەڵ خۆمان برد ، کاتێك چووینە سجن جێگای نەفەرێکی تر نەئەبووەوە ئەوەندە گیراوی تیابوو کە ئەوان دوو وەجبەبوون یەکێکیان وەجبەی (حەمە ..س) و (ئەحمەد عەرەب) ، دوای نیو سەعات ئەو دوو نەفەرەی پێش ئێمە بردنی بۆ ئەوەی سواری پاسیان بکات بەگیراوی فرێیان دانە سجنەوە ، دوای ئەوەی کە سواری پاسەکە بوو بوون گرتبوونیان . ئەو شەوە سەعات ٦ هەموومانیان سواری دووپاس کرد و وەجبەیەکی پاکستانیشیان هێنا لەگەڵمان بۆ سنورداش کردنەوە ، هەموومانیان هێنایەسەر سنور و لەوێ کردیانین بە دیوی

تورکیادا ، هەرچەندە ئێمە لەسجن لەگەڵ وەجبەی حەمە رێك کەوتین کە بۆ جارێکی تر لەرێگا بدەیەنەوە لەگەڵ ئەوان ، چونکە قاچاخچیەکەمان دیار نەمابوو، بەمشێوەیە تەسلیم بەتورکیا نابینەوە چونکە ئەوانیش سنورداشی یۆنانیان دەکردینەوە ئەمە دەبوە تۆپ تۆپێن لەنێوان تورکیا و یۆنان و زۆر خەڵك ماوەیەکی زۆر لەم شێوە تۆپ تۆپێنەدا ژیاوە .

ئەوەش زیاتر بەپشتی جێگری قاچاخچیەکەمان (ش..) کە بڕوامان وابوو ئەویش شارەزایە، لەگەڵ ئەوەی کە حەمە هیچ ترسی نەبوو لەبەری ئاو دوو بەلەمی هەبوو بۆ دووبارە پەڕینەوە ، لەگەڵ دەست بەرداربوونمان لە دەست پۆلیسی یۆنانی و کەوتینە ئەو شوێنەی کەسی لێنەبوو بەڵام بۆ گەڕانەوە دەبێ جارێکی تر لەئاویدەینەوە دوای ئەوەی گەیشتینە ئەو جێگایەی کە دەیان ویست ، دوو نەفەر بەمەلە پەڕینەوە ئەو بەر ئاو ئەو بەلەمە شارراوانەیان هێنایە ئەم بەرەوە ، هەرچەند ئەو شوێنەی کە ئێمەی لێبوو بەری تورکیا نەبوو چونکە ئەوبەرو ئەم بەری ئاو یۆنان بوو دوای ئەوەی یۆنانیەکان ئێمەیان لەناو پەڕانەوە و بەحسابی ئەوان مەجالی بۆ ئێمە تیانەماوە و دەبێ تورکەکان بمان گرن بەڵام قاچاخچیەکان دوای تۆزێك وەجبەکەیان دەشارنەوە تا دەنگی کەس نەمێنێ و هەمووڵایەك واهەست دەکەن تەواو ئەوان دەگەڕێنەوە و ئەمانیش کاری خۆیان دەکەن ، لەم کاتانەدا بوو کە بەلەمەکان هێنرانە ئەم بەرەوە ئەم جارەیان جەیشی سەرسنوری یۆنانی بەسەگەوە هاتە سەرمان و بەپەلە کەوتینە خۆشاردنەوە ، دوای ڕاکردن بەقەراخی ئاوەکەدا و چوینە ناو کۆمەڵێك درکەوە و نەمان ئەزانی چۆن دانیشین و خەویشمان نەهات و نەئەبوو بجوڵێینەوە چونکە کۆمەڵێکی تر هەبوو کە حەمە لەگەڵیان قسەی کردبوو کە گوایە ئێمە چاوەڕوانی جەندرمەی تورکین و دەمانەوێ خۆمان بەدەستەوە بدەین و ئەوانیش بڕوایان کرد و هەستان ڕۆشتن و ئەو کۆمەڵە هەموویان گیران و هەر ئەوەش وای کرد کە یۆنانیەکان جارێکی تر بەدوامانندا

بگەڕێنــەوە ، بۆیــە جێگــای پەڕینــەو ســەد مــەترێك بگوازرایــەوە ئــەو لاوە و پەڕینــەوەش دوای ســەعات ٣ی شەودەســتی پێکــرد چــونکە ئــەو کاتانــە کــەمین هەڵدەستێت.

لەبەر ئەوەی نەفەرەکان زۆر بوون و ئێمـەش هاوکـاری کرابـووین کـە لەگـەڵ ئـەوان بپەڕینەوە و بەم شێوەیە وەستاین تا ئەوان تـەواو بـوون واتـە ئێمـە کەوتینـە دوای ئەوان. پانی ئاوەکەش نزیکەی ١٠٠ مەتر دەبوو ئەو کاتانەش بەهۆی باران بارینەوە ئاوەکە زۆربوو زۆریش خوڕبوو بەشێوەیەك بەس بەبینینی مرۆڤ ترسی لێدەنیشت و ئەوەی مەلەوانی زۆر شارەزاو لێهاتوو نەبێت زەحمەتە بپەڕێتەوە و لەهەمان کاتیش دا زۆر قوڵ بوو و ئـەم بـەرو ئەوبـەری ئـاویش دارسـتانێکی زۆر چـڕو قـەراخ ئـاویش هەموو دڕك بوو، ئەو بەلەمـەی کـە پێـی دەپەڕنـەوە تـەنها بـۆ دوونەفـەر دەبێـت و بەستراوە بەحەبلەوە و لەهـەردوو بـەری ئاوەکـە گیراوە نەفـەری تـر ڕای ئەکێـشن ئەگـەر وانـەبێت خـوڕی ئاوەکـە بەلەمەکـە بەنەفەرەکانـەوە ئـەبات. بـەم شـێوەیە کاتێکی زۆرمان پێ چوو و دنیا بەتەواوی ڕوناکی کردو هێشتا لەسـەر ئـاوین و ئێمـە نەپەڕیوینەتەوە و خەریکین هاوکاری ئەوان دەکەین تاهـەموویان بپەڕەنـەوە و بـەم شـێوە زۆر مانـدوو بـووین، مـن و (س..) و (ش..) و (ئـا..) مـابووین بپەڕینـەوە و چاوەڕوانی ئەوە بووین کە بەلەمەکە لەوبەرەوە بەبەتاڵی بۆمـان بێتـەوە و ئـەو جا بتوانین ئێمەش بپەڕینەوە . لەو کاتەدابوو کە بەلەمەکە لەناوەڕاستی ئاوەکەدابوو و ئێمە ڕامان دەکێشا بەلـەمێکی مـاتۆڕی یۆنـانی لـەدوورەوە بـە بـەری ئەوانـەی کـە بەڕیبوونەوە بەرەو ئەوان دەهات بەڵام ئێمەیان نـەدی و لەهـەمان کـات دا مـەجالی ئــەوە نــەما ئێمــە خۆمــان بــشارینەوە و (ش..) ووتــی : بەســە گیرایــن ئێــستە بەئیسراحەت ئەمان بەنە ئەوبەرەوە..

ئـەو برادەرانـەی ئـەو بـەر حـەبلیان نـزم کـردەوە و خۆیـان شـاردەوە و ماتۆڕەکـە نزیکەی ٥٠٠ مەترێك ڕۆشت و وەستا ، ئەوانەی ئەو بەر تەنها (حەمەی قاچاخ چی و

برادەرێکی (س..) و ئەو برادەرەدەی خۆمان کە پەڕیبووە وە ئەوانی تر خۆیان نەشاردبووەوە و چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد و ئەوان حەبلەکەیان بەدەستەوە بوو تا ڕامان کێشن هەرچۆن بوو بەپەلە هەولی ئەوەمان دا بەلەمەکە بێتەوە لامان و ئەوان لەوبەرەو هاواریان دەکرد خێرا سواربن ، بەڵام چۆن ئەو بەلەمەی لەدوو نەفەر زیاتر هەڵناگرێ و زۆریش ترسناکە چونکە زۆر بچوك بوو بەڵام چارنیە دەبێ بپەڕینەوە بێ لەوەی ئێمە چواربووین ئەوە چوار کۆڵەپشتیشمان پێبوو ئەوانیش تۆزێکیان لەنەفەرێك دەگەڕایەوە ، هەرچۆن بوو سیانمان سوار بووین و لە ئەنجامی ئەم ڕوداوە (ئا..) فەترەیەك وەستا و حەپەسابوو لەناو ئاوەکەدا لە قەراخەوە سەیری ئەکردین نەی ئەزانی بێت یان بمێنێتەوە ، بەشێوەیەك سەرسام بووبوو نەدەجووڵا ، لەلایەکیش ناهەقی نەبوو نەی دەزانی لەکوێ سواربێت چونکە جێگانەبوو، حەبلیش بەئێمەبوو واتە تەواو کەس لەم بەر نەما سەری حەبلەکە بگرێت ، بەم شێوەیە دراین بەدەم ئاوەوە ، کەواتە ئەگەر جێ بمێنێت ئەوە کەس ناتوانێت بێتەوە ئەم بەر بۆیە من هەتا توانیم هاوارم کردبەسەریا و لەو سەرسامیە بەخەبەرم هێنایەوە و بەپەلە بەناو ئاوەکەدا خۆی گەیاندە لامان و دەستی گرت بەبەلەمەکەوە و دەستمان گرت و ڕامان کێشایە ناو بەلەمەکەوە و نازانم چۆن بەلەمەکە وەرنەگەڕا و نەکەوتینە ناو ئاوەکەوە لەترسی یۆنانیەکان و دووبارە گرتنەوەمان هەموو شتێکمان لەبیرکرد کەسیشمان مەلەی نەدەزانی و ئاو تا سەرلێواری بەلەمەکە هاتووە بەدەم ڕۆشتنی ئاوەکەوە بەلەم بەلاری دەڕوات واتە تەوازنی نەما زۆر لەبرادەران دوورکەوتینەوە و وردە وردە ناو بەلەمەکە ئاوی تێ ئەهات و وەك ووتم ئەوانەی ئەو بەر تەنها سێ نەفەربوون کە ئێمەیان ڕادەکێشا و نەیان ئەتوانی یەکەم لەبەر ئەوەی ئێمە قوورس بووین و دووەم ئاوەکەش بەلەمەکەی بۆ خوارەوە دەبرد و زیاتر لەسەد مەتر ئێمە لەخوار ئەوانەوە لەوانەیە سەد مەتر بەدەم خۆش بێت بەڵام لەشەوێکی واداو لەشوێنی بەو شێوەیەدا تەنانەت مەترێکیش زۆرە چونکە

ئەو مەترە ترسی ئەوەی هەیە کۆتای بەژیانت بێنێ . بەلەمەکەمان خۆی دایە قەراخ ئاوەکە و ئێستە دەبێ بگەینەوە لای ئەوان ، هەرچۆن بوو ئێمە بەدەست وەردان لەئاوەکە و لەلایەن ئەوانەوە ڕاکێشان و پەلاماردانی درەکەکان و ئەو دارانەی لەو پەنایەدابوون تا کەمێك قورسای کەم بکەینەوە و یارمەتی ئەوان بدەین کە بتوانن بەئاسانتر ڕامان بکێشن لەگەڵ ئەوەی کە دەستمان هەموو بریندابوو تا گەیشتینە لایان. بەڵام خۆشبەختانە ئەو بەلەمە لەبەزم و هەراو هۆریای ئێمە بێ ئاگابوون و پێیان نەزانین . دوای کە بیرمان دەکردەوە بۆ خۆشمان نەمان دەزانی و بڕوامان نەدەکرد کە چۆن پەڕی وینەتەوە . کاتێك بەتەواوی پەڕینەوە دونیاش بەتەواوی ڕوناك بوو و خۆردەرکەوت بەپەلە بەلەمەکەمان شاردەوە و حەبلەکانمان کۆکردەوە و بەنزیکەی پەنجا مەترێك لەو شوێنەوە چووینە شوێنێکی پوشاوی و دڕکاویەوە تا بتوانین خۆمان بشارینەوە بەڵام چۆن خۆشاردنەوەیەك ئەبێ تائێوارە هەموو بخەوین بەبێ هەستانەوە و قسە کردن و تەنها نیوەرۆکەی کۆمەڵ کۆمەڵ نانمان خواردو خەوتینەوە چونکە دووسێ بنکەی سەربازی یۆنانی لێمان نزیك بوون ، کەواتە ئەو ڕۆژە لەسەر ئاوی گەورەماینەوە تا ئێوارەکەی کە دنیا تاریکی کرد و ئەوسا دووبارە کەوتینەوە ڕێ .

ئەو شەوە خۆمان گەیاندە شوێنی دیاری کراوی حەوانەوە و ئەوشەوە ماینەوە و بۆ شەوی دواتر کەوتینەوە ڕێ و لە دەوروبەری ئەلکسەندەرپولی وەك پێشتر ئامارەم پێدابوو ئەو ناوچەیە ترسناك بوو بۆیە بڕیاری ئەوە درا کە ئێمە لێیان جیابینەوە و شوێنێك دیاری کرا لەوێ یەك بگرینەوە ئەویش لەبەر ئەوەی کە ژمارەی وەجبەکە زۆر بوو ، ئێمە پێش ئەوان دەرچووین و ئەوبرادەرەی کە خۆی بەجێگری قاچاخچیەکەمان دادەنا پێشمان کەوتوو گەیشتینە شوێنێکی شاخاوی و لەبەردەم ماندا چەند سکەیەکی شەمەندەفەر هەبوون ، ووتی : ئێرە ئەو شوێنەیە کە لەسەری ڕێککەوتووین و دەبێ چاوەڕوانی ئەوان بکەین..

دوای حەوانەوە ئەو خەوت.. کاتێك گوێمان لەدەنگی خەڵك بوو پێمان ووت هەستە ئەوە هاتن بابچین بۆلایان یان بانگیان بکەین ووتی : نا وازیان لێبێنن ئەوە ئەوان نین چونکە من ئەزانم ئەوان بەم ڕێگایەدا یەن .

دووبارە خەوتەوە و کاتێك خەبەرمان بووەوە بەیانی بوو نەوەجبەی حەمە هات و نەئێمەش جوولاین ناچار ماینەوە تا دووبارە ئێوارە ، بەوحسابەی کە گرنگ نیە ئەو شارەزایە و لە نەفەقی دوو یەك دەگرینەوە و دەمەو ئێوارە هەستاین بەرەو نەفەقی دوو.. ئەو شەوە بەنیازی نەفەقی دوو بەتەواوی ڕێگامان لێ وون بوو کەوتینە ناوچەیەکی شاخاوی و سەخت ، هەمووی دارستان و درك و چڕی لەوەدا نەبوو هەموو دەست ودەم و چاومان برینداربوو بوو چاو چاوی نەدەبینی و بەو بڕوایەوە ئەو شێوێنانە بۆ یەکەم جاربوو مرۆڤ پێیدا بڕوات ، ئەو شەوە لەسەختی ڕێگاکە من قاچم وەرگەڕاو کەوتە ئازارێکی زۆرەوە نەم دەتوانی بڕۆم بەڵام بە ناچاری دەبوو بڕۆین ، ئەو شەوە دوای نۆسەعات ڕۆشتن نەگەیشتینە شوێنێك کە بزانین کوێیە، دارستانێك بوو پیاو سەری لێدەرنەئەکرد، ئەو شێوە دارستانانەی کە لەفلیمە ئەمریکیەکاندا دەمان بینین هیچ نەبوون لەچاویا ، بەیانی کە ڕۆژی کردەوە لەو دارستانە ماینەوە و بۆشەوەکەی دەستمان کردەوە بەڕۆشتن بەبێ ئەوەی ڕێگای خۆمان بزانین ، چادەیەکمان گرتبوو بۆ خۆشمان نەمان دەزانی بۆ کوێمان دەبات ، زۆر جار بیرمان لەوە دەکردەوە کە لەوانەیە ئێستا شێرێك یان گیاندارێکی دڕندە بۆمان بێت ، ناچار دارمان بەدەستەوە دەگرت و وای لێهات بەڕۆژیش دەڕۆیشتین چونکە ئەوەندە چۆڵەوانی بوو گوێمان لەهیچ نەبوو لە دەنگی باڵندە زیاتر.. نە شەمەندەفەر یان سەیارە یان خەڵکی یان کەمێك ڕوناکی، بەئارەزووی خۆمان ڕێگامان دەکرد و دوای شەوی دووەم نانمان لێ بڕا ئەوەی پێمان مابوو هەندێك هەنگوین و نۆك کە من لەگەڵ خۆم هێنابووم لەگەڵ هەندێك شیرینی بەو شێوەیە

دوای سێ شەو کە بەڕۆژیش ڕێمان دەکرد کاتێك زانیمان هاتینەوە ئەو شوێنەی کە پێش سێ شەو لێی بووین و چاوەڕوانی وەجبەکەمان لێدەکرد .
بەتەواوەتی قاچم هیلاکی کردبووم بەشێوەیەك وا ئاوسابوو نەم دەتوانی لەپێڵاوەکەم دەری بێنم . لەوێ ئێمە چوارمان دەستمان کردە هێرش کردنە سەر (ش..) و خۆمان لێتووڕەکرد و لەو شاخە بوو بەهەراو دەنگ بەرزکردنەوە و دواتر بڕیارمان دا لێی جیابینەوە ئەو هەر سووربوو لەسەر ئەوەی بەرەو نەفەقی دوو بڕوات بەڵام ئێمە بڕوامان پێی نەمابوو چونکە وەك ئێمە وابوو و ئەو جێگیریەی درۆ بوو وەك چۆن کابرای بەزۆر کراو بەدکتۆر ئەویش بەزۆر کراو بەقاچاخچی بوو، بۆیە ئێمە چوارمان بەلایەك ئەو نەفەرێك بەلایەکی تر . ئێمە بڕیاری ئەوەمان دا بگەڕێینەوە ئەلکسەندەرپولی و لەوێوە بۆخۆمان هەوڵی ئەوە بەین دەرچین یان بگەڕینەوە تورکیا، ئەو شەوە نەمان توانی بگەینە ئەو شوێنەی دەمان ویست بۆیە لەشوێنێك حەواینەوە بەڕۆژەکەی و ئەوسا دەمەو ئێوارە دەستمان کردەوە بەڕۆشتن تاگەیشتینە دەوروبەری شاری ئەلکسەندەرپولی و دەمان ویست ئەو جێگایەی یەکەم جار بدۆزینەوە تا لەوێوە دابەزینەوە شارو هەوڵ دەین بەپرس خۆمان دەربازکەین بەڵام بۆمان نەدۆزرایەوە و ناچاربووین زۆر لەماڵەکان نزیك بینەوە و لەباخێکی سێودا خۆمان شاردەوە و ئەو شەوە هەرسێو و ترێمان خوارد، لەگەڵ ئەوەش زۆر ساردبوو تابەیانی خەریك بوو ڕەق بینەوە ، هەرچەندە ئەو شەوانەی پێشوش بەهەمان شێوە زۆر ساردبوو لەسەر ئەو ئەرزە تەڕە دەبوو پاڵ کەوین و بەچوار یان پێنج کەس بەتانیەك چونکە لەناوەڕاستی مانگی دەدابووین و ئەم کاتەش بۆ تورکیا و یونان و ئەو سەرسنورانە سارده و باراناویە . ئێمەش لەوپەڕی هیلاکو ماندوو بووندابووین و تەنها بەلامانەوە ئەوە گرنگ بوو کۆتای ئەم وەزعەبێت بەهەرشێوەیەك بێت ئەگەر دەرچین یان جارێکی تر بگیرێینەوە...

سەعات شەشی بەیانیە و بەتەواوی دنیا ڕوناك نەبووە و دوای ئەوەی خۆمان گۆڕی و چووینە ناوشارەوە لەگەڵ ئەوەی کە هیوامان زۆر کەم بوو لەوەی کە دەرچین بۆیە بلوزو و ئەوشتانەی کە بەکارمان دەهێنان لەبەر سەرما لەگەڵ خۆمان بردمانن. دوای ئەوەی ماوەیەك گەڕاین و ئەو شوێنەمان دۆزیەوە کە بلیتی پاسی لێدەبڕین و لەهەمان شوێنیشدا پاسەکان دەوەستن بۆ سواربوونی نەفەرەکان . ئێمە بووین بەدوو بەشەوە ئەو دوانەی پێش ئێمە چوون و پاش ماوەیەك ئێمەش گەڕاین و دواتر ئێمەش چووینە هەمان شوێن بینیمان ئەوان لەسەر کورسی دانیشتوون و بەبێ دەنگ بەلایاندا چووین وەك نەیان ناسین و ڕاستەو خۆ بۆ ئەو شوێنەی کە بلیتی لێبکرین و من داوای دوو بلیتم لێکرد بۆ سالۆنیك کە شارێکی یۆنانیە و یەکێك لەو شارەگەورانەی کە دوای ئەسینای پایتەخت دێت ، لەو کاتەدابوو دوو پۆلیسی مەدەنی سەرشانیان گرتم و ووتیان بەیارمەتی پێناسەکەت.. (کام پێناسە ئەو پێناسەی کە دەتوانین هەموو دونیای پێبگەڕێن و بەئازادی ووڵاتەو ووڵات بکەین...). لێرەدا ناچاربووم بڵێم کوردم کە ووشەی کوردۆس لای یۆنانیەکان پێناسەبوو بەڵام نەك ئەوانەی سەرسنوور ، هەرچەندە ئەوان دەیان زانی چونکە ئەو دوانەی پێش ئێمە گیرابوون و وادیاربوو چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد . هەرچوارمانیان بەرێکردەوە بۆ سجنە حەیاتەکە و وەك هەموو جارێك ئەو ژوورە بچوکەی سجن یەکێکی تری نەئەگرت و چەند وەجبەیەك لەوێ بووین ئەم جارەیان لەگەڵ کەسێکی تر ڕێك کەوتین لەسەر ئەوەی کە بگەڕێینەوە تورکیا بەڵام بێ سنورداش کردنەوە ، ئەوەش کارێك بوو زۆربەی کات تەنها قاچاخچیەکان دەیان توانی.. دوای ئەوەی ئەو شەوە لەسجن ماینەوە و سبەی ئێوارەکەی سەعات شەش هەموومانیان سواری پاس کرد و بەرەو سنورەکانی یۆنان تورکیا بەمەبەستی سنورداش کردنەوە وەك جاری پێشوو لەلایەن یۆنانیەکانەوە بەرێکراین و کەمێك خۆمان شاردەوە و پاشان جەماعەتێك لەئێمە گیران و دواتر ئێمەش لەو کاتانەدابوو

كە ڕامان كرد و تەقەیان لێكردین بەڵام ئێمە چەند نەفەرێك بووین لێیان دوور كەوتینەوە و لەشوێنێكدا خۆمان شاردەوە تا سەعات سێ ی دەمەو بەیان زۆر ساردبوو وەزعیەتی جل وبەركمان بەوشێوەیە نەبوو خەریك بوو ڕەق بینەوە ، ئەوجا كەوتینەڕێ و بۆ مەلابانگدان گەیشتینە ئیپسەلا و لەوێ وە بەتەكسی بۆ شاری كیشان و و لەوێشەوە بەپاس بۆ ئەستەمبول گەڕاینەوە بەبێ ئەوەی دەست جەندرمەی توركی بكەوین..

دوای ئەوەی ئێمە بەو وەزعە هیلاكەوە گەڕاینەوەو زۆر ماندووبووین و من قاچم تەواو ئازاری دەدام و بەشێوەیەك ئاوسابوو نەم دەتوانی لەپێڵاوەكەم دەری بێنم . هەرچۆن بوو ماوەی چەند ڕۆژێك لەماڵی شێخ ئیسراحەتمان كرد و (ل.. زەڕەنگەر)ی قاچاخچی گەڕایەوە كە چووبووە ئەسیناو و بەقسەی خۆی دوای ئەوەی ئەو دوو نەفەرەی بەڕێكردبوو گەڕابووەوە بەدوای ئێمەش دا و كەسی لەوێ نەدیبوو. بەهەرحاڵ بڕیاری ئەوەمان دایەوە كە بەم نزیكانە دەرچینەوە چونكە زۆر لەوە دواكەوتن باش نیەو یەكەم وەزعیەتی ماڵی شێخ بەتەواوەتی خراپ بوو بوو لەلایەن جەندرمەو پۆلیسەوە تەواو خراپ بوو هەموو كات دەهاتن و دەگەڕان بەدوای خەڵكاو ژووراو ژور دەگەڕان و دووەم دنیا بەرەو سەرما و زستان دەچوو. بێگومان ماڵی شێخ یەكێك بوو لەو شوێنانەی كە هاوكاری زۆری ئەو خەڵكەیان كرد و خەڵكی لەوێ دەحەسانەوە و دەخەوتن و نانیان دەخوار و لەزۆر كاری خراپ و لادان دەپارێزران كە هەمیشە دەبێ جێگای ڕێزو سوپاس بن ئەوەی ئەوان دەیان كرد لایەنەكان و نوێنەرەكانیان بەپێچەوانە بەرامبەر بەو خەڵكانەی كە هانایان بۆدەبردن ڕەفتاریان دەكرد . وەك ووتم لەو كاتانەدابوو كە ئێمە لەخۆ ئامادەكردن بووین و ئەمڕۆ بەیانی بۆدەرچوون جەندرمەو پۆلیس دایان بەسەر ماڵی شێخ دا و ژوور بەژوور دەگەڕان و ئەو شەوە زۆربەی زۆری ئەو خەڵكە گیرا و هەریەك بەبیانویەك ڕزگاری بوو، بەڵام چواردەكەس گیران و سنورداشیان كردنەوە ، پێش

ئـەوەی ڕەوانەبکرێنــەوە ئـەو چواردەکەسـە هێنرانــەوە مـاڵی شـێخ بـۆ ئـەوەی کەلوپەلـەکانیان بـەرن تـا سـنورداش بکرێنــەوە و چـوار کەسـیان ڕایـان کـرد و بەتەواوەتی وەزعەکەیان خراپ کرد و جەندرمە زوو زوو دەهاتن و دەگـەڕان بـەدوای ئەو چوار کەسەیا و هەڕەشەیان دەکرد لەبری ئەوان خەڵکی تـر دەگـرن . تـا کـاتی دەرچوونی ئێمە ئەم وەزعەی ماڵی شێخ بـەم شـێوەیەمایەوە.. بـەڕۆژ ئـەو خەڵکـە نەیدەوێرا لەماڵی شێخ بمێننەوە ناچار دەمان دایە ئەو دەشـتەو هەریـەك لەشـوێنك خـۆی دەشـاردەوە تـا دنیـا تـاریکی دەکـرد و ئـەوکات دەگەڕانـەوە و بۆشـەویش حـەرەس هـەبوو ئەگـەر هەسـت بکرایـە جەندرمـە هـات ئـەوە خێـرا ئـەو خەڵکـە ئاگاداردەکرایەوە . ئەو شەوەی کە بەتەواوی بڕیار درا کە سەفەردەکەین بەڵام ئـەم جارەیان وەك جاری یەکەم نەبوو چـوونکە هـەواڵی ئـەوە بڵاوبـووەوە کـە ئێمـە زۆر بەئاسانی لەئاو پەڕینەوە و کێشەمان نیـە تـەنها لەوبـەر ئـاو گرفتمـان هەیـە بۆیـە قاچاخـچیەکان کەوتنـە ئـەوەی کـە چـۆن لەگـەڵ قاچاخـچیەکەمان ڕێککـەون تـا وەجبەیەکی گەورە پێکەوە نێن و تا ئەو بەر ئاو لەسەر (ل.. زەڕەنگەر) و ئـەو بـەر ئاویش (ف.. عەپسی) و (ب.. قەرەقۆل)، وەجبەیەك دروست بوو لە ٢٥ نەفەر . لـە ناوەڕاسـتی مـانگی یـانزەداین و سـەعات ١٢ ی شـەو سـەیارەکەهات و هـەموو سـەرکەوتین و بـۆ سـەعات دووی شـەو شـۆفێرەکە هەڵەیـەکی هاتووچـۆی کـرد لـە (چوڕلو) و لەلایەن مرورەوە ڕاگیرا و یەکسەر شکیان لێکرد و کە سەری سـەیارەیان هەڵدایەوە ئەوە چییە ئەو هـەموو نەفەرەچییە..؟ دوای ئـەوەی تـەفتیش کـراین و ئیفادەیان لێـوەرگرتین و هـەموو مانیـان بـرد بـۆ سجن ، ڕەفتاریـان زۆر بـاش بـوو لەگەڵمان نەتئەووت ئەمانەتورکن ڕێزیان لێگرتین و لەیەکەم شەوەوە دەرگای سجن لەسەر پشت بوو و ئەو شەوە چایان بۆهێناین و ئەوانیش بەهەمان شێوە ڕەفتاریان زۆر باش بوو دوای شەش ڕۆژ لەسجنمان براین بـۆ مەحکەمـە ، هەرچـەندە سـێ ڕۆژ دوای ئێمـە ٤٢ نەفـەری پاکستانیان گرتبـوو وئەوانیـشیان هێنایـە لای ئێمـە بـەڵام

جێگای ئەوان جیاوازبوو . پێش ئەوەی بمان بەن بۆ مەحکەمە نەفەرێکیان لەگەڵ خۆیان بردەوە بۆماڵی شێخ و هەموو جەوازەکانمانیان هێنایەوە بۆمان و دووبارە تەحقیقێکی توند تریان لەگەڵ کردین و بەهەردەپەنجە مۆریان پێکردین و دوو دوو ڕەسمی فۆتۆکرافیان گرتین و ئەو شێوە ڕەسمیاتە توندە ورەی هەموومانی بەردابوو بەشێوەیەك دڵنیابووین لەوەی کە سنورداشین . دوای ئەوەی هێنرایەوە بۆ سجن لەبێ هیوای بیرمان لەوە دەکردەوە هەرچۆن بێت ئەوە لەبیرخۆمان بەرینەوە و برادەران بەگۆرانی و نوکتەوە یاری کردن کاتمان بەسەر دەبرد زۆر کات پۆلیسەکانیش دەهاتنە لامان زۆربەی کاتیان لای ئێمەبەسەردەبرد بەتایبەت ئەوکاتانەی کە ئیشیان نەبوو، هەرچەندە سجن بوونمان زۆری خایان و ئێمەش وەزعەکەمان لەبیرخۆمان بردووبووەوە و لە خانەقاش ئەو وەجبەی ئێمە ناونرابوو وەجبەی دووەمی سنور داش چونکە هەواڵی تەواو بۆ خانەقا چووبوو کەوا ئێمە سنورداش کراوینەتەوە . ئەو ڕۆژەی کە براینە مەحکەمە دادوەر بڕیاری خۆی دا ئەوانەی کە جەوازیان هەیە ٧٥ هەزار لیرە غەرامە و ئەوانەی جەوازیان نەبوو ٣٧٥ هەزار لیرە غەرامەبکرێن ، چونکە شانزە کەس جەوازەکانیان بۆنەهاتبوو و بەکامێرای تەلەفیۆنیش وێنەگیراین و شەویش تەلەفزیۆن بڵاوی کردەوە ، کە ئێوارەکەی گەڕاینەوە بۆ سجن پێیان ووتین ئێرە پۆلیس نیە بەڵکو ئەمنیەتە .

دوو ڕۆژی دوای مەحکەمە زۆر ناخۆش بوو چونکە دادوەر حوکمی دابووین و هیچمان لەسەر نەمابوو بەریان نەئەدایىن نەمان ئەزانی بۆچی و دوای دەرکەوت کە دوابڕیاری دادوەرو و ئەنجامی ئەو ڕاپۆرتەی ئەمنیەت لەسەر ئێمە دراوەتە وەزارەتی ناوخۆ لەئەنقەرەو چاوەڕوانی بڕیاری کۆتایی وەزارەتن . دوای ڕۆژێك هاتن تەواوو بڕیارهاتووە دەتان بەیەنەوە یۆنان و ئەو شەوە تادرەنگانێك چاوەڕوان بووین هیچ نەبوو بۆ بەیانی دوای نیوەڕۆکەی هاتن و بڕیارەکەی وەزارەتی ناوخۆیان پێبوو کە سێبڕگەبوو.. ناردنەوە بۆ عێراق.. گەڕانەوە بۆ ئەستەمبوڵ..

ڕەوانەکردنیان بۆ یۆنان. بەئارەزوی خۆیان دەتوانن یەکێك لەو بڕیارانە هەڵبـژێرن . ئێمە داوامان کرد کە ناردنمان بۆیۆنان بەشێوەی ڕەسمی بێت ئەوان نامەیەکیان بۆ نووسـین بـۆ ئەپـسەلا و ناردنەکـە بەشـێوەی ڕەسمـی نـەبوو بۆیـە ڕازی نـەبووین و بڕیارماندا بـۆ ئەسـتەمبوڵ . بـەو دوانیوەڕۆیـە سـواری پاسـیان کـردین و دوای دوو سەعات لەبەردەم ماڵی شێخ دا دایان بەزاندین کەس باوەڕی نەدەکرد بەلای ئەوانـە دەنگۆی ئەوەی هەبوو ئێمە ئێستا لەعێراقین و سنورداش کراوینەتەوە.

بۆ دوای دوو ڕۆژ بڕیاری گەڕانەوەمان بۆ ڕێگای یۆنان دا و ئـەم جارەیـان ژمارەمـان چووە سەرو سی کەسەوە کـە پێـنج ڕابەربوون ئـەو شـەوە پاسـێکیان هێنـا بـەلام لەسەر هەندێ شت لەگەڵ شۆفێرەکەیا ڕێك نەکەوتن و ئەو شەوە دیسان ماینـەوە و بۆ سبەی شەو لۆرێیەکی بچوکیان هێنا کە جێگـای هـەمووومان نـەدەبووەوە و تـەنها بیـست کـەسمان سـەرکەوتین و ئـەوانی تـر مانـەوە بـەو پێیـەی سـبەینێ لەگـەڵ دووڕابەرەکەی تر بێن بۆسەر ئاوی گەورە ، ئێمە گەیشتینە ئەو شوێنەی کـە دەبـێ لەسەیارە دابەزین کە سەعات دەی شـەو بـوو ، دەبـوو مـاوەی یـەك سـەعات بـەپێ بچین و پێش ئەوەی بگەینە سەر ئاوی گەورە تووشی ئاوێك بووین کە هی باراناوبوو دەبوو لێی بدەین و ناچار لێمان داو پەڕینەوە و بۆ یانزەی شەو گەیشتینە سەرئاوی گەورە....

دوای گەیشتنمان بۆ سەر ئاووی گەورە دەست کرا بەپەڕینەوە و بۆ سەعات چـوارو نیـوی دەمـەو بـەیانی تـەواوبوین و هـەمووومان کەوتینـە بـەری ئـەو بـەری ئـاو واتـە لەدیووی تورکیا نەماین و چووینە بەری یۆنان و لەبەر ئەوەی کات دەمەو بەیان بوو و نـەمان دەتـوانی دەسـت بەڕۆیـشتن بکـەین بۆیـە ناچـاربووین بـە کـەمێك دوورتـر لەشوێنی پەڕینەوە جێگای حەوانە دیاری بکـەین و لـەوێ دا بمێنینـەوە تـا سـبەی ئێوارەکەی ، بێ گومـان وەك پێـشتر باسـم کـرد ئـەم شـوێنی حەوانەوانـە چـۆنن و بەهەرحاڵ ئێوارەکەی کە دنیا تاریك بوو خۆمـان ئامـادەکردو کەوتینـە ڕێ سـەعات

١١ی شەو گەیشتینە ناوچەیەکی شاخاوی لاماندا بۆ کەمێك حەوانەوە چونکە ئەم جارەش دووکەسمان لەگەڵ بوون ناتەواوو بوون و گرفتیان هەبوو لەقاچیاندا و بەبۆنەی ئەوانەوە دەبوو زوو زوو بحەوێینەوە ، بڕیار وابوو ئەو شەوە بگەیینە نێوان ڤێرێ و ئەلکسەندەرپولی لەگەڵ ئەوەی کە هێشتا مابوومان بگەینە ئەو شوێنەی کە دیاری کرابوو، هەر لەو شوێنەدابووین بۆ حەوانەوە بارانێکی زۆر و بێ وەستان زیاتر لەپێنج سەعات باری و هەموو ئەو بارانە لێی داین و گیانمان بەتەواوی تەڕبوو بوو ناچار بووین ئاگربکەینەوە و لەلایەك ووشك ئەبووینەوە و لەلایەك تەڕ بەو شێوەیە نەمان توانی لەشوێن خۆمان بجووڵێین و ناچار ماینەوە و کردمانە جێگای حەوانەوە ناوچەکە شاخاوی بوو و دوور بوو لەهەموو مەترسیەك و ڕۆژی دوای لای ئێوارەکەی دوای خۆئامادەکردن دەست کرایەوە بەڕۆیشتن و و نزیك سەعات دوانزەی شەو دیسانەوە بارانێکی وەك بارانەکەی شەوی رابوردوو باریەوە بەلام بۆماوەی یەك سەعات ئەو ماوەیە هەرچۆن بوو لەنزیك سکەی شەمەندەفەربووین و لەوێ ژوورێك هەبوو لەگەڵ بچوکی ژوورەکەش بەلام بەپاڵەپەستۆ جێگای خۆمان کردەوە ، هەر لەو ماوەیەدا بوو هەستمان بەوە کرد کەکەمین هەیەو نزیك لەئێمەیە ، بۆیە وەستاین تا دوای سەعات سێ ی شەو دەستمان کردەوە بەڕۆیشتن و بۆ سەعات شەش و نیوی بەیانی گەیشتینە ئەو جێگایەی کە بڕیاربوو دوێنی شەو پێی بگەیشتینایە بەلام شەو و ڕۆژێك دواتر گرنگ نیە گرنگ ئەوە بوو بەسەلامەت و بێ کێشە بگەین دوای حەوانەوەی ئەو ڕۆژە و لای ئێوارەکەی بەرەو نەفەقی دوو کەوتینە ڕێ و ئەو ڕێگایە زۆر ناخۆش بوو چونکە هەمووی دارو دەوەن و بەرزی و سەختی زۆری تێدابوو هەموو بەتەواوەتی هیلاکیمان پێوەدیاربوو بەلام ناچار دەبووین ڕێگابکەین ئەگەرنا بەجێدەماین بۆ سەعات شەشی بەیانی گەیشتینە ئەو دیوو نەفەقی یەکەوە ، بۆیە لەنێوان نەفەقی یەك و دوودا ماینەوە چونکە نەمان توانی بگەیینە نزیك نەفەقی دوو لەبەر ئەوەی

وەجیەکە زۆربووین و خەلکمان لەگەڵ بوو کە توانای ڕێگا ڕۆیشتنی زۆریان نەبوو و زوو زوو هیلاك دەبوون بۆ ئەو ڕۆژەش لەوێ مایەنەوە و بۆ ئێوارەکەی سەعات پێنج و چل و پێنج دەقە دەستمان بەڕۆیشتن کرد و توانیمان لەنەفەقی دوو نەفەقی سێش بەین بەشێوەیەك ئەو شەوە زۆرباش ڕێگامان کرد و لەسەعات یانزەی شەو لەمەحەتەیەکی شەمەندەفەر وەستاین و چاوەڕوانی دوا شەمەندەفەری سالۆنیکیمان کرد بگەڕێتەوە ئەوکات بتوانین لەمەحەتەکە بدەین و تاسەعات یەکی شەو چاوەڕوان بووین و دواتر بەناو مەحەتەکەدا پەڕینەوە و بۆ سەعات پێنج و نیوی بەیانی گەیشتینە شاخەکانی نزیك گوندی ئیسلامی و لەوێ لامان دا بۆ حەوانەوەی ڕۆژ و دیسانەوە وەك هەموو ئێوارەیەك دەبوو دەست بکەینەوە بەڕێگا و لەو ماوەیەدا کە ڕێگاکە کەمێك گران و سەخت تربوو لەبەرئەوەی دوورو درێژی و سەختی و ترسی زیاتری تێدابوو لەسەعات یەکی شەو گەیشتینە قەلایەك برادەران وتیان ئەتوانن لێرە بحەوینەوە چونکە جێگای داهاتوو کەمێك دوورەو لەوانەیە بەو ماوەی کەماومانە نەگەینێ بۆیە پێمان باشە ئەم شەو کەمێك زووتر بحەوینەوە و لەم قەلا ڕوخاوەدا بمێنینەوە چونکە شوێنێکی زۆر سلامەتە و کێشەی نیە ، بەلام لەگەڵ ئەوەی خۆشحاڵ بووین بەو بڕیارە چونکە دەمان ویست کەمێك زیاتر بخەوین و بحەوێینەوە لەگەڵ ئەوەی کەدنیا زۆر سارد بوو و لەگەڵ ئەوەی کە قەلاکە دوو نهۆم بوو لەڕێگای کونێکی بچوکەوە دەتوانرا یەك یەك بچنە سەرەوە هەندێك لەبرادەران لەڕێگای ئەو کونەوە چوونە سەرەوە وبەیانیەکەی لەنیوەڕۆدابووین یەکێك لەو برادەرانە لەو کونەوە کەوتە خوارەوە بەلام باش بوو بەو شێوەیە زیانی لێنەکەوت ، لای ئێوارەکەی ئاگاداری هەموو لایەك کرا کەڕێگای ئەم شەومان وەك هەموو شەوەکانی ترنیە لەگەڵ ئەوەی کە دوورترە و سەخت تریشە بۆیەدەبێ هەموو ئامادەبن و باش ڕێگابکەن و لەو نێوانەشدا جێگای حەوانەوە نیە واتە دەبێ بگەینە شوێنی خۆمان ، ئەویش بەبوونی کەمین لەچوار شوێنی ئەو ڕێگایە، پاش

ماوەیەک ڕێگا یەکێک لەو برادەرانەی لەگەڵمان بوو بووڕایەوە و پاش ماوەیەک هاتەوە سەرخۆی و دەست کرایەوە بەڕۆیشتن دیسان بووڕایەوە بەم شێوەیە ئەو شەوە سێ جار بووڕایەوە و دواجار تەواو توانای ڕۆشتنی نەماو و کەوت دوای ئەوەی هەندێ فریاکەوتنی سەرەتایی بۆ کرا و ئامۆزایەکی لەهەمان گروپ لەگەڵمان بوو داوای لێکرا لەگەڵی بمێنێتەوە چونکە بەم شێوەیە ناکرێ و ئەم توانای ڕۆشتنی نەماوە هەرچۆن بوو بەڕاکێشان و کەمێك هەڵگرتن و ماوەیەک باش بوو نزیك سەعات شەشی بەیانی گەیشتینە شاخ بۆ حەوانەوە ، خراپترین و ترسناکترین وەخت ئەو شەوە لە دەوروبەری کۆمەتین بوو.

ئێوارەی ڕۆژی دوای دیسان دەستکرایەوە بەڕۆیشتن ئەو شەوە ئەو برادەرەی کە شەوی پێشوو وەزعیەتی زۆر خراپ و نەی دەتوانی بڕوات لەسەر مەسئولیەتی خۆی و ئامۆزاکەی لەجێگایەکی بەرچاو سەرەڕێگادا دایان ناو دایان پۆشی و پارەیان دایێ و بەجێ هێڵرا و بەپێ ی ئەو هەواڵانەی دوای کە پێمان گەیشتن و دواتر لە ئەسینا بۆ خۆمان ئەو برادەرەمان دیبەوە کە ڕزگاری بوو بوو دوای ئەوەی بەیانی خەڵی نزیك ئەو دێیەی کە ئەوی لێبوو بوو پەیوەندیان بەپۆلیسەوە کردبوو و لەلایەن پۆلیسەوە برابووە نەخۆشخانە چونکە وەزعیەتی خراپ بوو ، ئەو برادەرە هونەرمەندێکی موسیقی بوو بەهۆی هونەرەکەیەوە لەوێ دکتۆرێك وەك هاوڕێیەك هاوکاری دەکات بۆ دەرباز بوون کە لەکێشەکەی و گرفتەکانی دەزانێ و بەزەییپێدادێتەوە و دەبێتە هۆکارێك کەدەربازی ئەسینای دەکات . ئەو شەوە بەهۆی گرفتی ئەو برادەرەوە زۆر دواکەوتین و نەمان توانی بگەینە ئیگزانتی، لەگەڵ ئەوەی دنیاش زۆر ساردبوو و بارانیش دەباری بەشێوەیەك ئەو سەرمایە بەتەواوەتی هیلاکی کردبووین لەبەر ئەوە کە گەیشتینە نزیك فارغۆنەکانی پێش ئیگزانتی لەوێ لامان دا ومانەوە و ڕۆژی دوای لای ئێوارەکەی دەستمان کردەوە بەڕۆیشتن کە ئەم شەوەیان دەبێتە دوا شەوی ڕێگامان لەگەڵ ئەوەی ئەم شەوە لە

شەوی دواتر سارد تربوو بۆ سەعات ١ی شەو گەیشتینە دەوروبەری ئیگزانتی ئەو شارەی کە وەجبەکان دەتوانن لێوەی دەرچن لەویَ زۆرێك هەبوو چوینەناوی پربوو لەجل و بەرگ و جانتاو پێلاوی خەلکی تر کە پێش ئێمە لایان دابوو و لەوێوە دابەزیبوون هەر ئەو شەوە وەجبەیەکی تری چواردەکەسی گەیشتنە لامان و ئەوانیش لامان مانەوە تا دەمەو بەیان دەست بەدابەش بوون بکرێت ئەوەشم لەبیر نەچێت ئەو وەجبەی ئێمە زۆر لەو هونەرمەندو رۆشنبیرە ناودارانەی کە لەهەندەرانن لەو وەجبەی ئێمەدابوونیان هەبوو واتە لە شانۆکارو و دەرهێنەرو مۆسیقی و کەسانی رۆشبیر ، پێش سەعات شەش دەست کرا بەدابەش بوون و چۆنیەتی چوون بۆ مەحەتەی پاس و بلیت برین ، بریاردرا هەر پاسێك دەکەس سوارین واتە هەروەجبەیەك بڕواتەدەرەوە دەبیَ دەکەس بن ئێمە لەبەرئەوەی ئەوە چەندەمین جارمان بوو ئێمەیان هەلبژارد لەیەکەم وەجبە و من دانرام بلیت ببڕم بەهۆی ئەوەی کەمێك دەمتوانی بەیۆنانی قسەبکەم بەلام کە گەیشتینە شوێنی پاسەکان و دەم ویست بچمەژوورەوە بۆ بلیت برین سەیر ئەکەم (ل.. زەرەنگەر) دوو بلیتی بەدەستەوەیەو خێرا هاتە لامو ووتی بگرە ئەوە بلیتی تۆو فلان کەس بێدەنگ برۆسەرکەوە بیَ قسەکردن . ئەمە کارێك بوو کەجێگای سوپاسە و رەنگە کەم کەس ئەم شێوە هەلوێستەیان هەبێت بەتایبەت کە هەمووماں وەزعیەتی ئەو قاچاخچیانەمان دەزانی و چۆنیەتی رەفتاریان لەگەلَ خەلك ، بەهەرحالَ ئەوە هەلوێستێکی باش بوو بۆ ئێمە . هەر دەکەسەکە سەرکەوتین و قەرەقۆلی قاچاخچیش لەگەلمان سەرکەوت دوای ئەوەی پاسەکە بۆماوەی دە دەقیقە رۆشت سەیارەیەکی پۆلیس پاسەکەی راگرت و پۆلیسێك سەرکەوتە سەیارەکەوە یەکەم کەس هاتە سەر ئێمە هەرچەند ئێمە ژمارەی بلیتەکەمان لەسەرەتای بیستەکاندا بوو بەلام یەکسەر پرسی بۆ کویَ ئەچن.. ؟ ئەوەی تەنیشتم یەك ووشە یۆنانی نەدەزانی پێشتر ئاگادارم کردبوو کە ئەو قسە نەکات من وەلام دەدەمەوە بەبیَ خۆ

تێك دان و زۆر بەبڕواوە ووتم بۆ سالۆنیكی ، دواتر ووتی خەلكی كوێن..؟ لێرەدا كە زۆر ئەو كوردانە تێدەكەوتن لەوەلام دانەوە چونكە ئەوان بۆخۆیان شێوە زمانێكی تریان هەیە كەبلێن ئێمە خەلكی ئەم وولاتەین یان خەلكی ئێرەین وەك هاوولاتیەك نەك بیانیەك بۆیە من ئەو شێوەیە فێركرابووم كە قسەبكەم ئەویشم وەلامدایەوە زۆر داوای لێبووردنی لێكردم و لەئێمە دەرچوو چووە لای دووبرادەری ترەوە لەگەلْ یەكەم پرسیارو وەلام دانەوەی ئەوان پشتملی گرتن و هێنانیە خوارە زۆر بەناشیرینی و دوای ئەوانیش دوو برادەری تر بەهەمان شێوە گیران و ئێمە ئەو شەش كەسەی تر ڕزگارمان بوو بێ گومان دوای ئەوەی ئەو چوارەی گرت لەكەسی تری نەپرسیەوە وادیاربوو ئیخباری تەنها لەچواركەس كرابوو كە گرتنی لەكەسی تریان نەپرسیەوە بەم شێوەیە یەكەم هەنگاوی ڕێگای پڕلەمەینەتی و ناخۆشی و پڕلەئێشوو ئازارمان كۆتایی پێهات و ئەو كات دووبارە قۆناغێكی تری ژیان و شێوازێكی نوێ لەڕەفتارو هەلسووكەوت و چۆنیەتی ڕزگاربوون بۆ وولاتانی تری ئەم دوونیایەی كە تێدا دەبینە پەنابەر تاژیانێكی ئارام و سادەو بێ گرفت بەسەر بەرین بەلام چەند ئەو وولاتانە ئارام و خۆش بن و خزمەتگوزاری و پێداویستیەكان لەبەردەست دابن بەلام دووری و غەریبی و بیری وولات و كەس و كار بۆخۆی خەمێك و گرفت و كێشەیەكی ترە بێ لەوەی ژیان و ڕەوتە نوێكانی ئەوانیش گرفتێكی ترن تا لەگەلیان ڕادێن و دەتوانین هەرنەبێ كەمێك وەك ئەوان بتوانین بژین كە زۆر زەحمەتە كەسایەتیەكی كورد بتوانێ وەك ژیانی ئەم وولاتانە بژی ئەوەش هۆكاری زۆرە.. وامان هەست دەكرد كە تەواوو ڕزگارمان بوو بەلام نەمان دەزانی نەخێر ئەمە كۆتایی سەرەتایەكە بۆ دەست پێكردنەوەی شێوازێكی تری ژیان شێوازێكی تر لەهەلسوكەوت و گرفت...

لێرەدا بۆ ماوەیەك لەئاست ئەم بەسەرهاتەدا دەوەستم چونكە پێش ئەوەی باس و خواستەكانی چوونە ناو یەكەم وولاتی ئەورووپی و چۆنیەتی ژیان ئەو هەنگاوانەی كە

کەسایەتی کورد پێیاندا تێدەپەڕێت یان بەواتایەکی دی پیایاندا تێپەڕی و گەیشتە ئەو وولاتەی کە خواستی خۆیەتی ئەویش بە چەند قۆناغێك بۆ پێش ئەوەی بکەوینە قوڵای ئەو باس و خواسانەوە دەمەوێ بەسەرهاتی کەسایەتێکی تر کە بەشێوازو جۆرێکی تر لەجیاوازی و ترسناکی ئەو ڕێگایە کە دەکاتە ڕێگای کوردستانی ئێران و دواتر ئێران تورکیا ، کە بەیەکێك لەو ڕێگایانەی مەرگ دەتوانین ناوی بەرین و زۆر کەسانی کورد و ڕۆڵەی ئەم وولاتە بەهۆی نەبوونی پارەو بێ دەسەلاتی و بەردەست نەکەوتنی ڕێگای ئیبراهیم خەلیل ناچاری ئەو ڕێگای مەرگەبوون لێرەدا ئەو کەسایەتیە بەم شێوەیە دەست پێدەکات و دەڵێت : دوای ئەوەی پاسپۆرتی عێراقیم کری بەناوێکی کەوە تەنها وێنەکەیم گۆڕی و لەگەڵ کوڕێکی ناسراو کە بەناو قاچاخچی بوو لەڕێگای ئێران – تورکیا – عێراق ، لە ٢٨,١٠,١٩٩٦ لەسلێمانی لەگەڵ ١٢ نەفەری تر و قاچاخچیەکەدا دەرچووین بەرەو هەڵەبجە بەکۆستوەرێکی تایبەتی شەو لەماڵە خزمێكماینەوە و بەیانی زوو سواری لاندرۆڤەرێکی درێژبووین بەرەو شێرەمەڕ ، یەکی کۆڵەپشتێکی تایبەتیمان پێ بوو کە تەنها جل و بەرگی خۆمانی تیابوو بەحساب دوای ٥ سەعات بە پێ لەبەینی ئێران و تورکیا دا یەکسەر خۆمان دەگۆڕین و سواری سیارە دەبین بۆ ئیستانبول (هەروا بەوئاسانیە..!!) بەهەرحاڵ بەپێ کەوتینە ڕێ بەرەو شاخێکی سەخت کە لەڕێگاماندا نزیکەی ٤تا ٥ سەعاتمان پێچوو تاگەیشتینە دیووی ئێران لەودیوویش و زۆر بەخێرای و ڕاکردن لەترسی ئەوەی پاسدار نەمان بینێ دابەزینە خوارەوە تاگەیشتینە ناودۆڵەکە کە جادەیەکی خۆڵی لەسەربوو وە سەیارەیەك وەستابوو بەهەرحاڵ سواری سەیارەبووین تاگەیشتینە ناودێ یەکی ئێران لەدێ چووینە چایخانەیەك و نان و ماست و هێلکەی چاکمان خوارد (بێ ئێوە ناخۆش) و ئیسراحەتمان کرد تا دەمەو ئێوارە دنیا خەریك بوو تاریکی ئەکرد بەڕێ کەوتینەوە بەرەو دۆڵێکی بەردینی چۆڵ کە ڕێگەی قاچاخچیەتی بوو لەبەینی عێراق و ئێران دا

، بـۆ نەگبـەتی ئێمـە بـاران دەسـتی پێکـرد و هەرمـەنگاوێکمان دەنـا بـەدەما دەرۆشتینەوە بەهۆی ئەوەی بەردەکان تەڕبوو بوون و سەرمامان بوو و مانـدووین و ماستەکەش ئەوەندەی تر برسی کردین ، بەدرێژی ٥ سەعات بەپێ ڕۆیشتین تا نزیك بووینەوە لـەوەی کـە دۆڵەکـە تـەواوبێت قاچاخـچی یەکـە ووتـی : دانیـشن.. خـۆی ماوەیەك ڕۆیشت و گەڕایەوە ووتی کەمینی پاسدار هەیە لەپێشمانەوە ، لەبەرئەوەی گەڕانەوە زەحمەت بوو مەجبور بووین چاوەڕێ بکەین لەبـەر ئـەو بارانـە (خواگیـان وای ئەزانی تینوومانە دەقە بەدەقە بارانەکەی زیادئەکرد).

دوای سێ سەعات چاوەڕوانی تاکەمینی پاسدار هەڵسان ئینجا بەڕاکردن کەوتینەڕێ تادۆڵەکەمان تەواوکرد گەیشتینە دێیەك و چووینە ماڵێکی ناسـراوی قاچاخـچیەکە و پارەی باشی وەرگرتبوو تا ئەو شـەوە لـەوێ بمێنینـەوە و قـوبڵێکی سـوورو پیـازی ووشکی بۆ دانایین (بەڵام بەڕاستی ئەمەیان بەلەزەت بوو) بەڵام لەگەڵ ئـەوەی ئێمـە زۆربرسی و خواردنەکە زۆر کەم بوو بۆیە وەك برا بەشمان کـرد و خواردمـان تۆزێـك ئاهێـك بەگیاندمانـداهات و ئـیتر ئـەو شـەوە لـەوێ خـەوتین ، بـەیانی زوو بـەزووی قاچاخچیەکە شارۆچکەیەکی پێشان داین کە کەمێك دووربوو لەلادێکـەوە و دوو دوو کەوتینـەڕێ بـۆ ئـەو شارۆچـکەیە وە مەوعـدمان دانـا لەچـایخانەیەك لەسـەرجادەی ڕەئیسی بووزانیمان کە لەشارەکە کەس دلوای هەویە ناکات لـەوێ یـەکمان گرتـەوە لەچـایخانەکە کۆبووینـەوە و ئیـسراحەتێکی چـاك و نـانێکی چـاکمان خـوارد وەچـاوەڕێ ئـەوەبووین سـەیارەبێت بەشـوێنماندا ئـیتر هـەر لەبەیانیـەوە چـاوەڕێ بووین تا ئێوارە درەنگێك سـەیارەهات لاندرۆڤـەرێکی درێـژبوو وەکابرایـەکی تیـابوو جگە لەشۆفێرەکە دوای زانیمان کە کوردی عێراقـە و ئیتلاعـاتی ئێرانـە و کتـابێکی ڕەسمی دروست کردبوو و ناوی ئێمەی تیابوو بەحـساب ئێمـە سـجنین و تـسفیرمان ئەکات بۆ سجنێکی تر بۆگەڕانەوە و سنورداش کردن لەناوچەی نزیك ڕەزاییەوە ئیتر چۆن ئەمەی تەگبیرکردبوو و چۆن بۆی چووە سەر نازانم.. بەڵام ئەوەندەی بە ئێمە

ووت لەسەیتەرەکاندا خۆتان بکەن بەخەوتوو وەهەچ قسەیەکیان لەگەڵ کردن وەڵام مەدەنەوە ئیتر ئێمەش هەموو بەقسەمان کرد تاگەیشتینە ڕەزاییە لەڕاستیدا بیرم نایەت ئەوەندە ئەزانم هەموو دەقمان گرتبوو ئەوەندە لەو سەیارەدا دانیشتبووین ئیتر شەوێکی درەنگ نازانم کات ژمێر چەندبوو، گەیشتینە شوێنێك قاچاخچی ناوئێران (ئیتلاعاتەکە) ووتی دابەزن و کردنیانین بەژوورێکا ئیتر نەمان زانی ئەمە کوێیە لە قاچاخچیەکەی خۆمان پرسی ووتی مەزرەعەیەکە لەتەنیشت ڕەزایەدا ئیتر کەمێك دڵمان خۆش بوو بەوەی گەیشتینە ڕەزاییە ئەو شەوە لەو مەزرەعەیە ماینەوە و ووتیان کەس دەنگە دەنگ نەکات و بخەون تا بەیانی لەڕاستی دا شەوێکی زۆر ناخۆش بوو لەبەر ئەوەی نەنانیان داینێ و نەژێرەخەرمان هەبوو بۆ نەگبەتیش دنیا زۆر ساردبوو، بەیانی هەستاین و یەکە یەکە بۆ ( WC ) و دەم و چاو شۆردن بەئومێدی نان خواردنێکی باش بەڵام بەداخەوە تا نیوسەعات دوای هەستان خواردنمان نەدی ئیتر قاچاخچیەکەی خۆمان ڕۆیشت و داوای نانی کرد ، بەهەرحاڵ ئەوان شەڕی ئەوەیان ئەکرد کە قاچاخچیەکەی ئێمە پارەی زیاتریان باتێ ، دواتر هەندێ پارەی زیاتری دانێ بۆئەوەی نان و ئاومان بەنێ و بەزووترین کات دەرمان کەن ، لەپڕ یەکێك لەهاوڕێکانمان مژدەی ئەوەی داینێ ووتی بزنێکیان سەربڕی بۆمان ئیتر لەڕاستیدا هەموو دانمان تیژکردبوو بۆ گۆشت خواردن دوای برسێتی و هیلاکی دوای چەند سەعاتێك لەکەوڵ کردنی بزنەکە سینیەکیان هێنا شەش قاپی لەسەر بوو کە تەنها تشریبی ئێسقانی بزنەکەبوو بەبێ گۆشت ، بەمە زۆر پێکەنین چونکە سەرەتا زۆر دڵمان بەبزنەکە خۆش بوو بەڵام لەڕاستیدا تەنها ئاوەکەیمان بینی.. ئەوەش نەهامەتی ڕێگەی قاچاخ و برسێتی بوو کەچاوی ئێمەی خستبووە سەر خواردنی ئەو ماڵە قاچاخچیەی کە نەیان ئەداینێ...

دوای ئەمانەش من قاچاخچیەکەی خۆمانم بانگ کرد قسەم لەگەڵ کرد بەحوکمی خزمایەتی ووتم : نابێ ئەمشەو لێرە بمێنینەوە چونکە بەهیچ شێوەیەك بڕوام بەو ماڵە نەبوو کەتێیدامابووینەوە وەزۆر پرسیاریان ئەکرد لەوەی چەند پارەمان پێیەو چەند پارەمان پێویستە بۆ دەرچوون هەر لەبەر ئەوە قاچاخچیەکەمان ناچاربوو جارێکی کە کەمێك پارەی زیاتر بدات بۆ ئەوەی ئەو شەوە دەرچین بەڵام لەڕاستی دا ئەو ماڵە تەنها ئیشیان ئەوە بوو پارە وەرگرن بەرامبەر بەوەی خزمەتمان بکەن تا قاچاخچیەکەی تورکیا- ئێران دەرمان دەکات ، ئیتر لەئێوارەدا بەسەیارە سێ سێ دەریان کردین بەناو ڕەزاییەدا چووینە دێیەك کە لەدەرەوەی ڕەزاییە بوو بەڵام ئەم جارەیان ماڵی قاچاخچیە ڕاستیەکەیە بەشێوەیەك وەك لادای ٧٦ مان لێ هاتبوو تاگەیشتینە لای قاچاغ چی ئەسڵی دە دەسمان کرد و هەریەکە بەنەوعێك پارەی وەرئەگرت ، گیانمان بەوە بوو کە برادەرەکانی لەگەڵمان بوون دە کەسیانم لێ ئەناسین و خەڵکی شارەکەی خۆمان بوون بەگاڵتە و سوعبەت بارەدەرونی و نارەحەتیەکانمان لەبیر خۆمان ئەبردەوە ، ئەوە گەیشتینە ماڵی قاچاغ چی ئەسڵی بەینی ئێران و تورکیا تەبعەن ئەو قاچاغ چیەی خۆمان کارتۆنی بوو تەنها وەك دەلیلێك قاچاغ چیەکانی ئەناسی هەم ناشارەزانەبوو لەڕێگاڕۆیشتن دا زۆر ووریابوو و زۆر ئاگاداری نەفەرەکانی ئەکرد .

هەر بەسەیارەکانەوە وەك باسم کرد کردیانین بەماڵی قاچاغ چیەکەدا و زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنیان کردین و لەدیوەخانێکی گەورەدا دایان نایین کەلەڕاستی دا دیواخان بوو ، دوای ئەوەی بیستیان کە لەماڵی پێشوو خزمەت نەکراوین بەپەلە خواردنیان بۆ حازرکردین و ڕێزوو ئیحترامی ئەو ماڵە جێگای ڕێزوو تەقدیر بوو ئیتر ئەو شەوە لەوێ ماینەوە و ئیسراحەتی باشمان کرد تاشەوی دوای هاتن بەدوامان‌دا بەسەیارەیەکی پیکاپ کە چوار دەورەکەی بەدارو گوێنی چوارچێوەی بۆکرابوو و بەرزکرابویەوە بەشێوەیەك هەرچیەکی تێدا بێت دەرناکەوێت ، ئیتر هەموو چوینە

پشتی پیکابەکەوە و بەسەریعی بەناودێکەدا دەرچووین تاگەیشتینە دەرەوەی دێ لەجادەلای دلو بەناو دەشتێکدا دەڕۆیشت تاماوەی نیو سەعاتێك ئەمەش بۆ ئەوەی بەپشتی سەیتەرەیەك دا دەرچین ، دوای نیو سەعاتەکە دابەزین یەکێك لەقاچاغ چیەکان پێشمان کەوت و ووتی بەبێ قسەکردن بەدوامدا ڕاکەن جادەو سەیتەرەکەش لێمانەوە دیاربوو ئیتر نزیکەی ٢٠ دەقیقەیەك ڕامان کرد بەبێ وەستان تاگەیشتینە سەرئاوێك هەرچەندە ئاوەکە تەنك بوو بەلام زۆر خوڕبوو باوەڕتان هەبێت ئەو قاچاغ چیە بەرازە بەکۆڵ یەکە یەکە لەئاوەکە پەڕاندینیەوە و قولە پێشمان تەڕنەبوو ، دوای ئەوە ڕۆیشتینە ژێر پردێك کە جادەیەك بەسەریا دەڕۆیشت ، دانیشتین چاوەڕێی سەیارەمان ئەکرد ئیتر دوای ٢٠ دەقیقە سیارەکە هات و هەموو بەڕاکردن لەژێر پردەکەوە دەرچووین بەرەو سەیارەکە تا هەموو سواربووین لەترسی ئەوەی ئەوەك سەیارەیەکی کە بێت بمان بینێ ، دوای ٢٥ دەقیقە لە ڕۆیشتن دابەزین سەیرنەکەین لەبناری شاخێکاین کە زۆر سەخت بوو بەو پەڕی بڕواوە ئەگەر ڕۆژ بووایە و سەختی ئەو شاخەمان بدیایە قەد خۆمان لێنەئەدا ، لەوێ ئەو قاچاغ چیانەی کە بەحساب ئەسڵی بوون تەسلیمی سێ کەسی تریان کردین کە کۆمەڵێك هێستریان پێ بوو ووتیان کێ هێستر ئەگرێت بەکرێ دەبێ بەجیا پارەکەی بدات لێرەدا من پرسیارم کرد ووتم ڕێگەکە چەندی ماوە ووتیان هیچ نیە.. ئیتر جوابەکەیانم بەدڵ نەبوو من هێسترم گرت بەکرێ لەگەڵ دوو کەسی ترا ، کەوتینە ڕێ بەرەو لوتکەی ئەو شاخەی کە زۆر سەخت بوو وەمانگێك پێش دەرچوونی ئێمە ٢٨ گەنجیان تیا کوشت بوو بۆ پارەکانیان (ئەمەش لەلایەن جاشەکانی تورکیا) وە ئێمە یەکەم وەجبە بووین دەرچووین دوای ئەو کارەساتە، هەر لەنیوەی شاخەکەدا بەفربوو کە وەك بەرد بەستبووی و ڕەشەبایەکی زۆر ساردی هەبوو کەهێسترەکە دەڕۆیشت تەقەی پێی ئەهات و لەدابەزینی هەندێ شوێندا ناچار دەبووین لەسەر هێسترەکان دابەزین چونکە نەیان دەتوانی لەبەر

سەختی بەبارەوە دابەزن ، بەناو ئەو بەفرەدا کوڕ ئەو کوڕە بوو خۆی بگەیەنێتە چەم . ئەو شەوە برادەرێك قاچی پەکی کەوت و من هێسترەکەی خۆمم دایە و بەپێ کەوتمەرێ بۆ بەیانی سەعات ٩ گەیشتینە دیوی تورکیا کە هیچ ئاوەدانی تیا نەبوو تەنها چەند پێشمەرگەیەکی کۆمەڵەی ئێرانمان بینی و کەوتینە ڕێ بەرەو دێ یەکی تورکیا ئیتر لێرە سەفەری ناو ئێران کۆتای پێ هات و سەفەری ناو تورکیا دەستی پێ کرد .

ڕێگای ناوئێران لەچاو زۆر وەجبەی تر ئێمە بەئاسانی بڕیمان و لەگەڵ ئەوەشدا لەڕووی دەروونیەوە زۆر گرانەو گرفتی خراپ مان بەسەرهات و بەهەمان شێوەش ڕێگای ناو تورکیا هیچی لە وەزعی ناوئێران باشتر نەبوو ، ئەو قاچاغ چیەی کە لەئێرانەوە بردیانین بۆ تورکیا قاچاغ چی هیرۆین و حەشیش بوو بێ گومان ئێمە لەدوایدا ئەوەمان زانی ، ئەوان پارەیان وەرنەگرتبوو بۆ دەرکردنی ئێمە تەنها ئێمەیان هێنابوو بۆ ئەوەی خۆیان ڕزگاربکەن لەکاتی گرتندا لەمەسەلەی تلیاکەکە، بەکوردی ئەوان ممنون بوون وەپارەکەی دابوومان هەمووی بۆ قاچاغ چیەکانی ناو ئێران بوون .

لێرەدا دەگەڕێمەوە سەر باسی یەکەم و ئەو سەفەرەی کە لەتورکیاوە بەرەو یۆنان باسمان کرد و دواتر گەیشتنە یۆنان و دەرچوونی ئەو وەجبانە بەرەو سالۆنیکی کە دەکاتە دووەم شاری گەورە دوای ئەسینا لە یۆنان لەوێ بەهیچ شێوەیەك گرفت نیەو کەس پرسیار ناکات و ئەگەر پرسیاریش بکرێت یان یەکێك بگیرێت بەبێ کێشە ڕەوانەی ئەسینای ئەکەن چۆن ئەو وەجبانەی دەهاتنە جەزیرەکانی یۆنانین ئەوانیش بەهەمان شێوە ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرا . ئەو برادەرەی کە باسی گەیشتنی خۆیانی کرد بەم شێوەیە درێژەی بەباسەکانی خۆیدا ووتی : دوای ئەوەی کە گەیشتینە سالۆنیکی زۆر دڵمان خۆش بوو هەستمان ئەکرد لەگرفتێکی زۆر گەورە ڕزگارمان بووە و وامان دەزانی تەواو و گرنگترین و سەخت ترین ڕێگامان

بڕی زۆرمان پرسی بوو نەمان ئەزانی چی بکەین لە مەحەتەی پاسەکە دابەزین دەبوو بچین بەرەو مەحەتەی شەمەندەفەر چونکە ڕێگای نێوان ئەسیناو سالۆنیکی زۆر بوو بۆیە دەبوو بەشەمەندەفەر بچین و شەویش سواربین بەڵام ئێمە زۆر پەلەمان بوو نەمان ویست خۆمان بخەینە درەنگانێك بۆیە ئەوەندی لەبیرمە بەو قاچاغ چیەمان ووت کەلەگەڵمان دەرچووبوو چارەیەکی نان خواردنمان بۆبکە و دوای سەفەربکەین بردینی بۆ دووکانێك کە گەصی گۆشتی هەبوو لەگەڵ کۆمەڵێك خواردنی سەیر کە ئەو کات بەلامانەوە سەیربوون و تەنانەت ناوەکانیشمان نەدەزانی بەهەرحاڵ ئەوەی گرنگ بوو لە برسیەتی خۆمان ڕزگاربکەین و دوای یەکی گەصێکی بۆکرین ئەوەندە برسیمان بوو لەبیرمان نەبوو بپرسین ئەوە گۆشتی چیە، پەلەی ئەوەمان بوو بێنەوە بەخۆدا و بێ ئێوە ناخۆش سەرو کۆلایەکی ساردمان کرد بەسەریا و بەرەو شەمەندەفەر و چۆنیەتی دەرچوون کەوتینە ڕێ بۆ شانسی ئێمە کە گەیشتینە ئەوێ دوای یەك چارەك قتار بەرەو ئەسینا هەموو بلیتمان بڕی و بەپێکەنین و قسەی خۆشەوە سواربووین و کەوتینە باسی ئەو شەوە ناخۆشانەی ڕێگاو ئەو برادەرانەی کە لەگەڵمان بوون چیان لێهاتبێ و ئەوانەی لەگەڵ ئێمەبوون لەپاسەکەدا گیران و هەندێ لەم باسانە ، دواتر کەوتینە پرسیارکردن لە (قەرەقۆل) کە وەزعیەتی ئەسینا چۆنەو ئێستا دوای گەیشتنمان لەوێ ئەبێ چی بکەین و بەشێوەیەکی گشتی وەزعەکەی بۆ باسکردین و تێی گەیاندین کە چی بکەین و ووتی یەکەم ڕۆژ گرنگ نیە چونکە ئێستا لەمەحەتەی قیتار لە ئەسینا برادەران چاوەڕوانمانن و ئەوان هاوکاریتان ئەکەن تادوای خۆتان کارەکانی ترتان جێ بەجێ ئەکەن زۆر بەمورتاحی و هەست کردن بەخۆشی بەوەی کە زوو بگەینە ئەسینا هەرلەوێ بەدەم قسەوە باسی ئەوەمان کرد ئەو خواردنە خۆشەی دەرخواردی داین چی بوو لێرە چی پێ ئەڵێن خەبەرێکی ناخۆشی داینێ بەوەی ئەوەی کە خواردمان گۆشتی بەرازبوو چونکە لێرە گەص بەگۆشتی بەراز

ئەکەن و زۆر بەکەمی گۆشتی تر بەکاردەهێنرێت و سەلامەت ترین شت ئەوەیە مریشك بخۆین . دوای ئەوەی کە گەیشتینە ئەسینا هەندێك برادەر نەمان ئەناسین بەلام ئاگاداری ئەوەبوون کە وەجبە ئەگات و چاوەڕوانیان ئەکردین و لەگەلّ بەخێرهاتن هەوالّی ئەوانی تریان پرسی و ئێمەش ئاگادارمان کردن کە هەوالّیان نازانین چونکە ئێمە یەکەم وەجبەبووین دەرچووین و لەوانەیە ئەوان بەیانی بگەن چونکە ئێمە شەوو بوو گەیشتین پێمان ووتن ئێستە چی بکەین و بۆ کوێ بچین ووتیان خەمتان نەبێ وەرن لەگەلّمان ئەم شەو دەتان بەینە ئوتێلێك تابەیانی و ئەوکات هەریەکە حساب بۆ وەزعی خۆی بکات چونکە لێرە خەلّکی شوقە بەکرێ ئەگرن بەچەند نەفەرێك پێکەوە و ئێوەش ئەتوانن لەناو خۆتانا رێك کەون بەهەرحالّ ئەم شەو بحەوێنەوە و بەیانی قسەی لەسەربکەن بردنیانینە ئوتێلێك زۆر بەلامانەوە سەیر بوو لە ئوتێلی عادی نەئەچوو لە سالّەکەیا چەن ئافرەتێك بەجل و بەرگی نیوە ڕووت دانیشتبوون ئێمە ئاگمان لەدنیا نەبوو هێشتا ووڕبووین و حەپەسابووین و لەمەسەلەکە نەدەگەیشتین سەیریان ئەکردین و پێئەکەنین هەرچۆن بوو ئەوەی پێویست بوو لەناونووس کردن و وەرگرتنی ژوور و چووینە سەرەوە و پاش ماوەیەك یەك دوو برادەری خۆمان هەوالّیان زانیبوو کە ئێمە گەیشتووین هاتنە لامان و بانگیان کردینە خوارەوە و یەکەم شت ووتیان ئەوە چی ئەکەن لێرە ووتمان بۆ لەم ئوتێلەین پێیان ووتین ئەوە بەناو ئوتێلە بەلّکو شوێنی شتی خراپەو ئەو ئافرەتانەش لەش فرۆشن و ئەم ناوچەیە کە پێی ئەلّێن ئامۆنیا کەدەکاتە سەنتەری شار هەمووی ئەوەیە لەوێ کوردەکان پێیان ئەوتن گلّۆپەکان ووتیان ئەوەی ئێوەی لێن یەکێکە لەو گلّۆپانە. ئەوە بوو بەکێشە یەکێك ئەی ووت بادابەزین و برۆین بۆ شوێنێکی تر یەکێکی تر ئەیووت هەر ئەم شەوەو بەیانی ئەڕۆین و ئێمە نەمان زانیوەو کێشە نیە هەرچۆن بوو بریاری ئەوە درا بمێنینەوە بەلام یەك دوو برادەرمان لەگەلّ بوون زۆر ئەترسان وەك بلّێ ئەوان ئافرەت و

ئەوانـەی دەرەوە پیـاوی دڕنـدە ئەوشـەوە هەرچـی کورسـی مێـزوو دۆلابـی ئـەو ژوورەبوو خستیانە پشتی دەرگاوو دەرگایـان کلیـل دا هێشتا ئەترسـان بەهـەرحاڵ ئەوشەوەمان بەپێکەنین و گاڵتەکردن بـەو دووبرادەرەمـان بەسـەربرد و بـەیانی زوو بۆی دەرچووین.. یەکەم هەنگاو بگەڕێ بـەدوای بـرادەران و کەسـانی ناسـیاو ئێمـە چـەند برادەرێـك کەلـەڕێگا پێکـەوە بـووین و زور کـوری بـاش بـوون و لـەگرفت و ناڕەحەتی ئەو ڕێگایەدا هاوکاری یەکمان زۆر دابوو بۆیە بڕیاری ئەوەمان دا پێکـەوە شوقەیەك پەیدا بکەین تا دواتر بزانین چی بکەین و چۆن حسابی دەرچوونی خۆمان بکەین من کەسێکی ناسیاوی خـۆم لـەوێ بـوو لـەڕێگای ئـەوەوە کـە مـاوەی چـەند مانگێك بوو لەوێ بوو زور لەو خەڵکەی دەناسی و وورده ئیشی پاسپۆرتی دەکـرد و وەزعـی بـاش بـوو لـەو بینایـەی خۆیـان کەچـەند شـوقەیەکی تـر کـوردی تێـدابوو ژوورێکیان بۆ پەیدا کردین و خاوەنی ئەو شوقانە کابرایەك بوو بەناوی ( یـانی ) زۆر بەتەمەن بوو قوبتانی باخێرەبووە زۆر شارەزابوو زمانی عـەرەبی دەزانـی و کـورد و عەرەبی خۆش دەویست ، ئێمە ژوورەکەمان لێگرت و پارەمان دایە بۆ یەکەم مـانگ شەش کەس بووین و وورده وورده سەیری وەزعەکـەمان کـرد دەرچـوون هـەبوو بـۆ ئیتالیا بەشاحینە بەڵام پارەی دەویست و لـەو شـەش کەسـە ناسـیاوەکەی مـن کـە لەڕێگا لەگەڵمان بوو ماڵی ئاوابێ لـە دەرەوە لەبرایەکیـەوە پـارەی بۆهـات و لـەوێ منی بەجێ هێشت و دووبرادەری تریش واتە ئێمە ماوینەوە سێ کەس نزیـك سـەری سـاڵ ئـەوان سـەفەریان کـرد و شـوێنەکانی خۆیـان فرۆشـتەوە مـاوەی دوو هەفتـە چـاوەڕوانی قاچـاغ چـی بـوون پارەیـان دابـوو ئـەمڕۆ و بـەیانی یـان پـێ دەکـرا و شوێنەکانی خۆیان فرۆشتبوو بەخۆیان ئەو نەفەرانەی کـە جێگاکانیـان کڕیبـوو لـەو ژوورەدا بوو بـووین بـە نۆکـەس زور وەزعیـەتمان نـاخۆش بـوو تەنانـەت پارەشـیان سەرف نەئەکرد ئێمە مەسرەفی خواردنمان بۆ ئەکردن کاتێ ئەوان ڕۆشـتن ئێمـە بـێ پارەکەوتین نەمان ئەزانی چی بکەین و ئەو سێ نەفـەرەی کـە جێگاکانیـان کڕیبـوو

بەدڵمان نەبوون و ڕەفتاری زۆر ناشیرینیان هەبوو و هەمیشە کێشەمان هەبوو لەگەڵیان لەگەڵ ئەوەی وەزعیەتی بێ پارەیەیش زوری بۆ هێناین بۆیە بڕیارمان دا بەشەکانمان بفرۆشینەوە کە ٧٠ دۆلاری ئەکرد و پرسیاری ئیشمان کرد ووتیان ئەتوانن بچن بۆ فلان شوێن لەوێ مەیانەو خەڵکی ئەتان بەن بۆ ئیش ، یەکەم ڕۆژ چووینە مەیانی چاك زیاتر لە پەنجا کەس کە هەمووی کوردن وەستاون سەیارەیەك ڕائەوەستێ هەر پەنجا کەسەکە پەلاماری ئەیەن و ئەبێ بەیەك شەڕەشەق سەگ ساحێبی خۆی نەئەناسێەوە وەزعەکەمان بەدڵ نەبوو هەنگاوێکمان نەنا و دواتر ووتیان ئەتوانن بچن بۆ ئارگۆس کە جەزیرەیەکە و ئیشی پرتەقاڵ لێکردنەوە بکەن و واباشەو پارەکەی خراپ نیە و کوردەکان زور ئەو ئیشە ئەکەن بۆیە بڕیاری ئەوەمان دا ژوورەکەمان بفرۆشینەوە و بچین بۆ ئارگوس بۆ ئیشی پرتەقاڵ لێکردنەوە ناونیشانمان وەرگرت و چووین لەوێ هەندێ برادەرهەبوون کاریان ئەکرد چوینە لای ئەوان و خاوەن ئیشەکە قەرەج بوو دوای ئەوەی دەستمان کرد بەئیش زیاتر لە پانزە کەس دەبووین و لەوێ ژوری سادەوساکار دروست کرابوون و لەژوورەکەدا هەریەك جێگایەکی تایبەتی خۆی هەبوو بۆ حەوانەوەو خەوتن و هەموو بەیانیەك سەعات چوارو پێنج هەڵدەستاین و دەبوو پێش سەعات شەش لەسەر ئیش بووینایە و بەسەیارەی تایبەتی خۆیان دەچوونە سەرکارو لەوێ دابەش دەبووین بۆ پرتەقاڵ لێکردنەوە و دەخرایە سنوقی تایبەت و لەوێشەوە بۆ ناولۆری و نان خواردنی نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە لەسەر خاوەنی باخەکەبوو بەم شێوەیە نزیکە یەك مانگ کارمان کرد لەو ماوەیەدا من هەستم کرد ئەو خاوەن کارە دەست بڕەو واپێدەچوو پارەنەدات بۆیە من چەند شتێکم دروست کرد و ووتم دەبێ بۆ چەند ڕۆژێك بگەڕێمەوە ئەسینا و پێویستم بەپارە هەیە و ئەوانیش یەکەم جار ڕازی نەدەبوو دەی ووت کارمان زۆرە بەلام من بڕیارم دابوو دەبێ بڕۆم هەرچۆن بوو پارەی ئەو چەند ڕۆژەی کەکارم کردبوو لێم وەرگرت و سەفەرم کردەوە بۆ ئەسینا

و چوومە لای ئەو ناسیاوەمان کە لەوێ بوو چەند ڕۆژێك مامەوە بەڵام بێ سوود بوو وەزعەکە لەوەدانەبوو بۆیە دووبارە گەڕامەوە لای برادەران بەڵام ئەم جارەیان لەڕێگای برادەرێکی ترمانەوە خاوەن ئیشێکی ترمان پەیداکرد هەرچەند ئەوانیش لەو قەرەجانەبوون چونکە زۆربەی ئەو خاوەن ئیشانە ئەمانەبوون لەلای ئەمان دوو هەفتە کارمان کرد و پارەیان نەدا و هەروا دەست بەتاڵ لەوکارەبووینەوە ، بەڵام بەبۆنەی ئەو کارەوە کابرایەکمان ناسی بوو ئەو یۆنانی بوو چوینەلای ئەو و زۆر بەخۆشحاڵیەوە وەری گرتین ئەم جارەیان شەش کەس بووین ماوەیەك کارمان لاکرد و زۆر کارەکەمانی بەدڵبوو و بەڕێکو پێکی پارەی دەداینێ و ئەو چەند هەفتەی لای ئەو بووین نەفەری ١٠٠ دۆلاری وەرگرت و لەلایەکی تر کۆمەڵێك برادەر کاریان دەکرد و هاتنە لامان و داوایان کرد بچینە لای ئەوان بۆ کارکردن و ئێمەش لەبەر ئەوەی زۆر بێتاقەت بووین و کۆمەڵەکەی ئەوانمان پێباش بوو بۆیە کارەکەمان گواستەوە لایان و خاوەن ئیشەکەش ئافرەتێکی یۆنانی بوو بەشێوەیەکی گشتی یۆنانیەکان ترسی ئەوەیان لەسەرنەبوو کە پارەبخۆن و بەڕێکو پێکی کارەکانمان دەکرد و شەوانە بەو هیلاکەتیە دەگەڕاینەوە ژوورەکەمان بەگۆرانی ووتن و پێکەنین و گاڵتەوە وەك هیچ نەبوویێت بەڵام کارەکەش زۆر قورس بوو بەتەواوەتی هیلاك دەبووین و وەستانی تێدانەبوو لەلایەکێش ناچاربووین ڕێگای دی نەبوو.

دوای ماوەیەك هەندێك ناخۆشی لەنێو ئەو برادەرانەیا دروست بوو کێشەکان بەرەو گەورەبوون دەچوون بۆیە ئێمە لە کارەکە کشایەنەوە و پارەی خۆمان وەرگرت و سیانمان گەڕاینەوە بۆ ئەسینا بەڵام ئەسینا بەرەوخراپی دەچوو کار دەست نەدەکەوت و کوردەکانیش هەندێکیان دەستیان کردبوو بەکاری خراپ تەنها بۆ پارە پەداکردن ئەویش بە ئیشی فڕین ناسرابوو لەگەڵ پیاوان دەچوو کاری سێکسیان لەگەڵ دەکردن تەنها بۆ وەرگرتنی بڕێك پارە چونکە یۆنانیەکان زۆر لەم

جۆرەکەسانەیان تێدابوون . ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە باروبۆخی قاچاغ چیەتی و ئیهانەکردنی ئەو خەلکەو سوکایەتی کردن بەناموسی خەڵك بەتایبەت ئەوانەی بێ کەس بوون و دەسەلاتیان نەبوو زۆر بەئاسانی دەبوونە نێچیری ئەو دڕندانە .

لەپارکی ئامۆنیا هەندێك لەفەی فەلافل و گۆشت و هەندێ بابەتی تریان دەفرۆشت هەندێکی تر ئیشی بۆنیان دەکرد ئەویش فرۆشتنی بوو لەوانەش هەبوون ڕۆژانی شەممە و چەند ڕۆژێکی دی هەبوو هەفتەبازاری تێدابوو لەوێ شتیان دەفرۆشت لەجل و بەرگ و کاسێت و بۆن و شتی دی . لەگەڵ ئەوەی ئەوانەشی کە کرێکاریان دەکرد ئەمەش تەنها بۆ ئەوەی ئەوەندەی لەو وولاتەدایت خۆت بژێنیت چونکە دەوڵەت هیچ هاوکاری نەدەکرد و تەنانەت جێگای حەوانەوە نەبوو دەبوو خۆت ئەوەشت دابین بکردایە دەوڵەت بەهیچ شێوەیەك دانی بەبوونی ئێمەدا نەدەنا کە بتوانین بەشێوەیەکی فەرمی لەو وولاتەدا بژین و من لەوێ چوومە بارەگای نەتەوەیەك گرتووەکان وهەرلەوێ بڕیاری قبوول نەبوویان دا و پاشان چوومە دایرەی پۆلیس کە خۆم تەسلیم کەم و داوای پەنابەری بکەم لەوێ پۆلیسەکە گاڵتەی لێدەهات کە ئەو داوایە دەکەن و پێی سەیربوو ، ئیستمارەکانی دامێ و لەگەڵ ئەوەش ووتی خۆت هیلاك ئەکەیت چونکە ئێمە قبوڵی وەرگرتن نادەین لەبەر ئەوە پێویست بەوەناکات خۆت و ئێمەش هیلاك بکەیت..بەم شێوەیە وەزعیەتی کورد ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خراپ دەبوو بەجۆرێك کە لەناوچەی ئامۆنیا پارکێك هەبوو بەتەواوی لای کوردەکانەوە بووە ئۆردوگایەکی پەنابەری بەلام بەکارتۆن و نایلۆن و دواتر پەرەی سەند و بوە بازاڕێك لەکەباب خانە و دەلاك خانە و چایخانە و دووکانی تری لێکرایەوە .

# پرۆژە و هەنگاوەکان بۆ کەمکردنەوەی کۆچ و ڕوونەکردنە پەنابەری

سەرەتا دەتوانین ئاماژە بەوەبدەین کاتێك کە لاو هیوای هەبوو بەوەی کە دەتوانێ خەونەکانی بەدیبێنێ و ئومێد و هیوای ئایندەی گەش و ڕوناك بێت کە بەشێوەیەکی گشتی لەبڕگەی خەونەکاندا باسی لێوەکراوە کە بۆخۆی بەشێکی گرنگ و هۆکارێکی کاریگەرە بۆ ڕاکردن و هەڵاتنی لاوان و دەربڕینی بێزاری لەژیان و گوزەرانی خۆیان.. گرنکە دەزگا پەیوەندی دارەکان کە لەڕێگایانەوە دەتوانرێ کەمێك کاریگەری سلبیەکان کەم بکرێنەوە بێ گومان ناتوانرێ بە شێوەیەکی بن بڕ ئەم دیاردەیە بەکۆتایی بهێنرێت چونکە لەهەموو سەردەم و زەمەنێکدا ئەم دیاردەیە هەبووە بەهەموو شێوەکانیەوە و دواتریش مرۆڤ ئازادە لەکوێ ژیان و گوزەرانی خۆی هەڵبژێرێت و لەچ شوێنێك بژیت..

گرفتەکانی لاوان و بەتایبەت ئەو خاڵانەی کە لەڕووی داراییەوە پەیوەندیان بە ژیانی لاوانەوە هەیە لەبەردەوامی کارو جێ گیربوونی بەو شێوە و سیستەمە نوێیەی کە لەدونیادا کاری لەسەر بەرقەراردەبێت... باس لەوە دەکرێت بۆ گەنجان ڕوو لەهەندەران دەکەن و لەوێ هەموو کارێك دەکەن و دەسەڵاتی ئیداری هەرێمیش لەدەرەوە کرێکار دێنێت بۆ کارکردن.. ئەمە یەکێکە لەو گرفتانەی کە لەڕووی ئابوریەوە کێشە بۆ لاوان و بۆ دەسەڵات و کۆمەڵگاش دروست دەکات.. ئەگەر نرخ و قورسای و پیرۆزی بۆ کار هەبوایە بێ گومان دەکرا ئەو گەنجەی کە لە هەندەران هەموو کارێك دەکات و لەووڵاتەکەی خۆی نایکات و پێ ی قایل نابێت.. لەم وولاتانەدا ئەوەی کاربکات ڕێزی لێدەگیرێت و لەدەزگاکاندا بەڕێزو ئیحترام و چاوێکی پڕلەڕێزەوە هەڵسوکەتی لەگەڵ دەکرێت و کارەکانی بۆڕادەپەڕێنرێت و

ئاسانكاری بۆ دەكرێت.. بەلام ئەوانەی بەپێچەوانەوە مامەڵەیان جیاوازە و ئەو گرنگی و رێزەیان نابێت لەگەڵ ئەوەشدا دەیان ژێنن و هەموو هاوكارێك دەكرێن و هەوڵی ئەوەش دەدرێت كە كاریان بۆ بدۆزرێتەوە لەرێگای دەزگا تایبەتیەكانەوە كە لەم رووەوە كاردەكەن و لێپرسینەوەو بەدواچوونیان هەیە و هەمیشە هەوڵدراوە بەپێی سیستەمێكی دارێژراو و لەسەرەتای دەست پێكردنی پەروەردەیی دا ئەم كارە دەست پێدەكات و كار دەكەنە یەكەم بەرنامەو یەكەم هیواو ئاوات بۆ ئەو گەنجە واتە ئەگەر دكتۆربیت یا كرێكار یا پارێزەر و بەرپرس هەموو پێكەوە خزمەتكارن و هەموویان موچەوەردەگرن و وەك یەك لەرووی تەندروستیەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەكرێت و لەتەمەنی دیاری كراودا خانەنشین دەبن و یاسا و مافەكانیان وەك یەكن و یاسایەك هەموو ئەو كارانەی بۆ رێكخستوون و پەیڕەووی دەكرێت و كەس بەسەرووی ئەو یاسایەوە نیە.. لەبەر ئەوە جیاوازی تەواو لەنێوان كار و یاساكانی كاركردن لە وولاتێكی وەك عێراق بەهەرێمی كوردستانیشەوە لەگەڵ ئەو وولاتە پێشكەوتووانەی دونیا . ئەمە لەرووی داهات و ئەو پارەی كە بەدەست دێت و پاشان بێ رێزی و بەسوك سەیركردنی ئەو كارمەندو كرێكارانە و ئەو جیاوازیەی نێوان ئەوان و چینەكانی تری ئەو كۆمەڵگایە.. ئەگەر كرێكارێك خاوەن ماڵ و سەیارەو داهاتێكی باش و لەگەڵ باری ئابوری ئەو وولاتەدا بگونجێت ئەوە بۆ بیر لەشوێنی تردەكاتەوە بۆ كاركردن..

چارەسەر كردنی گرفتەكانی خوێندكاری كورد لەپێداچوونەوە بەسیستەمی پەروەردەو فێركردن كە ئایندەیەك بەگەشی دوارۆژ ببەخشێت و دواتر ئەو سیستەمە تا ئاكامی ئەو خوێندكارانەی تێیدا لەبەرچاوبگیرێ واتە ئەو پەروەردەو خوێندنە بەشێوەیەك بێت كە ئاكام خوێندكار بتوانێ سودی لێ وەربگیرێت و كاری پێ بكات.. لەگەڵ بوونی هەلی كاركردن و دامەزراندن لە دەزگا حكومەیی و ئیداریەكان و لایەنی مەدەنی و پیشەسازی و كشتوكاڵی و خزمەتگوزاری و سەرجەم

لایەنەکانی تری ژیان.. بەشێوەیەك ئەو خوێندکارە دوای تەواوبوونی خوێندن و نەکەوێتە دونیایەکی نامۆو ڕووبەڕووبونەوەی سستی و لاوازی و بێ زاری..
باش کردنی داهات و گوزەرانی گەنج لەڕووی داهاتی سالآنەی کە بەشێوەیەك بێت بتوانێ لەڕێگایەوە خۆی و ئەوانەی دەوروبەری ئەگەر ئەو کەسە خاوەن خێزان بێت یا بەنیازبێت هاوسەرگیری بکات کە بتوانێ لەئاستیکی باش و گونجاودا بیان ژێنێ..
هەست کردن بەهێمنی و بوونی یاسا و بەرنامەی ئایندەی بۆ ژیان کە کەسایەتی ترسی لەئایندەی خۆی نەبێت و بەرچاوی ڕوون بێت. ئەوەش ئەرکی دەسەلآت و دەزگا بەرپرسەکانن بۆ بەرنامەڕێژی بۆ ڕێکخستنی ژیان و گوزەرانی هاوولآتیان وەك هەموو وولآتانی پێشکەوتووی دونیا.. کەواتە هەست کردن بەوەی کە دەسەلآت و یاسا خەم خۆری تاکە و لەخزمەت کۆمەلگادایە بۆ دابین کردنی ژیان گوزەرانێکی خۆش و کامەران ئەمەش بەهاوکاری و کارو ماندووبونی کەسایەتی لەو کۆمەلگایەدا کەواتە هەموو پێکەوە هۆکارێك بن بۆ بەڕێوەچوون و ڕێچکەگرتنی ئەو بەرنامە و پلانانەی کە گوزەرانمان بەرەو باش دەگۆڕن..
لایەنی ڕۆشنبیری و هونەری و ڕاگەیاندن کە کاریگەری خۆی لەم لایەنەوە بگێرێت بۆ دەستەبەرکردنی ئەو ژیانەی کە خەونی گەنجە و دەیەوێ بەوشێوەیە بژی..
ئەگەر دونیای هونەر و ڕۆشنبیریەت و زانستەکان لەبنەماوە کاریگەربن و لەمولکایەتی ئەو لایەن و کەسایەتی دەرچن و خۆیان بەشێوەیەکی ئازاد و سەبەرست کاربکەن و خزمەت بەکۆمەلگەن و هاوخەم و داکۆکی کەری داواو خواستەکانی گەنج بن و ڕێگا نیشان دەرین بن تا گەنجان بتوانن بڕیاری ڕاست و دروست بدەن و ژیان و گوزەرانی خۆیان بدۆزنەوە..
کردنەوەی دەرگای سەفەر و چونەدەرەوە بەشێوەیەك کە لاوان و کەسایەتی کورد بتوانێ بەئازادی و بەبێ بەربەست دونیا ببینێ ، کە هەمیشە ڕژێمەکانی ئەم ناوچانە هەولی ئەوەیان داوە بەم شێوازی داخستنە و ماوەنەدان بەدەرکەوتن و دونیا بینین

و کردنەوەی چاو کە تەنها مەبەست داپۆشین و هەڵتەماڵینی تاوان و گەندەڵی و بێ کارامەی و خۆش نەویستیان بەرامبەر بەووڵات و بەردەوامی لەدزین و بردنی سەروەت و سامان و کارنەکردن لە لەلایەنە خزمەتگوزاریەکان و جێ بەجێ نەکردنی پێداویستی و بەئەنجام نەگەیاندنی ئەرکە بنەڕەتیەکانی سەرشانی خۆیان ، کەواتە بەشێوەیەکی گشتی ترسی دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتی لەوەدایە کە بەم شێوەیە ئەگەر کەسایەتی بەرەو دەرەوە هەنگاوی ناو ئەو دونیایەی تری جیاواز لەدونیای خۆی چاوپێکەوت ئەوە ڕەنگە نەگەڕێتەوە.. ئەمەش ئەگەر بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و زانستیانە بیری لێبکرێتەوە و ئەو بنەماو هەنگاوە بنەڕەتیانەی بۆ داڕێژرێت ئەوە دەکرێ ئەو دەرگایە والابکرێت و ئەو ترسەش بوونی نەبێت.. چونکە ئەگەر کارەکان لەسەر ڕەوتی ئاسایی خۆیان هەنگاویان نا و کەسایەتی کورد لەژیانێکی باش و بێ گرفت و لەڕووی ئابوریەوە داهاتێکی وای بوو کە بتوانێت ژیانی خۆی بەبێ گرفت بەڕێوەبەرێت و خاوەن پاسپۆرت و بەبێ گرفت ئەوکاتانەی دەیەوێ بەسەردان و سەفەر بەرەو ووڵاتانی دی بڕوات و کەمێك لەڕووی دەروونیەوە هێوربێتەوە تابتوانێ بەفکرو بۆچون و هێزێکی ترەوە بەرەو کارەکەی بگەڕێتەوە و ئەو چەند مانگانەی داهاتوو کارەکانی بەو پەڕی تواناوە بەڕێوەبەرێت کە لەم ووڵاتانە و بەوشێوەیە بنەڕەتیەی کە بەیاسا داڕێژراوە و ئەوەی لەو ساڵەدا کاردەکات و بۆی هەیە لەچوار بۆ شەش هەفتە دەتوانێ مۆڵەت وەرگرێت و بەویستی خۆی سەفەربکات و لەزۆربەی دەزگاو کارگە گەورەکانیش پارەی ئەو سەفەرە سەرف دەکرێت بۆ ئەوکەسە.. ئەگەر لەڕێگای یاساوە و بەبەرنامەی داڕێژراو توانرا ژیان و گوزەرانی هاووڵاتی ڕێك بخرێت و کاری بۆبکرێت تا زیاتر بەرەو پێش چوون و باشتر بوونی ببرێت ئەوە گومان لەوەدانیە کەسایەتی کورد و گەنجی کورد بەهەمان هەڵوێستەوە هاوکاردەبێت و بەهێزو تواناوە کارەکانی دەکات و خزمەت بەووڵات و نیشتمانی دەکات و ئەوەش چەند ئەرکی گەنجانە

ئەوەندەش ئەرکی دەسەڵات و دەزگاکانی یاسا دانانە کە دەست پێش خەربن بۆ یاسا دانان لەهەموو قوشبنێکی ژیانی کەسایەتی کوردەوە تا هەموو پێکەوە کاربکەین..

پرۆژە گەشت و گوزاریەکان هەنگاوێکی گرنگە و پێویستە کاری بۆبکرێت و ئەگەر ئەمرۆ ئەو شێوە پرۆژانەبونیان هەبێت ئەوە بێگومان لەسەرەتادان و پێویستیان بەکارو بەرنامەی بەردەوام هەیە ، چونکە گەشت و گوزار یەکێکە لەو کارانەی کە سیمای ئەو شارو وولاتە لەخراپەوە بەرەو باش و گۆڕانکاریەکانی سودمەند دەبن چ لەڕووی دەرونی و پاشانیش لەڕووی ئابوری و داهاتەوە ئەمەش سەرەڕای کە کاریگەرە لە گۆڕانی فکرو بۆچون و کردنەوەی بیر لەچۆنیەتی ژیانی تازەگەری و خێرا ئاوێتەبوون لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی دونیادا و وەرگرتنیان بەخێرای.. لەگەڵ ئەوەشدا کەسایەتی کورد بەشێوەیەکی پێویستی بەوە هەیە لەو بوارەدا گۆڕانکاری ببینێت چونکە وولاتی ئێمە دەتوانرێ بکرێتە باشترین شوێن بۆ گەشت و گوزارو کاری باش و سەرکەوتووی تێدا ئەنجام بدرێت ، بەڵام گرفتەکان لەوەدایە کە سستی و لاوازی و داخراوەی بۆچون و تێڕوانینەکان وایان کردوە کە لەم بوارەدا هیچ پێشنەکەوین و ئەوەش کەباسی لێوە دەکرێت و شانازی پێوەدەکرێت کە کراوە دەتوانم بەهیچ ناوی ببەین لەگەڵ ئەو وەختە زۆرەی کە کورد خاوەن دەسەڵاتە.. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار یان ئەوەتا نەویستراوە ئەو کارەبکرێت ، کە بێگومان هەوڵیش هەیە بۆ سەرنەگرتنی ئەم شێوە هەنگاوانە یا ئەواتا بێ کارایی و نەشارەزای کەسایەتی کورد و بەرپرسان لەم بوارەدا هۆکارێکی ترە بۆ سەرنەکەوتن و بەئەنجام نەگەیاندنی ئەم شێوە پرۆژانە.. لە وولاتانی دونیا ئەوەی کەمێك بارودۆخی گونجاو بێت و لەهەندێ وولاتانی ئەورووپی ئەو شوێنەش گونجاو نیە بۆ ئەو پرۆژەیە بەڵام کارەکان سەردەخەن و ئەوەی دەیانەوێ دروستی دەکەن و

لەڕێگای گەشت و گوزارو و سەوزای و ڕازاندنەوەی شارەکان و ڕێگاو بانەکانیان و شوێنە گشتی و تایبەتیەکان بۆ گەشت و گوزار دەڕازێننەوە...

لایەنی ئاسایش و هێورکردنەوەی بارودۆخەکان کە کارە تیرۆریەکان و تەقاندنەوەو کوشتنی خەڵك و پەلاماردان و ترس و سڵەمینەوە لەهەموو شتێك ، لەگەڵ ئەوەی کە کوردستان تارادەیەك هێورە و لەگەڵ ئەوەشدا ناوە بەناوە کاری تیرۆری تێدا ڕوودەدات و لێشاوی هاتنی ئەو ڕێژە زۆرەی عەرەب بۆ کوردستان بەناوی نائارامی و خراپی باری گوزەران لەعێراق و گەڕان بەدوای کاردا و پاشان بەپاساوی زیادبوونی دەستی کار لە هەرێم هێندەی سودمەندی دەبێت ڕەنگە لایەنی ئاسایش و باری کۆمەڵایەتی و ئابوری هەرێم کاریگەری خراپی هەبێت و کار لەدەستی کرێکاری کوردی وەربگیرێتەوە و کرێکارەعەرەبەکان دەست بەسەر بازاری کوردستان دا بگرن و چەندین لایەنی تری سلبی لەم ڕووەوە.. ئەمەش هۆکارێکە بۆ زیاد بوونی بێکاری و بێ ئومێدی لە گەڕانەوەی پەنابەران و خراپ کردنی بازارەکان لەکوردستان..

گرفتی نیشتەجێ بوون یەکێکە لەو هۆکارەگرنگانەی کە دەبێتە کۆسپ لەبەردەم لاوی کورد بۆ بنیادنانی ژیان و گوزەرانی خۆی ئەوەی کە داهاتی گەنجێکە یا بەشێوەیەکی گشتی داهاتی کەسێك لەو وولاتە کە هیچ بەراوردێك لەنێوان داهاتوو باری گوزران و شێوەی بازارو گرانی دا بوونی نیە.. دوو گەنج یان کەسێك کە خاوەن ماڵ و منداڵە و داهاتێکی دیاری کراوی زۆرکەمی هەیە و دەبێ کرێ خانوو و ژیان و گوزەران بەڕێوە بەرێت و تەنها ئەوەی وەری دەگرێت بەشی کرێ ناکات دەبێ چۆن ئەو ژیانە بەسەر ببرێت و چۆن گرفتەکان چارەسەر بکرێن ئەمەش هۆیەکە بۆدروست بوونی دیاردەی گەندەڵی چونکە ئەوکەسە دەبێ بژی و بژێوی خۆی و ماڵ ومنداڵ پەیدابکات کە دەبینێ کەسانی تر بەسەر ئەوەوە لەو پەری خۆشی و باشی گوزەراندان و هەموو شتێك بۆیان دەستەبەرە . ئەمەو کەسایەتی

کورد لەهەندەران و بەتایبەت ئەوانەی کە بێ ڕێگاو شوێنن و خاوەن هیچ نین و تەنها خەمیان بۆ گەڕانەوە جێگای نیشتەجێ نەبوونە ، لەگەڵ نەبوونی کار چونکە کێشەی کار دۆزینەوەش یەکێك لەو گرفتانەی کە دیسان دیاردەی گەندەڵی دەستێکی باڵاو درێژی لەم مەسەلەیەدا هەیە و ئەوانەی کە بەخۆیان دەستی ماستاو ڕیایی کردن و نۆکەری بۆ لایەنەکان و لەنزیکەوە خزمەت بەو لایەنانەدەکەن و لەبەرپرس و کەسایەتی ناسراوەوە نزیکن ئەوە هەموو شتێکیان بۆدەکرێت و ئەوانەی کە نەناسراون و هیچ شتێکی دیارو بەرچاویان نیە کەس لێیان ناپرسێتەوە و کوردستان لێ دەکرێتە دۆزەخ و ئەگەر بشگەڕێنەوە ئەوە بۆ ماوەیەکی کورت و دواتر ناچاردەبن بگەڕێنەوە بۆ ژیانی پەنابەری و بۆ دووبارە بونەوەی غوربەت بەو شێوەی کە هەست دەکات ئەو غەریبیەی لە وڵاتی خۆی هەستی پێ دەکات و ئەو کۆسپانەی کە دێنە ڕێ لە وولاتانی غەریبیدا بوونیان نیە..

بۆیە گرنگە بەرنامەیەکی داڕێژراو بەردەوام و نەگۆڕ بەپێ بارو دۆخەکان و بەو شێوەی کە لەبەرژەوەندی هەموو لایەك دابێت و خزمەت بە وڵات بکات گرنگە سود لەتواناو لێهاتووی و بیرو بۆچوونی نوێ و تازەگەری ئەوانەی کە لەدەرەوەی وولاتەوە هەنگاو دەنێن بۆ ژیان لە وڵات بەڵام بەشێوەیەکی دادپەروەرانەو بەبێ جیاوازی لە نێوانیاندا ، ئەوەی تائەمڕۆ کراوە هیچ دادپەروەری تێدا نەبووە و زیاتر لایەن و لایەن کاری ڕۆڵی دیارو بەرچاوی لەو مەسەلەیەدا هەبووە..

بەرەو پێش چوونی باری پرۆژە خزمەتگوزاریەکان کە پێویستە جدی ترو گەرم تربوونیان تا هاووڵاتیان هەست بەوە بکەن ژیانیان بەرەو باش بوون دەچێ و کەسێك یان دام و دەزگایەك هەیە خەم بۆ کێشەکان دەخوات و بەدەم داواکاریەکانیانەوە دێت و سادەترین ماف و پێداویستیەکانیان دەستەبەربکرێن کە ژیانی ئاسای پێوە بەرێ دەچێت و ئەمەو تادەگاتە بەرزترین ئاستەکانی ژیان و

پێشکەوتن و شارستانیەت و گۆڕانکاریەکان لە ژیانی کۆمەڵگادا بەشێوەیەکی داڕێژراو بەپلان کە ئاینده و داهاتویەکی ڕوون و جوانی درێژخایەنی پێوە دیاربێت.. گێڕانەوەی متمانە بۆ هاوولاتیان و هێورکردنەوەی بارو دۆخە ئاڵۆسکاوە دەرونیەکان بڕوانەبوون و بەگرنگی وەرنەگرتنی بڕیارو ڕاسپاردەو بەڵێنەکانی دەسەڵات بەبڕواوە وەربگیرێن کە ئەم پەیوەندیە لەم ڕۆژەدا پچڕاوەو بوونی زۆر لاوازە و دوروپەرێزی بەدی دەکرێت و ئەو متمانەیەش گرنگە بگەرێتەوە دۆخی ئاسای خۆی کە هاوکارێك بێت بۆ بەڕێوە چوونی کارەکان و جێ دەست دیاربوون لەو شێوە هەنگاوانەدا کە دەبێ لەلایەن دەسەڵاتەوە هەنگاوی بۆ بنرێت.
بەهێزبوونی لایەنە سیاسی و لایەنە دەستوریەکان ئەمەش وەك پاڵ پشتێك بۆ کەسایەتی کورد کە بتوانێ لەوێوە ژیان و بەرنامەو ئایندەی خۆی و هەنگاوەکانی بنیادبنێ و کاریان بۆ بکات.. کەواتە لایەنە سیاسیەکان ڕێگایەکن بۆ گۆڕانکاریە پێویستەکان لە نێو کۆمەڵگادا کە ئەوان دەتوانن ژیان بەو شێوەیە لەسەر ڕێگای ئاسای خۆی داڕێژن وەك چۆن لەهەموو دونیای وولاتانی پێشکەوتودا لایەنە سیاسیەکان بۆ خۆشگوزەرانی و باش کردنی ژیانی کۆمەڵگا پێش برکێ دەکەن ئەمە لەو لایەنەوە بەڵام لەلایەکی ترەوە دەبێ لایەنەسیاسیەکان لەڕووی حزبی و بیری تەسکەوە خۆیان بەنێو ماڵی کەسایەتی کۆمەڵگا نەکەن و خۆیان لەهەموو کاروبارەکانی ژیان لە چوار چێوەی بارەگا حزبیەکانیانەوە نەدەن وەك چۆن لەو ساڵانەی ڕابردوودا دەکراو ئەوەی ئێستاش دەکرێ کاتێك حزب لەهەموو گەورەو بچوکێك دا دەستی وەردایەوە و خۆی کردە براگەورەو تەنانەت دەسەڵاتی لەحکومەت و دەزگا فەرمیەکانیش وەرگرتەوە و بەخۆی بڕیاردەربوو ئەوە شێوەی کاروبارەکان دەگۆڕدرێت و شەرعیەتی یاسا و کۆمەڵگا و دەسەڵاتی ئیداری و سیاسی دەشێوێنێت.. هەرچەندە تا ئەمڕۆ شێوازی پەیوەندیەکانی نێوان دەسەڵاتی سیاسی و ئیداری و یاسادانان و داد و دەسەڵاتی حزبی ئەو ڕێچکە

پێشکەوتووە نوێ خوازەی وەرنەگرتووە و بەهەمان شێوە کلاسیکیە بەردەوامەی کە ئەمڕۆ لە وولاتانی دواکەوتووی جیهانی سێهەم و ئەو وولاتە عەرەبی و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا باوە کاری لەسەر دەکرێت ، کە ئەمە پێویستی بەوەهەیە کورد دەست پێشکەری بکات و بیسەلمێنی کە دیموکرات خوازەو دەتوانێ بەو شێوازە پێشکەوتووەی وولاتانی پێشکەوتوو کاربکات و مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵگاو یاسا و بەڕێوەبردنی وولاتەوە بکات.. ئەمەش وەك بەرنەمایەکی سەرەکی بۆ هەنگاونان پێویستە حزبەکوردیەکان خۆیان تازەبکەنەوە و بیرو بۆچوون و تێڕوانینەکانیان بگۆڕن و ئەو پەیوەندیە توندو تۆڵەی کەباسمان کرد لەگەڵ جەماوەردا دروستی بکەنەوە تا ترسی ئەوەیان نەبێت دەسەلات ترسی دەکەوێتە سەر..

پرۆژەکان و مامەڵەکردن لەگەڵ بن برکردنی دیاردەی کۆچ و ڕووکردنە هەندەران پێویستی بە پلان و بەرنامەی درێژخایەن و دووربین هەیە و لەهەموو ووردەکاریەکانەوە دەبێ سەرچاوەبگرێت و کاری جدی و بەردەوامی پێویستە و سەرجەم لایەنەکانی لێك بدرێنەوە و بەشێوەیەکی هەمەلایەنانە بیری لێ بکرێتەوەو کەسانی شارەزاو پسپۆڕو بەتوانا لەهەموو بوارەکاندا کاری تێدابکەن..چونکە دروست کردنی سیستەم بۆ ژیان و پەیداکردنی هیواو خواست و کارکردن و ئومێد و ئاییندە بینین و بەئەنجام گەیشتنی هەوڵەکان لە خۆشکردن و بەرەوپێشەوە بردنی ژیان و دروست کردنی گۆڕانکاری لەژیاندا ئەو هیوایە دەبەخشێت کە مرۆڤ بەردەوام بێت و بیر لە هەندەران و ژیانی ئاوارەی نەکاتەوە ئەمەش چەندە ئەرکی کەسایەتیە کە هەوڵ بدات و خۆی ماندوبکات ئەوەندەش پێویستە لەسەر دەسەلات و حکومەت کە ئەرکەکانی خۆی بەجێ بگەیەنێ و پێداویستی و ئاسان کاری و خزمەتگوزاری و هاوکاری هاوولاتیان بێت لەدەستەبەرکردن و ئاسان کاری کارەکانیان... بەهەمان شێوە ڕێکخراو لایەنە سیاسی و پیشەی کۆمەڵە مەدەنیەکان پێویستە بەشێکی گرنگ بن لەو بەرنامەو پلانە.. بەلام ئەوەی تا ئێستا لە وولاتی ئێمەدا بەپێچەوانەیە

و تا ئەمڕۆ ئاوارەبوون و ڕووکردنە هەندەران لە گرفت و کێشە کۆمەڵ بووەکانی لایەنی سیاسی و کێشە ناخۆیەکان و نەبوونی خزمەتگوزاری و کێشەی ئیداری و گەندەڵی و دەیان و دەیان گرفتی دی کەوای کردووە کەسایەتی کورد بێزاربێت و گەنجەکان لەوپەڕی نائومێدی و بێ بڕوایدا سەری خۆیان هەڵگرن و ڕوو لەدونیایەکی نادیارو نامۆ بنێن کە دەرەنجام و ئاکامەکانی هەرچی بن لەو ژیانەی ئەوێیان پێ چاك ترە ئەگەر ئەو بۆچونەش بەلای زۆرکەسەوە هەڵەیە ، بەڵام ئەوە بڕوای تاکە و دەبێ ڕێزی لێ بگیرێ و لەدونیای ئەمڕۆشداو لەهەموو وڵاتاندا ئازادی ژیان و لەکوێ گوزەران و نیشتەجێ بوون بوونی هەیە و بەپێ یاسا و لەچوار چێوەیەکی ڕێکو پێکدا کاری پێ دەکرێت..

هەموو کەسێك چەند دڵشکاوی و نیگەرانی هەبێت و چەندە برینەکانی قوڵ بن کە بوبێتنە هۆیەك بۆ ئاوارەبوون و ڕووکردنە هەندەران و بەهۆیانەوە وڵاتی بەجێ هێشتبێ.. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو وڵاتە نیشتمان و خۆشەویست و دڵ لەلابوونی بێ پچڕان دەبێ و یادگاری و ساتە خۆش و ناخۆشەکان و بیرەوەری و ژیانی تەمەنێك و کەس و کارو ئەو ساتە وەختانەی نێو کۆڵان و هاوڕێیان و قوتابخانەکان و گوزەری کارکردن هەموو کات ئەو بیرو بۆچونانە بەزیندوویی دەهێڵنەوە و مرۆڤ بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن هەمیشە دڵت لەوێدەبێ و بیر لەوەدەکەیتەوە ڕۆژگارێك بتوانی بگەڕێیتەوە و ئەو دوو دڵی و دڵەڕاوکێ و ژیانی دوولایەنەی کە ئەمڕۆ کەسایەتی کورد تێیدا دژی بەگیان و جەستە لەهەندەران و بەبیرو بۆچوون و ڕوانین لەئاییندە لەوێ ئەمەش بۆ یەکگرتنەوەی ئەم دوو لایەنە جیاوازە پێویستە پرۆژەکان و بیرکردنەوە لەو کارانەی کە دەبنە هۆیەك بۆ ئامادەکاری و زەمینە خۆش کردن لەگەڕانەوەی پەنابەران بۆ وڵات و کەم کردنەوەی ڕوو لەهەندەران کردن و ڕاکردنی گەنجان.. ڕاکردن لەو بارو دۆخە ناهەموارە و لەو ژیانە پڕلە کەم و کوڕیەی کە خواستی لاوەکان پشت گوێ دەخرێت و کەس خەم خۆریان نیە و ئەوەی بەناوی

ئەوانیشەوە دەکرێت تەنها بۆ بەرژەوەندی چەند کەسێکە کە بەخۆیان سوودی لێوەردەگرن.. ئەمەو ڕێکخراوە پیشەی و جەماوەریەکان کە وەك وابەستەیەك و بەشێك لەو حزبانە کارەکانی خۆیان لەژێر پەردەی جەماوەری و پیشەیدا ئەنجام دەدەن و ئەوەی خزمەت و کاری ئایندەی بۆ لاوان و گەنجان بێت ئەنجام نادرێت و پرۆژەو پلانی ئایندەی لای ئەوانە دەست ناکەوێت و زۆر دوور لە کارو ئەرکەکانی خۆیانەوە کاردەکەن و خەڵك/لەدەوری خۆیان کۆدەکەنەوە..

لێرەدا بەپێویستی دەزانم کە سەرکردایەتی و دەسەڵات و لایەن و ڕێکخراوە پیشەیی و جەماوەری ومەدەنی لەڕێگای دەزگاو پرۆژەی تایبەتەوە کار بۆ ئەم مەسەلەیە بکەن و ئەوەی دەکرێ ئەگەر بۆ ئەمڕۆش نەبێت بەڵام بۆ ئایندە و لە چەند ساڵێکی داهاتوودا کاریگەری هەبێت...

# سوپاس نامە

زۆر سوپاسی ئەم بەڕێزانە دەکەم کە هاوکاریان کردم و لەو چەند ساڵانەدا بەزانیاری تایبەت بەکتێبەکە هاوکاریان کردووم کە هەمیشە جێگای ڕێزوو سوپاسن ، پێم خۆشە لێرەشدا ناویان تۆماربکەم وەك پاداشتێك بۆ ماندوبوون و بەدەنگەوەهاتنم ، لەگەڵ هیوای سەرکەوتن و بەختەوەریان .

- بەڕێز جوتیار بامەڕنی
- بەڕێز ساسان دەروێش
- بەڕێز حەمە عەلی تۆفیق
- بەڕێز مەریوان علی تۆفیق
- بەڕێز شێخ مەلیك حەسەن
- بەڕێز شەماڵ شێخ فاتح نەقشبەندی



وێنەی (١) لەکاتی تەسلیم بوونم



وێنەی (٢) لەکاتی چاوەڕوانی

